# ڕاڤەی قورئانی پیرۆز

پێشەوای حافز عیمادولدین ئەبولفیدا
ئیسماعیلی کوڕی کەسیری دیمەشقی

## تفسير القرآن العظيم

الإمام الحافظ إسماعيل بن كثير الدمشقي

N
نۆبیلیس

# ڕاڤەی قورئانی پیرۆز

## (تفسير القرآن العظيم)

نوسینی

پێشەوای حافز عیمادولدین ئیسماعیل کوڕی کەسیر

بەشی شەشەم

خانەی نۆبیلیس

ناوی ئینسکلۆپیدیا: ڕاڤەی قورئانی پیرۆز
بەرگی: شەشەم
نووسینی: پێشەوای حافز عیمادولدین ئیسماعیل کوڕی کەسیر
وەرگێڕانی: (النساء) حەمەمین ئەحمەد بەرزنجی
هەڵەچنینی: هاوڕێ کەمال
قەبارەی پەرتوك: ١٧ ـ ٢٤
ژمارەی لاپەڕەکانی: ٢٨٨
ژمارەی لاپەڕەکانی ئینسکلۆپیدیا: ٦٤٨٠
جێگای بڵاوکردنەوە: بەیروت
خانەی بڵاوکردن و دابەشکردن: خانەی نۆبیلیس
فاکس: ٩٦١ (١) ٥٨٣٤٧٥
تەلەفۆن: ٩٦١ (١) ٥٨١١٢١ ـ ٩٦١ (٣) ٥٨١١٢١
٩٦٤٧٥٠٧٢٨٧٥٠٠
ئیمێڵ: info@nobilis-int.com
چاپی یەکەم: ٢٠١٢
EAN 9786144031308
ISBN 978-614-403-130-8

## بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان

## تەواوکەری سورەتی (النساء)

﴿يُرِيدُ اللَّهُ لِيُبَيِّنَ لَكُمْ وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ وَيَتُوبَ
عَلَيْكُمْ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿٢٦﴾ وَاللَّهُ يُرِيدُ أَن يَتُوبَ عَلَيْكُمْ وَيُرِيدُ
الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الشَّهَوَاتِ أَن تَمِيلُوا مَيْلًا عَظِيمًا ﴿٢٧﴾ يُرِيدُ اللَّهُ أَن
يُخَفِّفَ عَنكُمْ وَخُلِقَ الْإِنسَانُ ضَعِيفًا ﴿٢٨﴾﴾

واتە: خوای گەورە دەیەوێت ڕێتان بۆ ڕوون بکاتەوە و لە ڕێ و شوێنی پێشینانیش شارەزاتان پەشیمانی و لێ قەبوڵ بکات. خودا زانای لەکارزانە، خودا دەیەوێ تۆبەتان قبوڵ کا، ئەوانەش وا نەکەونە شوێن هەوا و هەوەس دەیانەوێ ـ بە تەواوی ـ ئێوە لە ڕێگە لا بدەن. خوا دەیەوێت ئەرکتان لەسەر سوك بکات و مرۆڤیش بەبێ هێزو پێزی دروست بووە.

خوای گەورە هەواڵی داوە کە ئەی باوەڕداران ئەیەوێ بۆتان ڕوون بکاتەوە کە چیتان بۆ حەڵاڵ کراوە و چیتان لەسەر حەرام کراوە وەك لەم سورەتەدا و لە سورەتەکانی تردا باس کراوە.

﴿وَيَهْدِيَكُمْ سُنَنَ الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ واتە: ڕێگا چاکەکانیان و شوێنکەوتنی ئەو شەریعەتانەیان کە خوا خۆشی دەون و پێیان ڕازیە ئێوە ڕێنمایی بکات بۆیان.

﴿وَيَتُوبَ عَلَيْكُمْ﴾ واتە: لە تاوانەکانتان و خواردنی حەرامەکان ببورێ ﴿وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ﴾ خوا زانا و دانایە بە شەرعەکەی و قەدەرەکەی و کردەوەکانی و قسەکانی.

﴿وَيُرِيدُ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلشَّهَوَٰتِ أَن تَمِيلُواْ مَيۡلًا عَظِيمًا﴾ واتە: ئەیەوێ شوێن شەیتانەکان لە جولەکە و گاور و زیناکاران، وە لابدەن لە هەق و بچن بە لای شتی پوچەڵەوە بەزۆری ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُخَفِّفَ عَنكُمۡ﴾ بەڵام خودا دەیەوێ شەریعەتەکان و فەرمانەکانی و قەدەغەکراوەکانی سوك بکات لەسەرتان، لەبەر ئەوە مارەکردنی کەنیزەکی بە مەرج ڕەوا کردووە بۆتان وەك موجاهید و جگە لەویش دەڵێن .﴿وَخُلِقَ ٱلۡإِنسَٰنُ ضَعِيفًا﴾ لەبەر لاوازی مرۆڤ لە دەروونیدا و لاوازی عەزم و هیمەتی ئەو سوك کردنەی بۆ گونجاوە.

موسا (سڵاوی خوای لێ بێت) ئەوی شەوڕەوی کاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) گەڕایەوە لە (سدرة المنتهى) پێی وت: خوا چی لەسەر فەرز کردن؟ وتی: فەرمانی پێدام لە شەو و ڕۆژێکدا پەنجا نوێژ بکەین، ئەویش پێی وت: بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت داوای کەم کردنەوەی لێ بکە، چونکە نەتەوەکەی تۆ توانایان نییە بەسەر ئەوەدا، من خەڵکم تاقیکردەوە پێش تۆ لەسەر شتێك لەوەی تۆ کەمتربوو، نەیانتوانی، وە نەتەوەکەی تۆ گوێ و چاو و دڵیان زۆر لەوان لاوازترە، ئەویش گەڕایەوە، خوا بۆی کرد بە دە نوێژ لە شەو ڕۆژێکدا، پاشان گەڕایەوە بۆ لای موسا، ئەویش بەردەوام ئەیناردەوە هەتا پێنج نوێژ مایەوە (الحديث).

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا ﴿٢٩﴾ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ عُدۡوَٰنٗا وَظُلۡمٗا فَسَوۡفَ نُصۡلِيهِ نَارٗاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿٣٠﴾ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ وَنُدۡخِلۡكُم مُّدۡخَلٗا كَرِيمٗا ﴿٣١﴾﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان ماڵ و دارایی یەکتری لە خوت و خۆڕایی مەخۆن، مەگەر بە سەودا و مامەڵە و بە ڕازی بوون لەناو خۆتان، کە ئەوسا پێتان ڕەوایە بە هەق نەبێ نابێ یەکتریش بکوژن، خودا دەربارەی هەمووتان دلۆڤانە، هەر کەسێکیش لە ناهەق و هەر بە نیازی دەستدرێژی ئەم

جۆرە کارانە بکا گرفتاری ئاگری دەکەین، ئەم کارە لە لایەن خودا زۆر ئاسانە. ئەگەر ئێوە ئەو تاوانە زەلامانەی پێمان ڕاگەیاندن بە قەدر و عیزەت.

خوای گەورە قەدەغەی کردووە لە بەندە باوەڕدارەکانی ماڵی یەکتری بخۆن بەناهەق. واتە بە جۆرەها کاسبی ناشەرعی وەك جۆرەکانی سوود و (الربا)، قومار، وە ئەو فێڵ و تەڵەکانەی وەك ئەوانەن ئەگەر دەرکەوت لە زۆر حوکمە شەرعییەکاندا ئەوانەی خوا دەزانێ کە بکەرانی ئەیانەوێ فێڵ و تەڵەکە بکەن لە سوود خواردندا. هەتا ئیبنو جەریر وتوویەتی: عەکریمە و ئیبنو عەباس دەربارەی پیاوێك کە کراسێك لە پیاوێك دەکڕێت دەڵێت: ئەگەر پێی ڕازیبوون دەیبەم ئەگینا دەیهێنمەوە و درهەمێکیش لەگەڵدا دەگێڕمەوە ئا ئەوەیە کە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ﴾ بەناهەق ماڵی یەکتری مەخۆن.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: عەلقەمە لە عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: ئەم ئایەتە کاری پێدەکرێت و نەسڕراوەتەوە وە ناسڕرێتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە: کاتێ خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ﴾، موسڵمانەکان وتیان: خوا لێی قەدەغە کردین ماڵی یەکتر نەخۆین بە ناهەق. خواردەمەنیش چاکترین ماڵ و سامانی ئێمەیە ڕەوانییە کەس لە ماڵی کەس نان بخوات. چۆن ئەبێ بۆ خەڵك؟ خوای گەورە دوای ئەوە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ﴾ [النور: ٦١]، قەتادەش هەر ئەوەی وتووە.

﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾ (تجارە) بە مەرفوعی و مەنصوبی خوێندراوەتەوە، ئەوەش هەڵاوێرد کردنێکی پچڕاوە وەك ئەوەی دەڵێت: هۆی حەرام بەکار مەهێنن بۆ بەدەستهێنانی سامان و ماڵ. بەڵام ئاڵوگۆڕی شەرع کە بە ڕازیبوونی فرۆشیار و کڕیار بێت بیکەن، وە بیکەن بەهۆی بەدەستهێنانی ماڵ و سامان وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقْتُلُواْ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ﴾ [الأنعام: ١٥١]، هەروەها وەك لە

فەرمایشی: ﴿لَا يَذُوقُونَ فِيهَا ٱلْمَوْتَ إِلَّا ٱلْمَوْتَةَ ٱلْأُولَىٰ﴾ [الدخان: ٥٦]. لەم ئایەتەوە شافیعی بەڵگەی ئەوەی هێناوەتەوە کە فرۆشتن دروست نییە بە قسە نەبێ، چونکە بەڵگەیە لەسەر ڕازیبوون بە پێچەوانەی وەرگرتنەوە کە نابێتە هۆی ڕازیبوون.

مالیك و ئەبو حەنیفە و ئەحمەد پێچەوانەی ئەوەن، ڕایان وایە وەك چۆن قسە بەڵگەیە لەسەر ڕازی بوون بەو شێوەیەش کردەوەکان لە هەندێ شوێندا بەڵگەی بڕاوەیە، لەبەر ئەوە فرۆشتن بە کردەوە بەراست دادەنێن.

وە موجاهید وتوویەتی: ﴿إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٍ مِّنكُمْ﴾ فرۆشتن بێت یان بەخشین بەیەکتر.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: مەیمونی کوڕی میهران ئەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "البيع عن تراض والخيار بعد الصفقة ولا يحل لمسلم أن يغش مسلما" (هذا حديث مرسل) واتە: فرۆشتن بەپێی ڕازیبوونە، ئارەزوویش دوای گرێبەستەکەیە، ڕەوا نییە بۆ موسڵمان ناپاکی بکات بەرامبەر بە موسڵمان.

وە لە تەواوەتی ڕازیبوونە چەسپاندنی هەڵبژاردنی ناو کۆڕەکە وەك لە هەردوو سازەواردا هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "البيعان بالخيار مالم يتفرقا" فرۆشیار و کڕیار ئارەزووی خۆیانە هەتا لە یەك جیانەبووینەوە. ئەحمەد و شافیعی و هاوەڵەکانیان و جەماوەری پێشینان و پاشینان بەپێی ئەوە کاریان کردووە، لەوانە مەشروعی هەڵبژاردن بە مەرجی سێ ڕۆژ دوای پەیمانەکە بەپێی حاڵی فرۆشراوەکە کە دەرکەوێ ئەگەر بۆ ماوەی ساڵێك بووە لە گونداو لەو شێوەیە وەك بەناوبانگەوە لە مالیکەوە (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) وە فرۆشتنی کردەوەییان بەراستگێڕاوە بە ڕەهایی ئەوەش بۆچوونی شافیعییە وە هەیە لێیان وتوویەتی: دروستە فرۆشتنی کردەوەیی لە شتە بێ نرخەکاندا ئەوانەی خەڵك بە فرۆشتنیان دادەنێن ئەوەش هەڵبژاردەی کۆمەڵێك لە هاوەڵانە وەك ڕێك کەوتوون لەسەری.

وە فەرمایشی: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ﴾ خۆتان مەکوژن بە کردنی ئەوانەی

خوا حەرامی کردوون وە سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی وە خواردنی ماڵی یەکتر لە نێوان خۆتاندا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمًا﴾ خوا بەبەزەییە لەوانەدا فەرمانتان پێ دەکا و لەوانەدا کە لێتان قەدەغە دەکات.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عەمری کوڕی عاصەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتووە وتوویەتی: ساڵی (ذات السلاسل) کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ناردمی شەوێکی زۆر ساردبوو تووشی لەش گرانی بووم ترسام ئەگەر خۆم بشۆم بمرم، تەیەموم کرد، پاشان نوێژی بەیانیم بۆ کردن ئەڵێ: کاتێ هاتینەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەم بۆ باس کرد، فەرمووی: بە لەشی پیسەوە نوێژت بۆ هاوەڵەکانت کردووە؟ وتم: ئەی نێردراوی خوا لە شەوێکی زۆر ساردا تووشی لەش گرانی بووم ترسام ئەگەر خۆم بشۆم بمرم ئەو ئایەتەم بیرکەوتەوە کە خوا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمًا﴾ ئیتر تەیەموم کرد و نوێژەکەم کرد، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێکەنی و هیچی نەوت .

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من قتل نفسه بحديدةٍ فحديدته في يَدِهِ، يَجَأ بها بَطنه يوم القيامة في نار جَهَنَمَ خالدا مخلدا فيها أبدا، ومن قتل نفسه بسم، فسمه في يده، يتحساه في نار جهنم خالدا مخلدا فيها أبدا، ومن تردى من جبل فقتل نفسه، فهو مترد في نار جهنم خالدا مخلدا فيها أبدا". (وهذا الحديث ثابت في الصحيحين)، واتە: هەر کەس بە بڕەرێك خۆی بکوژێ لە ڕۆژی دواییدا ئەو بڕەرە دەگرێ بە دەستییەوە بۆ هەتا هەتایە ئەیکات بە ورگیا، وە هەر کەس لە بەرزاییەکەوە خۆی بەربداتەوە خۆی بکوژێ لە ڕۆژی دواییدا بەردەوام لەناو ئاگری دۆزەخدا خۆی بەردەداتەوە هەتا هەتایە وە هەر کەس خۆی زەهر خوارد بکات زەهرەکە بەدەستییەوە دەبێ، ڕۆژی قیامەت هەر زەهرەکە دەخوات هەتا هەتایە.

لە سابیتی کوڕی زەحاکەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من قتل نفسه بشي و عذب به يوم القيامة"، واتە: هەر کەس بە هەرچی خۆی بکوژێ ڕۆژی قیامەت بەوە سزا دەدرێ.

وە لە هەردوو سازەواردا هاتووە لە جوندبی کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلییەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "كان رجل ممن كان قبلكم وكان به جرح، فأخذ سكينا نَحَر بهَا يَده، فما رقأ الدمُ حتى ماتَ، قال الله عز وجل: عبدى بادرنِي بِنَفسه، حرمت عليه الجنة". واتە: پیاوێك لە نەتەوەکانی پێش ئێوە بریندار دەبێ ئەویش چەقۆیەك هەڵدەگرێ دەستی خۆی پێ بریندار دەکات خوێنەکەی ناگیرسێتەوە هەتا دەمرێ، خوای بەرزی شکۆمەند دەفەرمووێ: بەندەکەم دەستپێشخەری کردووە بەسەر مندا بەهەشتی لێ حەرام دەکەم.

لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ عُدْوَانًا وَظُلْمًا﴾ هەر کەس ئەوەی کرد کە خوا قەدەغەی کردووە بە ستەم و دەسدرێژی کە بزانێ حەرامیشە و چاوی نەترسێ و بیکات ﴿فَسَوْفَ نُصْلِيهِ نَارًا﴾ دەیخەینە دۆزەخەوە ئەوە هەڕەشەیەکی توند و تەکیدە با هەر خاوەن ئاوەز هەیە خۆی لێ دووربخاتەوە.

﴿إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾ ئەگەر خۆتان لە تاوانە گەورەکان دوورخستنەوە ئەوانەی لێمان قەدەغە کردوون لەتاوانە بچوکەکانتان ئەبورین و ئەتانخەینەوە بەهەشتەوە لەبەر ئەوە دەفەرموێت: ﴿وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا﴾ فەرموودە ڕەوان ئەبو بەکری بەزار وتوویەتی: موئەمەلی کوڕی هیشام لە ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمەوە لە خالیدی کوڕی ئەیوبەوە لە موعاویەی کوڕی قوڕەوە لە ئەنەسەوە بۆمان دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەوەی لە پەروەردگاری بەرزی شکۆمەندمانەوە پێمانگەیشتووە ئەوەیە خوا لە تاوانە بچووکەکانمان دەبورێ ئەگەر خۆمان دوورخستەوە لە تاوانە گەورەکان، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِن تَجْتَنِبُوا كَبَائِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّئَاتِكُمْ﴾.

چەند فەرموودەیەك دەربارەی ئەم ئایەتە پیرۆزە هاتووە بەپێی توانا هەندێکی باس دەکەین.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە سەلمانی فارسییەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی وتم: "أتدرى ما يوم الجمعة؟ قلت: هو اليوم الذى جمع الله فيه أباكم. قال: لكن أدْرِى ما يوم الجمعَةِ، لا يتطهر

الرجل فيحسن طهوره، ثم يأتي الجمعة فينصِت حتى يقضي الإمام صلاته، إلا كان كفارة له ما بينه وبين الجمعة المقبلة، ما اجتنبت المقتلة"، (رَوَاه البخاري من وجه آخر عن سلمان نحوه).

واته: ئەزانی ڕۆژی هەینی چییە؟ وتم: ئەو ڕۆژەیە خوا باوکتانی تێدا دروست کردووە، فەرمووی: بەڵام من ئەزانم ڕۆژی هەینی ئەو ڕۆژەیە کە ئەگەر پیاو بە چاکی دەست نوێژ بگرێ تێیدا و پاشان بچێت بۆ نوێژی هەینی هیچ قسە نەکات هەتا ئیمام لە نوێژ دەبێتە کەفارەتی تاوانەکان نێوان ئەو هەینی هەینییەو هەینی داهاتوو ئەگەر دەرکەوتبێتەوە لە تاوانە بکوژەکان.

ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر وتوویەتی: کە ئەبو هورەیرە و ئەبو سەعید ئەیان وت: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) ڕۆژێك وتاری بۆ ئەدایـن ئەیفەرموو: "والذی نَفسی بِيَدِهِ ـ ثلاث مرات ـ ثم أَكَبَّ، فأكب كل رجل منا يبكي، لا ندري على ماذا حلف عليه ثم رفع رأسه وفي وجهه البشر فكان أحب إلينا من حُمْر النَّعَم، فقال ﷺ ما من عَبْد يُصَلي الصلَواتِ الخمس، ويصوم رمضانَ، ويُخرِج الزكاة، ويَجْتنبُ الكبائر السَّبعَ، إلا فُتِحت له أبوابُ الجَنَّةِ، ثم قيل له: ادخل بسَلام".

واتە: سێ جار فەرمووی: بەوەی گیانی منی بەدەستە، پاشان سەری دانەواند ئێمەش سەرمان دانەواند و گریایین بێ ئەوەی بزانین سوێند لەسەرچی خوارد، پاشان سەری بەرزکردەوە روخساری ئەگەشایەوە ئێمە ئەوەمان وشتری سوور لا خۆشتربوو، ئینجا فەرمووی: هەر بەندەیەك پێنج فەرزە نوێژەکانی بکات و ڕۆژووی ڕەمەزان بگرێ و زەکاتی ماڵەکەی دەربکات و دوورکەوێتەوە لە حەوت تاوانە گەورەکە دەرگای بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە، پاشان پێی دەوترێ: بە سەلامەتی بچۆرە ژوورەوە.

## "ڕاڤەکردنی ئەو حەوت تاوانە گەورەیە"

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: ئەبو هورەیرە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "الكبائر سَبْعٌ، أولها الإشراكُ بالله، ثم قَتْل النَّفْس بغير حقها، وأكْل الربَا، وأكْلُ مال اليتيمِ إلى أن يكبر، والفِرَار من

الزَّحْفِ، ورَميُ المحصنات، والانقلاب إلى الأعراب بَعْد الهِجْرَةِ"

واتە: تاوانە گەورەکان حەوتن: یەکەمیان هاوبەشدانان بۆ خوا، پاشان کوشتنی کەسێك بەناهەق، خواردنی سوود (الربا) وە خواردنی ماڵی هەتیو هەتا گەورە دەبێ و هەڵاتن لە کاتی جەنگ و تاوانی فاحیشەکردن دانە پاڵ داوێن پاکەکان و چوونەوە بۆ ناو عەرەبە دەشتەکییەکان دوای کۆچ کردنیان.

هەروەها لە عومەیری کوڕی قەتادەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە حەجی ماڵئاوایی دا فەرمووی: "ألا إن أوليا و الله المُصَلون من يُقِيم الصلواتِ الخمسَ التي كُتبت عليه، ويَصومُ رمضان ويَحتسبُ صومَهُ، يرى أنه عليه حق، ويُعطى زكاةَ ماله يَحْتسِبها، ويجتنب الكبائر التي نهى الله عنها".

واتە: بەڕاستی دۆستانی خوا نوێژخوێنەکانن ئەوانەی پێنج فەرزە ئەو نوێژانە دەکەن کە خوا نووسیویەتی لەسەریان و مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو دەبن و گرتنەکە بە هەق دەزانن و زەکاتی ماڵی دەردەکات لەبەر خوا و بە تەمای پاداشتەکەیەتی و خۆی دوور دەخاتەوە لەو تاوانانەی گەورەن و خوا نەهی لێ کردوون. پاشان پیاوێك لێی پرسی وتی: ئەی نێردراوی خوا تاوانە گەورەکان کامانەن؟ فەرمووی: نۆن، هاوبەش بۆ خوا دانان و کوشتنی کەسێك بەناهەق و هەڵاتن لە ڕۆژی جەنگدا و خواردنی ماڵی هەتیو و تاوانی زینا دانەپاڵ ئافرەتێکی داوێن پاك و خراپ بوون لەگەڵ دایك و باوکی موسڵمانداو بەزاندنی سنوورەکانی ماڵی خوا کە ڕوانگەتانە بە مردوویی و زیندوویی. پاشان فەرمووی: هەر کەس مرد و ئەو تاوانە گەورانەی نەکرد بێ و نوێژ بکات و زەکات بدات لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) دەبێت لە خانوویەکدا کە دەرگاکانی لە تەختەی زێڕە. (حاکم وتوویەتی پیاوەکانی هەموو کار بە قسەکانیان دەکرێ لە هەردوو سازەوارەدا جگە لە عەبدول حەمیدی کوڕی سینان ئەویش حیجازییە بەو حەدیسە نەبێت نا ناسرێ).

فەرموودەیەکی تر دەربارەی واتاکەی پێشوو. ئیبنو مەردویە وتوویەتی: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چووە سەر

دوانگە و فەرمووی: "لا اقسم، لا اقسم"، سوێند ئەخۆم، سوێند ئەخۆم، پاشان هاتە خوارەوە فەرمووی: "أبْشِرُوا، أبْشِرُوا، من صَلَّى الصلوات الخمس، واجْتَنَبَ الكبائر السَّبعَ، نُودِيَ من أبواب الجنة: ادخُل". واتە: مژدەبێ لێیان، هەر کەس پێنج فەرزە نوێژەکانی کرد و دوورکەوتەوە لە حەوت تاوانە گەورەکە لە دەرگاکانی بەهەشتەوە بانگ دەکرێ وەرە ژوورەوە.

فەرموودەیەکی دیکە دەربارەی ئەوە، ئەبو جەعفەری کوڕی جەریر وتوویەتی: طهیسلەمی کوڕی میاس وتوویەتی: تاوانێکم کرد ڕام وانەبوو لە تاوانە گەورەکان بێت، گەیشتم بە ئیبنو عومەر پێم وت: من تووشی تاوانێك بووم ڕام وانییە لە تاوانە گەورەکان بێت، وتی: چییە؟ وتم: ئەوە و ئەوەیە، وتی: لە تاوانە گەورەکان نییە، وتم: تووشی ئەو تاوانە و ئەو تاوانە بووم، وتی: لە تاوانە گەورەکان نییە، وتی: تاوانە گەورەکان نۆن، ئێستا بۆت دەژمێرم: هاوبەشی بۆ خوا دانان، کوشتنی کەسێك بەناهەق، هەڵاتن ڕۆژی جەنگ تاوانن داوێن پیسی دانە پاڵ داوێن پاك، خواردنی سوو (الربا)، وە خواردنی ماڵی هەتیو بە ستەم، ئیلحادی کردن لەمزگەوتی حەرامدا ئەو کەسەی گاڵتە بە خەڵك دەکات وە گریاندنی دایك و باوك بە ئازاردانیان. زیاد وتی: گەیسەلە وتوویەتی: کاتێ ئیبنو عومەر زانی زۆر دەترسم وتی: ئەترسی بچیتە ناو ئاگری دۆزەخ؟ وتم: بەڵێ، وتی: ئەی حەز دەکەیت بچیتە بەهەشتەوە؟ وتم: بەڵێ، وتی: دایك و باوکت لە ژیاندان؟ وتم: هەر دایکم لە لامە، وتی: سوێند بە خوا ئەگەر تۆ قسەی نەرم و نیانی لەگەڵدا بکەیت و خواردنت پێدا ئەچیتە بەهەشت هەتا لە تاوانە گەورەکان دووریت ئەو تاوانانەی ئاگر پێویست دەکەن.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: ئەبی ئەیوب وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من عَبَدَ الله لا يشرِكُ به شيئا، وأقام الصلاة، وآتى الزكاة، وصام رمضان، واجتنب الكبائر، فله الجنة - أو دخل الجنة" واتە: هەر کەس خوا بپەرستێ و هیچ نەکاتە هاوبەشی و نوێژ بکات و مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت و دوور بێت لە تاوانە گەورەکان ئەچێتە بەهەشتەوە، پیاوێك لێی پرسی تاوانە گەورەکان چین؟ فەرمووی:

"الشرك بالله، وقتل نفس مسلمة، والفِرار يوم الزحْف" (رواه احمد)، واتە: هاوبەش بۆ خوا دانان و کوشتنی کەسێکی موسڵمان و هەڵاتن لە ڕۆژی جەنگدا.

فەرموودەیەکی تر باسی شایەتی درۆ دەکات:

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: ئەنەسی کوڕی مالیك وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) باسی تاوانە گەورەکانی دەکرد و فەرمووی: "الشرك بالله، وقَتْلُ النفس، وعقوق الوالدين. وقال: ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟ قال: قول الزور ـ أو شهادة الزور". واتە: هاوبەش بۆ خوا دانان کوشتنی کەسێك و ئازاردانی دایك و باوك، پاشان فەرمووی: تاوانە گەورەکانتان بۆ باس نەکەم؟ فەرمووی: شایەتی درۆ.

فەرموودەیەکی دیکە، هەردوو شێخ لە سازەوارەکانیاندا لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی بەکرەوە دەگێڕنەوە لە باوکییەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ألا أنبئكم بأكبر الكبائر؟، قلنا: بلى يا رسول الله، قال: الإشراك بالله، وعقوق الوالدين، وكان متكئا فجلس فقال: ألا وشهادة الزور، ألا وقول الزور. فما زال يكررها حتى قلنا: ليته سكت". واتە: ئایا تاوانە گەورەکانتان پێ نەڵێم؟ وتمان: ئەی نێردراوی خوا بەڵێ پێمان بڵێ، فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا دانان و ئازاردانی دایك و باوك، لەو کاتە شانی دادابوو دانیشت و فەرمووی: شایەتی درۆ و قسەی درۆ، ئەڵێ: ئەوەندەی دووبارە کردەوە هەتا ئەمان وت خۆزگە بێ دەنگ بوایە.

فەرموودەیەکی دیکە باسی کوشتنی منداڵی تێدایە: لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە لە ئیبنو مەسعودەوە وتوویەتی: وتم: ئەی نێردراوی خوا کام تاوان گەورەترین تاوانە؟ فەرمووی: "أن تجعل لله نداً وهو خلقك" هاوبەش بۆ ئەو خوایە دابنێی کە دروستی کردوویت، وتم: پاشان چی؟ فەرمووی: "أن تَقْتلَ ولدك خَشيةَ أن يطعم معك". منداڵەکەت بکوژی لە ترسی ئەوەی نانت لەگەڵدا دەخوات، وتم: ئەی پاش ئەوە چی؟ فەرمووی: "أن تزانی حَلِيلَة جارِك" زینا بکەی لەگەڵ حەلاڵی دراوسێیەکەتدا، پاشان ئەم ئایەتەی

خوێندەوە: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ﴾ هەتا: ﴿إِلَّا مَن تَابَ﴾ [الفرقان: ٦٨ - ٧٠].

فەرموودەیەکی دیکە باسی خواردنەوەی عارەقی تێدایە، ئیبنو ئەبی حاتیم ئەگێڕێتەوە لە عومارەی کوڕی حەزمەوە کە گوێبیستی عەمری کوڕی عاص بووە کە لای بەردەکە بووە لای مەککە (ڕەزای خوای لێ بێت) پیاوێك دەربارەی عارەق پرسیاری لێ کرد، وتی: سوێند بەخوا، تاوانێکی گەورەیە کە سەر سپییەکەی وەك من لەم شوێنەدا درۆ بە دەم پێغەمبەرەوە (درودی خوای لێ بێت) بکات، عارەق خواردن لە تاوانە گەورەکانە و دایکی هەموو تاوانێکیشە. هەر کەس عارەق بخواتەوە واز لە نوێژکردن دێنێ و سوار دایکی و پورەکانی دەبێت. (غريب من هذا الوجه).

ڕێگایەکی تر: کە فەرموودەڕەوان ئەبو بەکری کوڕی مەردویە دەگێڕێتەوە کە سالمی کوڕی عەبدوڵڵا لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: ئەبو بەکری صدیق و عوەمەری کوڕی خەتتاب و چەند کەس لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دانیشتبوون خوا لە هەموویان ڕازی بێت دوای مردنی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) باسی تاوانە گەورەکانیان دەکرد، کەسێکیان لا نەبوو پرسیاری لێ بکەن لەوبارەوە، ئەڵێ: منیان نارد بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص کە لەوبارەیەوە پرسیارم لێ کرد، پێی وتم: گەورەترین تاوان خواردنەوەی عارەقە. منیش هاتمەوە بۆ لایان هەواڵم پێدان، ئینکارییان کرد، هەڵسان چوون بۆ لای لەماڵەوە بوو، ئەویش هەواڵی پێدان کە لای پێغەمبەر باسی ئەوەیان کردووە کە پاشایەك پیاوێکی گرت پێی وت: یان عارەق بخۆرەوە، یان ئەو پیاوە بکوژە، یان زینا بکە، یان گۆشتی بەراز بخۆ، یان دەتکوژم؟ ئەویش عارەق خواردنی هەڵبژارد، کاتێ عارەقەکەی خوارد هەرچییان بویستایە بیکردایە ئەیکرد بێ ئەوەی بەرهەڵستی بکات، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وەڵامی داینەوە و فەرمووی: "ما من أحد يشرب خمرًا إلا لم تُقْبَل له صَلاةٌ أربعين ليلة، ولا يموت أحد في مَثَانَتِهِ منها شي و إلا حَرَّم الله عليه الجنة فإنْ مات في أربعين ليلة مات ميتَةً جاهلية". (هذا حديث غريب من هذا الوجه). واتە: هەر کەس عارەق بخواتەوە خوا چل

ڕۆژ نوێژی لێوەرناگرێ، وە هەر کەس مرد و لە عارەق لەناو میزەڵانیدا هەبوو، خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات، ئەگەر لەو چل ڕۆژەدا بمرێ بە مردنی سەردەمی نەزانێ دەمرێ.

فەرموودەیەکی تر دەربارەی سوێندی نقومکەر (الغموس)، ئیمام ئەحمەد لە عەبدوڵلای کوڕی عەمری کوڕی عاصەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "أكبر الكبائر الإشراك بالله، وعُقُوق الوالدين، أو قَتْل النَّفْس - شعبة الشاك - واليمين الغَمُوس". واتە: گەورەترین تاوان هاوبەش بۆ خوا دانانە و ئازاردانی دایك و باوکە، کوشتن کەسێك بە ناهەق و سوێندی نوقمکەر. (رواه البخاري)

فەرموودەیەکی تر باسی بوونە هۆی جوێن دان بە دایك و باوك، ئیبنو ئەبی حاتیم لە عەبدوڵلای کوڕی عەمرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من الكبائر أن يَشْتُمَ الرجلُ والديه": قالوا: وكيف يشتم الرجل والديه؟ قال: "يَسُبُّ الرجلُ أبا الرجل فيسبَّ أباه، ويسُبُّ أمَّه فيسب أمه". واتە: کەسێك جوێن بە دایك و باوکی بدات لە تاوانە گەورەکانە، وتیان: چۆن مرۆڤ جوێن بە باوکی خۆی دەدات؟ فەرمووی: جوێن بە باوکی کەسێك دەدات ئەویش جوێن بە باوکی و دایکی دەدات.

فەرموودەیەکی تر دەربارەی کۆکردنەوەی دوو نوێژ بەبێ بەهانەی شەرعی: ئیبنو ئەبی حاتیم لە عەکریمە و ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من جمع بين الصَّلاتين من غير عُذْرٍ، فقد أتى بابًا من أبواب الكبائر". هەر کەس دوو نوێژ بەسەریەکەوە بکات بەبێ بەهانە ئەوە دەرگایەك لە دەرگاکانی تاوانە گەورەکانی کردووەتەوە.

فەرموودەیەکی تر دەربارەی نائومێد بوون لە ڕەحمەتی خوا: ئیبنو ئەبی حاتیم وتویەتی: لە عەکریمە و لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویانە: جارێك پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) شانی دادابوو، پیاوێك هات بۆ لای وتی: تاوانە گەورەکان کامانەن؟ فەرمووی: "الشِرْكُ بالله، واليأس من رَوْح الله، والقُنوط من رحمة الله، والأمن من مكر الله، وهذا أكبر الكبائر".

واتە: هاوبەش بۆ خوا دانان و نائومێدبوون لە ڕەحمەتی خوا و ئەمین بوون لە مەکری خوا ئەوە لە تاوانە گەورەکانن.

فەرموودەیەکی دیکە دەربارەی گومانی خراپ بردن بە خوا: ئیبنو مەردویە لە نافیعەوە لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: گەورەترین تاوان گومانی خراپ بردنە بە خوا (حديث غريب جداً).

فەرموودەیەکی تر دەربارەی گەڕانەوە بۆ ناو عەرەبە دەشتەکییەکان دوای کۆچ کردن: ئیبنو مەردویە لە ئەبی حەسەمەوە لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "الكبائر سبع، ألا تسألوني عنهن؟ الشِّركُ بالله، وقَتْلُ النفْسِ، والفِرار يوم الزحْفِ، وأَكْلُ مال اليتيم، وأكل الربا، وقَذْفُ المحصَنَة، والتعرب بعد الهجرة". (وفي إسناده نظر، ورفعه غلط فاحش). واتە: تاوانە گەورەکان حەوتن، بۆچی دەربارەیان لێم ناپرسن؟ هاوبەش بۆ خوا دانانە، کوشتنی کەسێکە، وە هەڵاتنی ڕۆژی جەنگ و خواردنی ماڵی هەتیوو و تاوانگرتنە مرۆڤی داوێن پاك و بوونەوە بە عەرەبی دەشتەکی دوای کۆچ کردن.

فەرموودەیەکی تر، لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "الأضرار في الوصية من الكبائر"، واتە: زیان گەیاندن بە میراتگرەکان لە وەسێتدا لە تاوانە گەورەکانە.

فەرموودەیەکی تر لەو بارەیەوە، ئیبنو جەریر وتوویەتی: قاسم لە ئەبی ئومامەوە دەگێڕێتەوە کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە کاتێکدا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) شانی دادابوو باسی تاوانە گەورەکانیان دەکرد ئەیانوت: هاوابەش بۆ خوا دانان، خواردنی ماڵی هەتیوو، هەڵاتنی ڕۆژی غەزا، تاوان گرتنە ئافرەتی پاك داوێن، ئازاردنی دایك و باوك، قسەی درۆ، دزی کردن لە دەستکەوتی جەنگی، سیحر، خواردنی سوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەم ئایەتە دەخەنە کوێ کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلَّذِينَ يَشۡتَرُونَ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ وَأَيۡمَٰنِهِمۡ ثَمَنٗا قَلِيلًا﴾ [آل عمران: ٧٧] ؟! هەتا کۆتایی ئایەتەکە. لە ئیسنادەکەیدا لاوازی هەیەو حەدیسێکی حەسەنە.

## باسی قسەکانی پێشینەکان دەربارەی ئەوە

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە حەسەنەوە هاتووە کە چەند کەسێك لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمریان پرسی لە میسر، وتیان: ئێمە چەند شتێك دەبینین لە قورئاندا کە فەرمان کراوە بە کارپێکردنی، کەچی کاری پێ ناکەن، ئەمانەوێ چاومان بە پێشەوای باوەڕداران بکەوێ لەو بارەوە پرسی پێ بکەین، ئەویش چوو، ئەوانیش چوون لەگەڵیا، عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) پێی گەیشت وتی: ئەوە کەی هاتووی؟ وتی: لەو کاتەو لەو کاتەوە، وتی: بە مۆڵەت هاتووی؟ وتی: نازانم چۆن وەڵامی دایەوە، وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران کۆمەڵێك خەڵك لە میسرەوە هاتوون بۆ لام، ئەڵێن: ئێمە چەند شت ئەبینین لە کتێبەکەی خوادا فەرمان دراوە بە کردنی، بەڵام کاریان پێ ناکرێ، حەزیان دەکرد بێن بۆ لات لەو بارەیەوە پرسیارت لێ بکەن، وتی: کۆیان بکەرەوە بۆم، ئەڵێ منیش کۆم کردنەوەی بۆی، ئیبنو عەون وتوویەتی ـ وابزانم وتی: لە بەهویەکدا ـ عومەر لای خوارو یان پیاوێکی گرت و وتی: سوێندت ئەدەم بە خوا و بە مافی ئیسلام لەسەرت، ئایا هەموو قورئانت خوێندووەتەوە؟ وتی: بەڵێ، وتی: لە دڵی خۆتدا لێکت داوەتەوە؟ وتی: نە بەخوا، ئەڵێ: ئەگەر بیوتایە بەڵێ دژایەتی ئەکرد، وتی: ئەی بە چاوەکانت ئامارت کردووە، ئایا لە زاراوەکەتدا ئامارت کردووە؟ ئایا لە فەرمانەکانتدا ئامارت کردووە؟ پاشان یەك بە دوای یەکدا ئەو پرسیارانەی لێ کردن هەتا دوا کەسیان، ئینجا وتی: ئەی عومەر جەرگی دایکت بۆت بسوتێ، داوای لێ دەکەن کە خەڵك لەسەر کتێبەکەی خوا ڕاوەستاو بکات، پەروەردگارمان زانیویەتی کە خراپەمان دەبێت، ئەڵێ: ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾، پاشان وتی: ئایا خەڵکی مەدینە زانیویەتی؟ یان وتی: ئایا کەسێك زانیوێتی بۆچی هاتوون؟ وتیان: نەخێر، وتی: ئەگەر بیانزانیبایە وتارێکم بۆ ئەدان.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: مالیکی کوڕی جوەیرە لە عەلییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: تاوانە گەورەکان هاوبەش بۆ خوا دانانە و کوشتنی مرۆڤە و خواردنی ماڵی هەیتوە و تاوانی داوێن پیسی دانە پاڵ ئافرەتی داوێن

پاکە و هەڵاتنە لە جەنگ و بوونەوە بە عەرەبی دەشتەکی دوای کۆچکردن و سیحر و ئازاردانی دایك و باوك و خواردنی سوو (الربا) و جیابوونەوە لە کۆمەڵ و پەشیمانبوونەوە لە مامەڵە.

لە ئیبراهیم و عەلقەمەوە هاتووە وتوویانە: ئیبنو مەسعود وتوویەتی: تاوانە گەورەکان لە سەرەتای سورەتی (النساء) هەتا سی ئایەت لەو سورەتەدا هەیە، هەروەها لە زڕی کوڕی حوبەیشەوە لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە، پاشان ئایەتی: ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾. خوێندووەتەوە.

ئیبنو ئەبی حاتیم دەگێڕێتەوە لە بورەیدەوە لە باوکییەوە کە وتوویەتی: گەورەترین تاوان هاوبەش بۆ خوا دانانە وە ئازاردانی دایك و باوك و ڕێگرتن لە زیادە ئاوی دوای ئاودان لە خەڵك و ڕێگرتن لە نێرەی ئاژەڵ بۆ چاك کردنی ئاژەڵی مێی خەڵك بە پارە نەبێت.

لە هەردوو سازەواردا هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا يمنع فضل الما و ليمنع به الكلأ" واتە: ڕێ مەگرن لە ئاوەزیادەکەی ئاودێری پێ دەکەن کە خەڵك ئاودێری پێ بکات. هەروەها فەرموویەتی: "ثلاثة لا ينظر الله إليهم يوم القيامة ولا يزكيهم ولهم عذاب أليم: رجل على فَضْلِ ما و بالفَلاةِ يمنعه ابن السَّبيل"، واتە: سێ جۆرە کەس خوا لە ڕۆژی سەڵادا سەیریان ناکات و پاکیان ناکاتەوەو سزای پڕ ئازاریان بۆ دەبێ، یەکێ لەوانە: پیاوێك لەسەرئاوی زیادەی ئاودێرییەکەی بێت و ڕێ لە ڕێبوار بگرێ بەکاری بێنێ.

لە مەسنەدی ئیمام ئەحمەددا هاتووە لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە لە باوکییەوە لە باپیرییەوە، بە مەرفوعی هاتووە وتوویەتی: "من مَنَعَ فَضْلَ الماءِ وفَضْلَ الكَلِ منعه الله فضله يوم القيامة" واتە: هەر کەس ڕێ لە زیادەی ئاو و لەوەڕ بگرێ لە خەڵك، خوا ڕێی شتە زیادەکانی خۆی لێ ئەگرێ ڕۆژی قیامەت.

ئیبنو جەریر لە موعاویەی کوڕی موڕەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: چوون بۆ

لای ئەنەسی کوڕی مالیك وتی: من هیچ شتێکم نەبینیوە پێمانگەیشتبێ وەك ئەوەی لە خواوە پێمانگەیشتووە کە لە پێناویدا وازمان لە هەموو کەس و کار و ماڵمان نەهێناوە، پاشان نەختێ بێدەنگ بوو ئینجا وتی: خوای گەورە کاتێ ئەوەی دا بە سەرمانا لە خوار تاوانە گەورەکانیشەوە لێمان بوراوە و ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ﴾.

## قسەکانی ئیبنو عەباس دەربارەی ئەوە

ئیبنو جەریر لە حەدیسی موعتەمەری کوڕی سلیمانەوە لە باوکییەوە لە تاووسەوە هاتووە وتوویەتی: لای ئیبنو عەباس باسی تاوانە زەلامەکانیان دەکرد، ئەیانوت ئەو تاوانەن حەوتن، ئەویش وتی: ئەو تاوانانە لە حەوت زیاترە و حەوتن.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: تاووس وتوویەتی: بە ئیبنو عەباسم وت: ئەو حەوت تاوانە زەلامانە چین؟ وتی: ئەوانە لە حەفتاوە نزیکن زیاتر لە حەوت، وە تاووس دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هات بۆ لای ئیبنو عەباس: ئەو حەوت تاوانە گەورەیە دەزانی خوا باسی کردوون؟ وتی: ئەوانە لە حەفتاوە نزیکترن لە حەوتەوە، عەبدوڕەزاق وتوویەتی: تاووس لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە بە ئیبنو عەباسیان وت: ئایا تاوانە زەلامەکان حەوتن؟ وتی لە حەفتاوە نزیکن.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: پیاوێك بە ئیبنو عەباسی وت: حەوت تاوانە گەورەکە چەندن؟ وتی: ئەوانە لە حەوت سەدەوە نزیکترن لە حەوت، بەڵام لەگەڵ داوای لێبوردنکردندا تاوانی گەورە نییە، وە تاوانی بچوکیش نییە لەگەڵ بەردەوام بووندا.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەربارەی: ﴿إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ﴾. وتوویەتی: تاوانە گەورەکان ئەوانەن کە خوا بە ئاگر کۆتاییان دێنێ واتە خاوەنەکانیان دەخاتە ئاگرەوە.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: عەکریمە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: تاوانە گەورەکان ئەوانەن کە خوا پەیمانی داوە خاوەنی بخاتە

ئاگرەوە، وە لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هاتووە کە وتوویەتی: ئاگاداری ئیبنو عەباس بووم ئەیوت: هەرچی خوا کردنی قەدەغە کردووە لە تاوانە گەورەکانە، عەبدوڵڵای کوڕی میعدان لە ئەبی وەلیدەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: دەربارەی تاوانە گەورەکان لە ئیبنو عەباسم پرسی وتی: هەموو ئەو شتانەی سەرپێچی کردنی خوا بێت ئەوە لە تاوانە گەورەکانە.

## وتەکانی تابیعییەکان

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە موحەممەدەوە هاتووە وتوویەتی: دەربارەی تاوانە زەلامەکانی لە عوبێدەم پرسی وتی: هاوبەش بۆ خوا دانان، کوشتنی مرۆڤێك خوا کوشتنی حەرام کردووە بە هەقی خۆی نەبێت وە هەڵاتن لە جەنگ، خواردنی ماڵی هەتیو بە ناهەق، خواردنی سوود (الربا)، بوختان کردن وە دەڵێن: بوونەوە بە عەرەبی دەشتەکی دوای کۆچ کردن ئیبنو عەون وتی: بە موحەممەدم وت: ئەی سیحر؟ وتی: بوختان هەموو شتە شەڕەکان کۆدەکاتەوە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە عوبێدی کوڕی عومەیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: تاوانە گەورەکان (الکبائر) حەوتن تاوانی گەورە نییە ئایەتێکی لەسەر نەهاتبێ، بۆ نموونە هاوبەش بۆ خوادانان لەم ئایەتەدا ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَكَأَنَّمَا خَرَّ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَتَخْطَفُهُ ٱلطَّيْرُ أَوْ تَهْوِى بِهِ ٱلرِّيحُ﴾ [الحج: ٣١] و ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَٰلَ ٱلْيَتَٰمَىٰ ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِى بُطُونِهِمْ نَارًا﴾ [النساء: ١٠] و ﴿ٱلَّذِينَ يَأْكُلُونَ ٱلرِّبَوٰا۟ لَا يَقُومُونَ إِلَّا كَمَا يَقُومُ ٱلَّذِى يَتَخَبَّطُهُ ٱلشَّيْطَٰنُ مِنَ ٱلْمَسِّ﴾ [البقرة: ٢٧٥]، و ﴿ٱلَّذِينَ يَرْمُونَ ٱلْمُحْصَنَٰتِ ٱلْغَٰفِلَٰتِ ٱلْمُؤْمِنَٰتِ﴾ [النور: ٢٣] و هەڵاتن و کۆچ کردن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِم مِّنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُمُ ٱلْهُدَى﴾ [محمد: ٢٥]، وە کوشتنی باوەڕدار ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا﴾ [النساء: ٩٣].

ئیبنو ئەبی حاتیم دەگێڕێتەوە لە ئیبنو ئەبی نەجیحەوە لە عەتاوە واتە ئیبنو ئەبی رەباحەوە کە وتوویەتی: تاوانە زەلامەکان حەوتن: کوشتنی موسڵمان و خواردنی ماڵی هەتیو تاوان دانە پاڵ ئافرەتی باوەڕداری بێ تاوان وە شایەتی

درۆ و ئازاردانی دایك و باوك و هەڵاتن لە جەنگی دژی بێ باوەڕان.

زانایانی ئوصول و فروع جیاوازن دەربارەی حەددی تاوانی گەورە. لەوانەدا هەیە وتوویەتی: تاوانە گەورەکان لە شەرعدا حەدی لەسەر نییە و لێیان هەیە وتوویەتی: هەڕەشەی تایبەتی لەسەر لە کیتاب و سوننەتدا، وە جگە لەوەش وتراوە: ئەبو قاسم عەبدولکەریم کوڕی موحەممەدی رافیعی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (الشرح الکبیر) کە بەناوبانگە بە ناوی (کتاب الشهادات) تێیدا وتوویەتی: پاشان هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دوای ئەوانیش جیاوازییان هەبوو دەربارەی تاوانە زەبەلاحەکان و تاوانە بچوکەکان، وە دەربارەی جیاوازی نێوانیان.

هەندێ لە هاوەڵان دەربارەی تاوانە گەورەکان لێکدانەوەی چەند ڕوویەکیان هەبووە لەوانە: ئەوانەش یەکەم: سەرپێچی کردنن حەدی شەرعی پێویست دەکەن.

دووەمیان: ئەوانە سەرپێچییەکن هەڕەشەی توند هەیە بۆ سەر خاوەنەکانیان بەپێی کیتاب و سوننەت.

سێیەم: ئیمامی حەرەمین لە (الارشاد)دا وتوویەتی: هەموو تاوانێك هەواڵی کەم ئایینی بکەرەکەیان ئەدات، وە ئەو تاوانانە پوچەڵ کەرەوەی دادپەروەرییە.

چوارەم: قازی ئەبو سەعیدی هیرەوی وتوویەتی: تاوانی گەورە ئەو کردەوانەن کە دەقی کیتاب هاتووە لەسەر حەرامێتی وە هەر سەرپێچییەك کە وەك ئەوە حەد پێویست دەکات لە کوشتنی جگە لەوەش، وە وازهێنان لەهەر فەرزێك کە فەرماندراوە بە کردنی، وە درۆکردن لە شایەتیداندا و لە ریوایەتدا و لە سوێنددا ئەوە ئەوانەیە باسیان کردووە لە ڕێی چەسپاندنەوە، پاشان وتوویەتی: پاشان هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دوای ئەوانیش جیاوازییان هەبووە دەربارەی تاوانە زەبەلەحەکان و تاوانە بچوکەکان وە دەربارەی جیاوازی نێوانیان، وە هەندێ لە هاوەڵان دەربارەی تاوانە گەورەکان لێکدانەوەی چەند ڕوویەکیان هەبووە لەوانە ئەوانەش:

یەکەم: سەرپێچی کردنن حەدی شەرعی پێویست دەکەن.

دووەمیان: ئەوانە سەرپێچییەکن هەڕەشەی توند هەیە بۆ سەر خاوەنەکانیان بەپێی کیتاب و سوننەت، سێیەم: ئیمامی حەرەمین لە کتێبی (الارشاد) دا وتوویەتی: هەموو تاوانێك هەواڵی کەم ئایینی بکەرەکەیان ئەدات، وە ئەو تاوانانە پوچەڵ کەرەوەی دادپەروەرییە،

چوارەم: قازی ئەبو سەعیدی هیرەوی وتوویەتی: تاوانی گەورە ئەو کردەوانەن کە دەقی کیتاب هاتووە لەسەر حەرامێتی، وە هەر سەرپێچییەك کە وەك ئەوە حەد پێویست دەکات لە کوشتنی جگە لەویش، وە وازهێنان لەهەر فەرزێك کە فەرمان دراوە بە کردنی، وە درۆکردن لە شایەتی داندا و لە ریوایەتدا و لە سوێنددا ئەوە ئەوانەیە باسیان کردووە لە رێی چەسپاندنەوە، پاشان وتوویەتی: قازی ئەوەی ڕوون کردۆتەوە و وتوویەتی: تاوانە زەبەلاحەکان حەوتن: کوشتنی گیانێك بەبێ حەق و زیناکردن و نێربازی و خواردنەوەی عارەق و دزی و ماڵی خەڵك بە زۆر داگیرکردن و تاوانی داوێن پیسی دانە پاڵ ئافرەتی باوەڕداری داوێن پاك، وە لە کتێبی (الشامل) دا لە حەوتەکە ئەمەشی زیاد کردووە وتوویەتی: شایەتی درۆ، وە خاوەنی کتێبی (العده) ئەمانەشی خستۆتە سەر حەوتەکە وتوویەتی: خواردنی ریبا و ڕۆژو شکاندن لە ڕەمەزاندا بەبێ بەهانەی شەرعی و سوێندی درۆو سیلەی ڕەحم پچڕاندن و ئازاردانی دایك و باوك و هەڵاتن لە جەنگ و خواردنی ماڵی هەتیو ناپاکی کردن لە کێشان و پێوانەدا و نوێژکردن پێش کاتی خۆی و دواخستنی لە کاتی خۆی بەبێ بەهانە و بەرتیل وەرگرتن و قیادەکردنی نێوان پیاوان و ژنان و خۆبردنە پێشەوە لەبەردەم دەسەڵاتدا و نەدانی زەکات و وازهێنان لە فەرمان بە چاکە کردن و قەدەغەکردنی خراپە لەگەڵ بوونی تواناداو و لەبیرچوونەوەی قورئان دوای لەبەر کردنی و سوتاندنی ئاژەڵ بە ئاگر و دوورخستنەوەی ژن لە مێردەکەی بەبێ هۆ و نائومێد بوون لە ڕەحمەتی خوا و ئەمین بوون لە مەکری خوا و تێکدانی نێوان زانایان و خەڵگرانی قورئان و ئەوانەی بە تاوانە گەورەکان دادەنرێت: پشت کردنە ژن و (الظهار)و خواردنی گۆشتی بەراز و مردارەوەبوو بەناچاری نەبێ.

منیش دەڵێم: خەڵك دەربارەی تاوانە گەورەکان چەندەها کتێبیان داناوە لەوانە ئەوەی شێخی فەرموودەڕەوان ئەبو عەبدوڵڵای زەهەبی کۆی کردۆتەوە کە نەگاتە هەفتا تاوانی گەورە (الکبیرة).

ئەگەر وترا: تاوانی گەورە ئەوەیە کە یاسادانەر هەڕەشەی بە ئاگر کردووە لە خاوەنی وەك ئیبنو عەباس و جگە لەویش وتوویانە، وە ئەوانەی بە شوێن ئەوەدان بەشێکی زۆری لێ کۆکراوەتەوەو ئەگەر وترا هەموو ئەوانەن کە خوا کردنی قەدەغە کردوون زۆر زۆرن، ئیتر خوا دەزانێ.

﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۢ ۚ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌۭ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ ۖ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌۭ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَ ۚ وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًۭا ﴿٣٢﴾﴾

واتە: نابێ ئاوات بەو شتانە بخوازن کە خوا بەوانە هەندێك لە ئێوەی بەرامبەر بە هێندێکی تر سەرخستووە، پیاوان بەپێی کردەوە و کۆششی خۆیان، ژنەکانیش بەرامبەر بە کردەوەیان، هەرکام بەشی خۆیان هەیە، ئێوە دەبێ هەر لەبەر خودا وەپاڕێن، چاکەتان دەربارە بکا خودا بۆ خۆی لە هەموو شت ئاگادارە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە سوفیانەوە لە ئیبنو ئەبی نەجیحەوە لە ئوم سەلەمەوە کە وتوویەتی: وتم ئەی نێردراوی خوا پیاوان غەزا دەکەن ئێمە بۆمان نییە غەزا بکەین و ئێمە نیوەی میراتمان بۆ دانراوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۢ ۚ﴾.

لە موجاهیدەوە هاتووە کە ئوم سەلەمە وتوویەتی: ئەی نێردراوی خوا ئێمە بۆمان نییە غەزا بکەین هەتا شەهید بین، وە نیوەی میراتمان بۆ دانراوە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە، پاشان خوای گەورە ئایەتی: ﴿أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَـٰمِلٍۢ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ﴾ [آل عمران: ١٩٥] دابەزاند.

موعەمەر لە شێخێکی مەککەوە بۆی گێڕاینەوە کە وتوویەتی: ئەو ئایەتە

دەربارەی قسەی ژنان هاتۆتە خوارەوە کە وتوویانە: خۆزگە ئێمەش پیاو بووینایە جیهادمان بکردایە وەك ئەوان جیهاد دەکەن، بۆ ئەوەی لە ڕێی خوادا غەزامان بکردایە.

ئیبنو ئەبی حاتیم لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ژنێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا بۆ نێرینە دوو ئەوەندەی مێینەیەکە و شایەتی دوو ژن بەرامبەر پیاوێکە و ئێمەش هەر بەو شێوەیە کار دەکەین، ئەگەر ژنێك کارێکی چاك بکات نیوەی چاکەکەی بۆ دەنووسرێ، ئیتر خوای گەورە ئایەتی: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْاْ﴾ ناردە خوارەوە، ئەوە لە منەوە دادپەروەرییە و لە کردەوەکانی منە.

سوودی دەربارەی ئایەتەکە وتوویەتی: پیاوان وتیان: ئەمانەوێ پاداشتی ئێمە لەسەر کردەوەکان، دوو ئەوەندەی پاداشتی ژنەکان بێت وەك چۆن دوو پشکمان بەردەکەوێ لە میراتدا، وە ژنەکان وتیان: ئێمە ئەمانەوێ پاداشتەکەمان وەك پاداشتی شەهیدەکان بێت، چونکە ئێمە ناتوانین بجەنگێین، ئەگەر جیهادمان لەسەر بنووسرایە جیهادمان دەکرد، خوای گەورە ئەوەی نەکرد بەڵکو فەرمووی: پێیان داوای فەزڵی من بکەن، وتی: بۆ شتی دونیایی نا.

لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: نابێ پیاو ئاواتەخواز بێت بڵێ: خۆزگە منیش وەك ماڵی فلان و کەس و کاریم هەبوایە، ئیتر خوای گەورە ئەوەی قەدەغە کرد داوای لێ کردن داوای فەزڵی خوا بکەن. ئەوەش ڕواڵەتی ئایەتەکەیە، ڕەد نییە بۆ ئەو فەرموودە چەسپاوە سازەی کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا حَسَد إلا في اثنتين: رجل آتاه الله مالا فسَلَّطَه على هلكته في الحق، فيقول رجل: لو أن لي مثل ما لفلان لعَمِلْتُ مثله. فهما في الأجر سواء". واتە: حەسودی بردن ڕەوا نییە بە کەس لە دوو شتدا نەبێت: پیاوێك خوا سامان و ماڵی پێدابێ و لەڕێی خوادا سەرفی بکات پیاوێکیش بڵێ خۆزگە منیش وەك ئەو ماڵ و سامانم بوایە وەك ئەو کارم پێ بکردایە، ئەو دوانە لە پاداشتدا وەك یەکن.

ئەوە شتێکە ئایەتەکە قەدەغەی نەکردووە، ءایەتەکە بە ئاواتخواستنی

شتەکەی قەدەغە کردووە، بۆیە فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَتَمَنَّوْا۟ مَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بِهِۦ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍۚ﴾ واتە لە کاروباری دونیایدا، هەروەها کاروباری ئایینی.

پاشان فەرموویەتی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبُوا۟ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا ٱكْتَسَبْنَۚ﴾ واتە: هەریەکەیان بەپێی کردەوەکانیان پاداشتیان دەدرێتەوە ئەگەر خێر بوو بە خێر، ئەگەر شەڕیش بوو بەشەڕ، ئەوە قسەی ئیبنو جەریرە.

وتراوە مەبەست بەوە دەربارەی میراتە واتە هەریەکەیان بەپێی خۆی میرات دەبات (ترمزی لە ئیبنو عەباسەوە دەیگێڕێتەوە).

پاشان خوای گەورە ڕێنماییان دەکات بۆ ئەو شتەی چاکە بۆیان فەرموویەتی: ﴿وَسْـَٔلُوا۟ ٱللَّهَ مِن فَضْلِهِۦٓۚ﴾، بە ئاواتەخوازی ئەوە مەبن کە خوا داوێتی بە هەندێکتان و نەیداوە بە هەندێکتان، چونکە ئەوە شتێکی بڕاوەیە ئاواتخواستنی بێ سوودە، بەڵام بە فەزڵی خۆم داوام لێ بکەن ئەتاندەمێ، چونکە بەخشندە و بەخشەرم.

تیرمزی و ئیبنو مەردویە لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "سلُوا الله من فَضْلِه، فإن الله يحب أن يسأل وإن أفضل العبادة انتظار الفرج" واتە: بە فەزڵی خۆی داوا لە خوا بکەن، چونکە خوا حەز دەکات داوای لێ بکرێت، چاکترینی خواپەرستی چاوەڕوانیی کرانەوەی دەرووە.

بەو شێوەبە ئیبنو مەردەویە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "سَلُوا الله من فَضْلِه، فإن الله يحب أن يُسأل، وإن أحبَّ عباده إليه الذي يُحب الفرج"، واتە: بە فەزڵی خۆی داوا لە خوا بکەن، چونکە خوا حەز دەکات داوای لێ بکرێ وە خۆشەویست ترین بەندە لای خوا ئەو کەسەیە حەز لە کرانەوەی دەروو بکات.

پاشان فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمًا﴾ واتە: زانایە بەوانەی شایستەی دونیان، لە دونیا بەشیان دەدات، وە بەوەی شایستەی هەژارییە هەژاری دەکات، وە زانایە بەوەی شایستەی ڕۆژی دواییە بە پێی کردەوەکانی دەیداتێ، وە بەو کەسەی شایستەی سەرشۆڕییە، خوای گەورە

سەرشۆڕی دەکات، خێر و هۆکانی لێ دووردەخاتەوە لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا﴾.

﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾﴾

واتە: دایە و بابە خزمە زۆر نزیکەکان و ئەو کەسانەی پەیمان لەگەڵ گرێدان، هەرکە مردن و ماڵێکیان لە دوا مابوو، با بەشی خۆیان پێ بگات خودا لەسەر هەموو شت ئاگادارە .

ئیبنو عەباسە و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئەبو ساڵح و قەتادە و زەیدی کوڕی ئەسلەم و سوودی و زەحاك و موقاتیلی کوڕی حەیان و غەیری ئەوانیش دەربارەی ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ﴾ واتە: میراتگر، وە لە ریوایەتێکی ئیبنو عەباسدا هاتووە واتە: پشت، ئیبنو جەریر وتوویەتی: عەرەب بە کوڕی مام دەڵێن مەولا.

مەبەستی خوای گەورە لە ﴿مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ لەو میراتەی دایك و باوك و خزمانە بەجێی دێڵن.

لێکدانەوەی قسەکە: ئەی خەڵکینە بۆ هەر کەسێکتان کۆمەڵێك لە پشتان هەیە لەو میراتییە دەگرن کە دایك و باوك و خزمەکان لە میرات بەجێیان هێشتووە.

﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾ واتە ئەوانەی پەیمانتان لەگەڵ بەستوون بەشی خۆیان بدەن لەو میراتە وەك پەیمانتان پێ داون، چونکە خودا ئاگاداری ئەو پەیمان و گرێبەستانەی نێوانتانە، ئەوەش لە سەرەتای ئیسلامدا بووە، پاشان سڕراوەتەوە و فەرمانیان پێ کراوە کە ئەو پەیمان و گرێبەستانە بینە سەر و دوای ئەو ئایەتە ئیتر پەیمان و گرێبەستی تر نەکەن.

لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ﴾ واتە:

میراتگر ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ﴾ وتوویەتی: کۆچکەران کاتێ مەدینە کۆچکەر ئەبووە میراتگری یارمەتیدەر بەبێ خزمانی برا ئەوانەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کردنی بە برا کاتێ ﴿وَلِكُلّٖ جَعَلۡنَا مَوَٰلِيَ﴾ سڕرایەوە، پاشان وتوویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ﴾ لەسەر خستن و یارمەتیدانە و ئامۆژگاری بێ سۆ میرات رۆیی وەسێتی بۆ دەکرێ، پاشان بوخاری وتوویەتی: ئەبو ئوسامە ئەوەی لە ئیدریس بیستووە وە ئیدریس لە تەلحەوە وە لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ﴾ وتوویەتی: پێش ئیسلام پیاو پەیمانی دەبەست لەگەڵ پیاودا و دەیوت: تۆ میراتی من بگرە و منیش میراتی تۆ وە هۆزەکان ئەبوونە هاوپەیمانییەك پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "كُل حلْف كان فى الجاهلية أو عَقْد أدْرَكَه الإسلامُ، فلا يَزِيدُه الإسلامُ إلا شدَّةً، ولا عَقْد ولا حِلْفُ فى الإسلام". هەر پەیمان و گرێبەستێ لەسەردەمی نەفامی دا کرابێت ئیسلام پێ گەیشتبێ ئیسلام هێزی ئەو پەیمان و گرێبەستە زیاد دەکات ئیتر لە ئیسلامدا گرێبەست و پەیمان نامێنێ، وە ئەم ئایەتە سڕیوێتیەوە: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ﴾ [الأحزاب: ٦].

لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نییە.

لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوفەوە هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "شهِدتُ حِلْف المُطيَّبين، وأنا غُلامٌ مع عُمُومتى، فما أحب أن لى حُمْرَ النَّعَم وأنا أنكثُهُ". واتە: ئامادەی پەیمان موتەیبین بووم لەگەڵ مامەکانمدا بە منداڵی ئەوەندەی حەزم لەو پەیمانە دەکرد ئەوەندە حەزم لە گەلە وشتر نەدەکرد، من ئێستا هەڵی دەوەشێنمەوە وە زوهری وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لم يُصب الإسلامُ حِلْفا إلا زاده شِدَّةً". واتە ئیسلام گەیشتبێ بە هەر هاوپەیمانییەك بەهێزی کردووە، ئەوەبوو پێغەمبەر نێوان ئەنصارەکان و قوڕەیشی یەك خست.

لە قەیسی کوڕی قاسمەوە هاتووە وتوویەتی: دەربارەی هاوپەیمانی لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لێ بێت) پرسی، فەرمووی: "ما كان من حِلْفٍ في

الجاهلية فَتَمَسَّكُوا به، ولا حِلْفِ في الإسلام". واتە هەرچی پەیمان بەستنێك هەبووە و كردووتانە لەسەردەمی نەفامیدا دەستی پێوەبگرن، چونكە پەیمان بەستن لە ئیسلامدا نییە.

عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكییەوە لە باپیرییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: كاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چووە ناو مەككە ڕۆژی كردنەوەی مەككە وتارێكی بۆ خەڵكەكە داو فەرمووی: "یا أیها الناس، ما كان من حِلْفٍ فی الجاهلیة، لم یَزِدْه الإسْلامُ إلا شِدَّةً، ولا حِلْفَ في الإسلام". ئەی خەڵكینە هەرچی هاوپەیمانییەك هەبووبێ لەسەردەمی نەفامیدا ئیسلام توندوتۆڵی دەكات، لە ئیسلام پەیمان بەستن نییە.

موحەممەدی كوڕی ئیسحاق لە داودی كوڕی حوسەینەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: دایكی سەعدی كچی سەعدی كوڕی روبەیعم لەگەڵ كوڕی كوڕەكەیدا فێری قورئان دەكردن كاتێ بۆم دەخوێندەوە وتم: (والذین عاقدت أیمانكم) وتی: وانییە، بەڵكو ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَٰنُكُمْ﴾ وتی: ئەوە دەربارەی ئەبو بەكر و كوڕەكەی هاتۆتە خوارەوە كە ناوی عبدالرحمن بوو نەیدەویست موسڵمان بێت، ئەبو بەكر سوێندی خوارد كە لە میراتەكەی بەشی نەدات، كاتێ بە زۆر موسڵمان كرا خوای گەورە فەرمانی پێدا بەشەكەی پێ بداتەوە (ئەوە قسەیەكی غەریبە).

ڕاستی قسەی یەكەمە كە لە سەرەتای ئیسلام بە پەیمان بەستن میراتی یەكتریان دەگرت پاشان نەسخ بووەوە، بەڵام كاریگەری پەیمان بەستنەكە هەر مابوو، هەر چەندە فەرمانیان پێ كرابوو كە پەیمان و گرێبەستەكانیان بەرنە سەر وە ئەو پەیمانانەی پێش ئەوە بەستبویان.

ڕاستیش لەوبارەیەوە قسەی جەماوەر و مالیك و شافیعی و ئەحمەدە لە ریوایەتێكی بەناوبانگیدا لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلِكُلٍّ جَعَلْنَا مَوَٰلِيَ مِمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ﴾ واتە: میراتگرانی لە خزمە نزیكەكانی و لە دایك و باوكی و خزمە نزیكەكانیان، ئەوانە ئەبنە میراتگری نەك كەسانی دیكە وەك لەهەردوو سازەواردا چەسپاوە لە ئیبنو عەباسەوە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "أَلْحِقُوا الفرائِضَ بأهلها، فما بَقِيَ فهو

لأوْلَى رَجُلٍ ذَكَرٍ" واتە: میراتەکان دابەش بکەن بەسەر خاوەن بەشەکاندا ئەوانەی خوای گەورە لە هەردوو ئایەتی بەشە دانراوەکاندا باسی کردوون ئەوەی مایەوە بیدەن بە پشتەکان.

﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ﴾ واتـە: پـێـش هـاتـنـە خـوارەوەی ئـایـەتـە بەشەکانیان بدەنێ ئەوانەی پەیمانتان لەگەڵ بەستوون لە میرات ـ ئیتر هەرچی پەیمانێك ببەسترێ دوای ئەوە کاریگەری نییە ـ وە وتراوە ئەم ئایەتە پەیمان بەستنەکانی داهاتووی سڕیوەتەوە لەگەڵ ڕابوردوو، ئیتر میراتگریان پێ دروست نابێ لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە کە ئیبنو عەباس دەربارەی ئایەتی: ﴿وآتوهم نصيبهم﴾ وتوویەتی: لە یارمەتیدان و ئامۆژگاری دا، چونکە میراتگرتن ڕابورد.

وە عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە ئەگێڕێتەوە کە ئیبنو عەباس دەربارەی ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ﴾ وتوویەتی: لەوەوپێش پیاو پەیمانی دەبەست لەگەڵ پیاوێکی تردا هەرچییان زوو مرد ئەویتریان میراتەکەی بگرێ، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا﴾ [الأحزاب: ٦] مەگەر وەسیەت بکەن بۆ سەرپەرشتیکاریان ئەوانەی پەیمانیان بەستووە لەگەڵیان دروستە سێ یەکی ماڵی هەتیویان پێ بدرێ ئا ئەوەش چاکەیەکە (المعروف).

بەوەشێوەیە چەند کەس لە پێشینان دانیان ناوە بەوەدا کە ئەوە سڕاوەتەوە بە ئایەتی: ﴿وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِى كِتَـٰبِ ٱللَّهِ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُهَـٰجِرِينَ إِلَّآ أَن تَفْعَلُوٓا۟ إِلَىٰٓ أَوْلِيَآئِكُم مَّعْرُوفًا﴾. وە سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: ﴿فَـَٔاتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾، واتە: بەشە میراتەکەیان بدەنێ. زوهری و ئیبنو موسەیب وتوویانە: ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوانە هاتۆتە خوارەوە کە خەڵکیان دەکرد بە کوڕی خۆیان و میراتیان پێ ئەدان خوای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە دەربارەیان بەشیانی لە وەسێتدا دانا، وە میراتیشی گێڕایەوە بۆ مەوالییەکان، وە خوای گەورە ڕێی نەدا میرات بۆ ئەوانە بێت کە دەکرێن بە کوڕی خۆ، بەڵام لە وەسێتدا بەشی بۆ دانان.

ئیبنو جەریر ئەوەی هەڵبژاردووە کە مەبەست لە پێدانیان یارمەتیدان و ئامۆژگاری و سەرخستنیان بووە نەك مەبەست لە ﴿فَآتُوهُمْ نَصِيبَهُمْ﴾، لە میرات بێت بۆ ئەوەی ئایەتەکە بسڕرێتەوە، نەك ئەوە حوکمێك بوبێت پاشان سڕرابێتەوە، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر بردنە سەری پەیمان و گرێبەست و سەرخستن و ئامۆژگاری و بەس، بەوشێوەیە ئایەتەکە حوکمەکەی هەرماوە نەك سڕابێتەوە، ئەوەی ئەمیش وتوویەتی چاو پیاخشاندنەوەی دەوێ، چونکە پەیمان هەبوو لەسەرخستن و یارمەتیدان بەسترابوو وە هەبوو لەسەر میرات بوو وەك چەند کەس لە پێشینەکان باسیان کردووە. وەك ئیبنو عەباس وتوویەتی: لەپێشەوە کۆچکەران میراتی ئەنصارییان دەگرت بێ ئەوەی خزمی بێت تا نەسخ بووەوە، ئەی چۆن دەڵێن ئەم ئایەتە حوکمی پێ دەکرێ، ئیتر خوا دەزانێ.

﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْۚ فَٱلصَّٰلِحَٰتُ قَٰنِتَٰتٌ حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُۚ وَٱلَّٰتِى تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِى ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّۖ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُواْ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًاۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾

واتە: پیاوان بەسەر ژناندا دەسەڵاتیان هەیە کە خوا هێندێکی هێژاتر بەدی هێناوە لەبەر ئەوەی پیاوان ئەرکی بەڕێوەچوونی ماڵیان لەسەر شانە، جا ژنانی باش ئەوانەن کە گوێبیستن و وەك خودا فەرمانی داوە دوور لە شویان شەرمی خۆیان دەپارێزن و ئاگایان لە ماڵی دەبێ، ئەو ژنانەش لە نشوز بونیان دەترسن ئامۆژگاری کەن و جێگەیان لێ جیا کەنەوە، وە لێشیان بدەن، دەبێ ئەگەر دێنەوە بەرفەرمان ئێوە بیانوی ئازاردانیان مەدۆزنەوە خودا جێ بەرز و زانایە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ﴾ واتە: پیاو چاودێرە بەسەر ژنانەوە واتە پیاو سەرۆکێتی و گەورەیەتی دادوەرە بەسەریەوە و

ڕەوشت دادرێتی کاتێ بە لاری ڕۆیشت ﴿بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٍ﴾ واتە: لەبەر ئەوەی پیاوان چاکترن لە ژنان وە پیاو خێرترە لە ژن لەبەر ئەوە پێغەمبەرایەتی تایبەتە بە پیاوانەوە، هەروەها پاشایەتی بەپێی فەرموودەی پێغەمبەر: "لن يفلح قوم ولوا امرهم امرأة" واتە: ئەو قەومە ڕزگاری نابێت کە ژن سەرپەرشتیاری کاروباری دەکات. (رواه البخاري).

﴿وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾ واتە: لە مارەیی دان و نەفەقەکێشان و ئەو ئەرکانەی خوا پێویستی کردووە لەسەریان لە کتێبەکەیدا و لە سونەتی پێغەمبەرەکەیدا پیاو لە خۆیدا چاکترە لە ژن وە فەزڵی هەیە بەسەریەوە گونجاوە کە بوترێ چاودێرە بەسەریەوە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَلِلرِّجَالِ عَلَيۡهِنَّ دَرَجَةٞۗ﴾ [البقرة: ٢٢٨].

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾ واتە: پێشەوا و سەرۆك لەسەر ژن پێویستە بەرفەرمانی بێ لەو شتانەی فەرمانی پێدەکات بەرفەرمانییەکەشی ئەوەیە کە چاکە بکات لەگەڵ کەس و کاری مێردەکەیدا و ماڵەکەی بپارێزێ.

حەسەنی بەصری وتوویەتی: ژنێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) سکاڵای لەدەست مێردەکەی کرد کە لێی ئەدات، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (القصاص) خوای گەورە ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾ بەبێ قیصاص گەڕایەوە.

لە عەلییەوە دەگێڕنەوە کە پیاوێك لە ئەنصارەکان ژنەکەی هێنا بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ژنەکە وتی: ئەی نێردراوی خوا فڵانە کەسی مێردی کە ئەنصارییە لێیداوە و بەسەرچاوییەوە دیارە جێگەی لێدانی، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: بۆی نییە ئەو کارە بکات، خوای گەورە ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعۡضَهُمۡ عَلَىٰ بَعۡضٖ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنۡ أَمۡوَٰلِهِمۡۚ﴾ ناردە خوارەوە، واتە لە ڕەوشت فێرکردنیا، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: من شتێکم ویست و خوا شتێکی تر.

شەعبی دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: ﴿ٱلرِّجَالُ قَوَّٰمُونَ عَلَى ٱلنِّسَآءِ بِمَا فَضَّلَ ٱللَّهُ بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ وَبِمَآ أَنفَقُواْ مِنْ أَمْوَٰلِهِمْ﴾ ئەو مارەییەی دەیدایە ژن، ئەی نابینی ئەگەر قەزفی بکات مولاعەنەی دەکات ئەگەر ئەو قەزفی بکات جەڵدی لێ دەدرێ.

کە خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَٱلصَّٰلِحَٰتُ﴾ چاکەکاران لە ژنان ﴿قَٰنِتَٰتٌ﴾ واتە: بەرمان بۆ مێردەکانیان ﴿حَٰفِظَٰتٌ لِّلْغَيْبِ﴾ واتە: لە کاتی دیارنەبوونی مێردەکەیدا خۆی ماڵی بپارێزێ ﴿بِمَا حَفِظَ ٱللَّهُ﴾ پارێزراو کەسێکە خوا پاراستبێتی.

لە ئەبی هورێرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "خَيرُ النساءِ امرأةٌ إذا نَظَرْتَ إليها سَرَّتْكَ وإذا أمَرْتَها أطاعتكَ وإذا غِبْتَ عنها حَفِظَتْكَ فی نَفْسِها ومالِكَ". واتە: چاکترین ژن ئەوەیە کە کاتێ سەیرت کرد دڵت خۆش بێت کاتێ فەرمانت پێ کرد بەرفەرمانی کرد کاتێ لێی دورکەوتیتەوە خۆی ماڵەکەت بپارێزێ.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إذا صَلَّت المرأة خَمسها، وصامت شهرها وحفظت فَرْجَها، وأطاعت زوجها قِيلَ لها: ادخُلِی الجنة من أيِّ أبواب الجنة شِئْتِ". واتە: هەر ژنێك پێنج فەرزە نوێژی کرد و مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بوو و خۆی لە خراپە پاراست و بەرفەرمانی مێردی بوو کە مرد پێی دەوترێ لەهەر دەرگایەکەوە حەز دەکەیت بچۆرە بەهەشتەوە.

﴿وَٱلَّٰتِی تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ﴾ واتە: ئەو ژنانەی ترستان هەیە لێیان خۆیان بە بەرزتر بزانن لە مێردەکانیان و پشت بکەنە فەرمانەکانیان و ڕقیان لێیان بێت. جا هەر کاتێ نیشانەکانی ئەو خۆ بەزلزانینەیان لێ دەرکەوت با مێردەکەی ئامۆژگاری بکات بیترسێنێ لە سزای خوا لەسەرپێچی کردنەکەیدا، چونکە خوا مافی مێردی لەسەر پێویست کردووە و ئەبێ بەرفەرمانی بکات و حەرامە لەسەری سەرپێچی فەرمانەکان بکات لەبەر ئەوەی چاکەی بەسەریەوەیەتی و لەو چاکترە. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لو كُنْتُ آمرًا أحدًا أن يَسْجد لأحد لأمرتُ المرأة أن تَسْجُدَ لزوجها، من عِظَم حَقِّه عليها"،

ئەگەر فەرمانم بکردایە بە کەسێك کە کڕنوش بەرێت بۆ کەسێك فەرمانم دەکرد بە ژن کڕنوش بەرێ بۆ مێردەکەی لەبەر گەورەیی مافی مێردەکەی بەسەریەوە.

هەروەها فەرموویەتی: "إذا دَعَا الرَّجُلُ امرَأتَهُ إلى فِرَاشِه فأبَتْ عليه، لَعَنَتْهَا الملائكة حتى تُصْبِح" ورواه مسلم، واتە: ئەگەر پیاوێك ژنەکەی بانگ کرد بۆ ناو پێخەفەکەی ئەویش نەچوو بەدەمییەوە هەتا ڕۆژ دەکاتەوە فریشتە نەفرینی لێ دەکات. لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ﴾.

کە خوا دەفەرموێت: ﴿وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ﴾ عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی (الهجر) واتە کاری ژن و مێردایەتی لەگەڵدا نەکات لەپاڵیا بخەوێ و پشتی تێ بکات. هەندێ لەوانە سوودی و زەحاك و عەکریمە و ئیبنو عەباس لە ریوایەتێکدا وتوویانە: قسەی لەگەڵ نەکات لەگەڵ ئەوەشدا نەیدوێنێ.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئامۆژگاری بکات ئەگەر ئامۆژگاری وەربگرێ ئەگینا لە جێگادا پشتی تێ بکا و قسەی لەگەڵ نەکات، چونکە ئەوە بە لای ژنەوە زۆر ناخۆشە.

لە ئەبی حورە ڕەقاشیەوە هاتووە کە مامی وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "فان خفتم نشوزهن فاهجروهن فی المضاجع" ئەگەر ترسی خۆبەزل زانینتان لێیان بوو لە جێگادا پشتیان تێ بکەن سەرجێیان لەگەڵ مەکەن.

موعاویەی کوڕی حەیرەی قوشەیری وتوویەتی: ئەی نێردراوی خوا مافی ژن چییە بەسەر هەریەکێ لە ئێمەوە؟ فەرمووی: "أتطعمها اذا طعمت وتكسوها اذا التسيت ولا تضرب الوجه ولا تضجع ولا تهجر الى فى البيت" خواردنی بدەیتێ لەگەڵ خۆتدا و پۆشاکی بۆ بکەیت لەگەڵ خۆتدا بەسەرچاوی نەدەیت و قسەی پێ نەڵێیت و قسەی لێدانەبڕی لە ماڵەوە نەبێت .

﴿وَٱضۡرِبُوهُنَّۖ﴾ واتە: ئەگەر بە ئامۆژگاری و قسە لەگەڵ نەکردن نەگەڕایەوە بۆتان هەیە لێیان بدەن بە لێدانێکی سووك وەك لە سازەواری موسلیمدا چەسپاوە لە جابیرەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە حاجی ماڵئاواییدا فەرمووی: "واتَّقُوا اللهَ فی النِّساءِ، فإنهن عندكم عَوَانٌ، ولكم عليهن ألا يُوطِئْنَ فُرُشكم أحدا تكرهونه، فإن فَعَلْن فاضربوهن ضَرْبا غير مُبَرِّح، ولهن رِزْقُهنَّ وكِسْوتهن بالمعروف" واتە: لە خوا بترسن دەربارەی ئافرەتان، چونکە ئەوانە بۆ ئێوە یارمەتیدەرن مافی ئێوە لەسەریان ئەوەیە کەسێك نەبەنە ماڵەوە ئێوە پێتان ناخۆش بێت ئەگەر ئەوەیان کرد لێیان بدەن لێدانێك شوێنی دیار نەبێ مافی ئەوانیش بەسەر ئێوەوە ئەوەیە بژێوی و پۆشاکیان بۆ ئامادە بکەن بە چاکی.

لە ئیباسی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی ذوبابەوە هاتووە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا تضربوا اما و الله" واتە لە کەنیزەکانی خودا مەدەن، عومەر هات بۆ لای پێغەمبەر وتی: "ژنەکان زاڵ دەبن بەسەر مێردەکانیاندا، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) ڕێی دا کە لێیان بدەن. زۆر لە ژنەکان هاتن بۆ لای کەس و کاری پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) سکاڵایان کرد لە پیاوەکانیان، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ژنی زۆر هاتوون بۆ ماڵمان سکاڵا دەکەن لە پیاوەکانیان ئەوانە لە چاکەکانتان نین.

لە ئەشعەثی کوڕی قەیسەوە هاتووە وتوویەتی: بوومە میوانی عومەر، ژنەکەی گرت و بڕێکی لێ دا، پاشان وتی: ئەی ئەشعەث سێ شت لە منەوە لەبەر بکە کە من لە پێغەمبەرەوە لەبەرم کردووە، لە پیاو مەپرسە بۆچی لە ژنەکەت دەدەیت، هەتا نوێژی وەتر نەکەیت مەخەوە، ئەڵێ سێیەمم لەبیر چووەتەوە .

﴿فَإِنۡ أَطَعۡنَكُمۡ فَلَا تَبۡغُواْ عَلَيۡهِنَّ سَبِيلًاۗ﴾ واتە: ئەگەر ژنەکە بەرفەرمانی مێردی بوو لە هەموو ئەوانەدا کە دەیەوێ لێی لەوانەی خوا بۆی ڕەوا کردووە ئیتر ڕێگای بەسەریەوە نامێنێ و بۆی نییە لێی بدات و قسەی لێ دابڕێ و پشتی تێ بکات.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا﴾ ئەوە هەڕەشەیە بۆ پیاوان کاتێ ستەم لە

ژنەکانیان بکەن بەبێ هۆ، چونکە خوای گەورەی بەرز یارمەتیدەریانە تۆڵە لەوانە ئەکاتەوە کە ستەمیان لێ دەکات.

﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا خَبِيرًا ﴿٣٥﴾﴾

باسی حاڵی یەکەمی کردووە کاتی نفورو نشوزەکە لە ژنەکەوە بوو، پاشان باسی حاڵی دووەم دەکات کاتێ نفورەکە لە ژن و مێردەکەوە بێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَٱبْعَثُوا۟ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ﴾. زانایان وتوویانە: کاتێ دووبەرەکی کەوتە نێوان ژن و مێرد دادوەر دایان دەنێت و سەیری بارودۆخیان دەکات ستەمکارەکەیان قەدەغە دەکات لە ستەمکردن کاتێ فەرمانەکەیان گەورە بوو دژایەتییەکەیان درێژەی کێشا دادوەر ئەبێ بنێرێ بە شوێن یەکێکی جێی متمانە و باوەڕ لە کەس و کاری پیاوەکە و یەکێکیش لە کەس و کاری ژنەکە کە جێی باوەڕ بێت بۆ ئەوەی کۆ ببنەوە سەیری بارودۆخیان بکەن کارێ بکەن کە بەرژەوەندی بۆ هەردووکیان تێدا بێت بۆ ئەوەی دووریان بخەنەوە لە جیابوونەوە، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن يُرِيدَآ إِصْلَٰحًا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيْنَهُمَآ﴾.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: "خوای گەورە فەرمانی داوە پیاوێکی چاك لە کەس و کاری پیاوەکە و پیاوێکی وەك ئەویش لە کەس و کاری ژنەکە بنێرن سەیر بکەن بزانن کامیان تاوانبارە، ئەگەر پیاوەکە ناوانبار بوو ژنەکەی لێ دوور بخەینەوە و نەفەقەی لێ بسەنن، بەڵام ئەگەر ژنەکە تاوانبار بوو دووری بخەنەوە لە پیاوەکە و نەفەقەی نەدەنێ، جا کاتێ ئەو پیاوانە رێك کەوتن لەسەر ئەوەی جیاببنەوە یان بچنەوە لای یەك فەرمانەکەیان دروستە، ئەگەر ڕایان وابوو بچنەوە لای یەك بەڵام یەکێکیان ڕازی بوو ئەوی دیکەیان ڕازی نەبوو، پاشان یەکێکیان مرد ئەوەی ڕازی بووە میراتی ئەوە دەبات کە ڕازی نەبوو، بەڵام ئەوەیان کە ڕازی نەبوو میراتی ئەوی تریان ناگرێ" (رواه ابن أبی حاتم وابن جریر).

عبدالرزاق وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: من و

موعاویەیان بەناوبژیوان ڕەوانە کرد، موعەممەر وتی: پێمگەیشتووە کە عوسمان بەناوبژیوان ناردونی و پێی وتوون: ئەگەر ڕاتان وابوو بچنەوە لای یەك بیانخەنەوە لای یەك، ئەگەر بۆتان دەرکەوت کە ئەیانەوێ لەیەك جیا ببنەوە، لە یەکیان جیابکەنەوە.

ئیبنو جورەیج بۆی گێڕاینەوە کە عوقەیلی کوڕی ئەبی تالیب، فاتیمەی کچی عوتبەی کوڕی ڕەبیعەی مارە کرد، فاتیمە پێی وت: ئەبی بە ماڵی من و نەفەقەت ئەکێشم، جا هەر کاتێ دەچووە لای دەیوت: کوا عوتبەی کوڕی ڕەبیعە و شەیبەی کوڕی ڕەبیعە؟ ئەویش دەیوت: لای چەپتەوە لە ئاگردان کاتی چویتە ئاگرەوە، ئەویش جلەکانی لەبەرکرد و چوو بۆ لای عوسمان ئەوەی بۆ گێڕایەوە، عوسمان پێکەنی و ئیبنو عەباس و موعاویەی نارد، ئیبنو عەباس وتی: لە یەکیان جیا دەکەمەوە، موعاویە وتی: من لەوانە نیم دوو بەساڵاچووی بەنی عەبدومەناف لەیەك جیابکەمەوە، پاشان هاتن بۆ لایان سەیریان کرد دەرگایان لەسەر داخستوون، ئەوانیش گەڕانەوە.

موحەممەدی کوڕی سیرین لە عوبێدەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئامادە بووم لای عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) ژن و پیاوێك هاتن بۆ لای، لەگەڵ هەریەکەیان کۆمەڵێ خەڵکیان لەگەڵدا بوو، هەر کۆمەڵەیەکیان ناوبژیوانێکی دیاری کرد، عەلی بە هەردوو ناوبژیوانەکەی وت: ئەزانن چیتان لەسەر پێویستە؟ لەسەرتانە ئەگەر ڕاتان وابوو بچنەوە لای یەك با بچنەوە لای یەك، ژنەکە وتی: ڕازیم بە کتێبەکەی خوا و ئەوەی لەسەرمە، پیاوەکە وتی: من جیابوونەوەم ناوێ، عەلی وتی: درۆ دەکەی، لێرە ناڕۆی هەتا بە کتێبەکەی خوا ڕازی نەبیت و چیت لەسەرە.

زانایان کۆن لەسەر ئەوەی دوو ناوبژیوانەکە بۆیان هەیە یەکیان بخەنەوە یان لە یەك جیابکەنەوە، هەتا ئیبراهیمی نەخەعی وتوویەتی: ئەگەر هەردوو ناوبژیوانەکە بیانەوێ بە تەڵاقێك یان دوو تەڵاق یان سێ تەڵاق لە یەکیان جیا دەکاتەوە، ئەوەش وەرگیراوە لە فەرمایشتی خوای بەرز: ﴿إِن يُرِيدَآ إِصۡلَٰحٗا يُوَفِّقِ ٱللَّهُ بَيۡنَهُمَآۗ﴾، لێرەدا باسی لەیەك جیاکردنەوەی نەکردووە، بەڵام

ئەگەر ئەو دوانە کران بە وەکیل لەلایەن ژن و مێردەکەوە هەرچی حوکمێکیان دا جێبەجێ دەکرێت بۆ یەکخستنەوەیان بێت، یان جیاکردنەوەیان.

پێشەواکان جیاوازن لەسەر ئەوەی کە دوو ناوبژیوانەکە ئەبێ لە لایەن دادوەرەوە دابنرێن، حوکمی خۆیان بدەن با ژن و مێر دەکەش رازی نەبن، یان ئەو دوانە ئەبنە وەکیل لەلایەن ژن و مێردەکەوە؟ لەسەر دوو قەوڵە: جەماوەر لەسەر قەولی یەکەم بەپێی ئایەتی: ﴿فَٱبْعَثُواْ حَكَمًا مِّنْ أَهْلِهِۦ وَحَكَمًا مِّنْ أَهْلِهَآ﴾ وە ناویشی ناون ناوبژیوان، کاری ناوبژیوانیش ئەوەیە حوکمی خۆی بدات بەبێ رازی بوونی حوکم دراوەکە.

زانایان کۆن لەسەر ئەوەی ئەگەر ناوبژیوانەکان جیاوازی کەوتە نێوانیان، قسەی ئەوەی تریان کاری پێناکرێ، وە کۆن لەسەر ئەوەی کە قسەی هەردووکیان جێبەجێ ئەکرێ ئەگەر بۆ یەکخستنەوەیان بێت ئەگەر ژن و مێردەکە نەیانکردبنە وەکیل، وە زانایان جیاوازن دەربارەی ئەوەی کە ئایا قسەکەیان جێبەجێ ئەکرێت ئەگەر لەسەر جیاکردنەوەیان بێت، پاشان لە جەماوەرەوە دەگێرنەوە کە قسەکەیان جێبەجێ دەکرێ ئەگەر وەکیل نەبن.

﴿وَٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُواْ بِهِۦ شَيْـًٔا ۖ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا وَبِذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْيَتَٰمَىٰ وَٱلْمَسَٰكِينِ وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ وَٱبْنِ ٱلسَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَٰنُكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا ﴿٣٦﴾﴾

واتە: عەبدایەتی خوا بکەن و هیچ شت مەکەن بەشەریکی دەربارەی دایە و بابتان و خزمەکان و هەتیوان و هەژاران و هاوسێی دیوار بە دیوار و هاوسێی دوور و هەواڵی هەمیشەییتان، ئەوانەی لە رێدا ماون و ئەوانەی بوونەتە موڵکتان، تا دەتوانن چاکە بکەن، ئەو کەسانەی لوت بڵند و خۆپەسەندن خودا هیچ کامی خۆش ناوێن.

خوای گەورە فەرمان دەکات کە تەنها و بێ هاوبەش خۆی بپەرستن، چونکە هەر ئەو بەدیهێنەرو رۆزیدەری بەندەکانێتی لەهەموو کات و

بارودۆخێکدا، هەر ئەو شایستەی ئەوەیە کە بە تاك دابنرێ و هیچ لە دروستکراوەکانی نەکەنە هاوبەش وەك پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە موعازی کوڕی جەبەلی فەرمووە: "أتَدْرِي ما حَقُّ الله على العباد؟" قال: الله ورسوله أعلم. قال: "أن يَعْبدوه ولا يشركوا به شيئا"، پاشان فەرمووی: "أتَدْرى ما حَقُّ العبادِ عَلَى اللهِ إذا فَعَلُوا ذلك؟ ألا يعذبَهُم"، واتە: ئایا دەزانی مافی خوا چییە بەسەر بەندەکانییەوە؟ دەڵێ وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی دەزانن. فەرمووی: ئەوەیە کە بیپەرستن و هیچی نەکەنە هاوبەش، ئەڵێ: پاشان فەرمووی: ئەی دەزانی مافی بەندەکانی چییە بەسەر خواوە ئەگەر ئەوەیان کرد؟ ئەوەیە کە سزایان نەدات، پاشان ڕادەسپێرێت کە چاکە لەگەڵ دایك و باوکدا بکرێت، چونکە خوا ئەوانی کردووە بە هۆی دەرچوون لە نەبوونەوە بۆ بوون، وە زۆرجار خوای گەورە پەرستنی هاوشانی چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکدا دەکات وەك دەفەرموێت: ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ﴾ [لقمان: ١٤]، وە وەك: ﴿وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَٰنًا﴾ [الإسراء: ٢٣]. پاشان چاکە کردن لەگەڵیانا عەتف دەکات بەسەر چاکە کردن لەگەڵ خزم و کەس و کاردا لە پیاوان و ژنان وەك لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە: "الصَّدَقَةُ عَلَى المِسْكِينِ صَدَقَةٌ، وعَلَى ذِي الرَّحِم صَدَقَةٌ وصِلَةٌ"، صەدەقە کردن لەگەڵ هەژاراندا تەنها صەدەقە وە لەگەڵ خزمدا صەدەقە و گەیاندنی سیلەی ڕەحمە.

پاشان خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَٱلْيَتَٰمَىٰ﴾، چونکە ئەوان ئەوەیان لەدەستداوە کە هەڵدەستێ بە بەرژەوەندییان و ئەوانەی نەفەقەیان دەکێشن، خوای گەورە فەرمان دەکات بە چاکە کردن بەرامبەریان و بەزەییمان پێیاندا بێتەوە. پاشان دەفەرموێ: ﴿وَٱلْمَسَٰكِينِ﴾، ئەوانیش ئەوانەن کە پێویستییان هەیە، ئەوەندەیان نییە بەشیان بکات، خوای گەورە فەرمان دەدات بە یارمەتیی دانیان هەتا وایان لێ دێ بژین و پێویستییەکانیان نامێنێ.

وە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ وَٱلْجَارِ ٱلْجُنُبِ﴾ عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئبینو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە ﴿وَٱلْجَارِ ذِى ٱلْقُرْبَىٰ﴾ واتە: ئەو

دراوسێیەی لە نێوانتاندا و لەنێوان ئەودا خزمایەتی هەبێت، ﴿وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾ ئەو دراوسێیەی لە نێوانتاندا خزمایەتی نەبێت.

بەو شێوەیە لە عەکریمە و موجاهید و مەیمونی کوڕی میهران و زەحاك و زەیدی کوڕی ئەسلەم و موقاتیلی کوڕی حەیان و قەتادە دەگێڕنەوە.

ئەبو ئیسحاق لە نەوفییەکانەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ﴿وَٱلۡجَارِ ذِی ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ واتە: دراوسێی موسڵمان و ﴿وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾ دراوسێی جولەکە و گاور، وە لە عەلی و ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ﴿وَٱلۡجَارِ ذِی ٱلۡقُرۡبَىٰ﴾ واتە: ژن. وە موجاهید وتوویەتی: ﴿وَٱلۡجَارِ ٱلۡجُنُبِ﴾ هاوڕێی سەفەر.

دەربارەی چاکە کردن لەگەڵ دراوسێدا چەندەها فەرموودە هاتووە لەوانە:

فەرموودەی یەکەم: ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ما زال جبريل يوصيني بالجَارِ حَتى ظَنَنْتُ أنهُ سَيُوَرِثه" (أخرجاه في الصحيحين) واتە: بەردەوام جوبرائیل ڕای دەسپاردم بۆ چاکە کردن لەگەڵ دراوسێدا هەتا وام دەزانی ئەبێتە میراتگری.

فەرموودەی دووەم: ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ما زالَ جِبْرِيلُ يُوصِينِي بالجَارِ حتى ظننْتُ أنَّه سَيوَرثه".

فەرموودەی سێیەم: ئەحمەد وتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: "خَيْرُ الأصْحَابِ عِندَ اللهِ خَيْرُهُم لِصَاحِبِهِ، وخَيْرُ الجِيرانِ عند اللهِ خيرهم لِجَارِهِ". واتە: باشترین هاوەڵ لای خوا ئەوەیە کە چاکتر بێت بۆ هاوەڵەکەی وە چاکترین دراوسێ لای خوا چاکترینە بۆ دراوسێکەی.

فەرموودەی چوارەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عومەرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا يشبع الرجل دون جاره" واتە: نابێ پیاو خۆی تێر بێت و دراوسێیەکەی برسی.

فەرموودەی پێنجەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: میقدادی کوڕی ئەسوەد وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لأنْ يَزني الرَّجلُ بِعَشْرِ نِسْوَة، أيْسَرُ عليه من أن يزنيَ بامرَأةِ جَارِهِ". قال: ما تقولون في السَّرِقَة؟ قالوا: حَرَّمَهَا اللهُ وَرَسُولُهُ فهي حرام. قَالَ "لأن يَسْرِقَ الرجل مِن عَشْرَةِ أَبْيَاتٍ، أَيْسَرُ عَلَيْهِ مِنْ أَنْ يسرِقَ مِنْ جَارِهِ". واتە: پیاوێك لەگەڵ دە ژندا زینا بکات سوك تره لەوەی لەگەڵ ژنی دراوسێکەیدا زینا بکات، پاشان فەرمووی: ئێوە بە دزی کردن دەڵێن چی؟ وتیان خوا و پێغەمبەرەکەی حەرامیان کردووە، ئیتر حەرامە، فەرمووی: پیاوێك لە دە ماڵ دزی بکات سوکترە لەوەی لە ماڵی دراوسێکەی دزی بکات.

فەرموودەی شەشەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: پیاوێك لە ئەنصار ئەگێڕێتەوە دەڵێ: لە ماڵەوە دەرچووم بۆ گەیشتن بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، کە گەیشتمە لای بەپێوە وەستابوو، پیاوێك بەرەو ڕووی دەچوو، وامزانی کە پێویستییەکیان هەیە، ئەنصاریەکە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەندە بەپێوە وەستا گریانم بۆی دەهات، کاتێ کابرا ڕۆیشت وتم: ئەی نێردراوی خوا ئەوەندەی ڕاگرتی بەپێوە گریانم بۆت دەهات، فەرمووی: (بینیت)؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەزانی ئەوە کێ بوو؟ وتم: نەء، فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو "ذَاكَ جِبْرِيلُ، ما زال يُوصِينِي بِالجارِ حتى ظَنَنْتُ أَنَّه سَيُورِثُه." پاشان فەرمووی: ئەگەر تۆ سڵاوت لێ بکردایە وەڵامی دەدایتەوە.

فەرموودەی حەوتەم: عەبدی کوڕی حەمید لە مەسنەدەکەیدا دەگێڕێتەوە لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە وتوویەتی: پیاوێك لە عەوالیەوە هات، پێغەمبەر و جوبرائیل (سڵاوی خوای لێ بێت) نوێژیان دەکرد، وە چۆن نوێژ لەسەر جەنازە دەکرێ، کاتێ لێ بوونەوە پیاوەکە وتی: ئەی نێردراوی خوا ئەو پیاوە کێ بوو لەگەڵتا؟ فەرمووی: بۆ بینیت؟ وتم: بەڵێ، فەرمووی: خێرێکی زۆرت بینیوە، ئەو جوبرائیل بوو دەربارەی دراوسێ ڕای سپاردم، هەتا وامدەزانی کە دراوسێ میراتی دراوسێ دەگرێ.

فەرموودەی هەشتەم: ئەبو بەکری بەزار وتوویەتی: لە جابیری کوڕی

عەبدوڵڵاوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "الجِيرانُ ثَلاثَة: جَارٌ لهُ حَق وَاحِد، وَهُوَ أَدْنَى الجيرانِ حقا، وجار له حقَّان، وجَارٌ له ثلاثةُ حُقُوقٍ، وَهُوَ أفضلُ الجيرانِ حقا، فأما الذى له حق واحد فجار مُشْرِك لا رَحمَ لَهُ، لَهُ حق الجوار. وأمَّا الَّذِى لَهُ حقانِ فَجَارٌ مُسْلِمٌ، له حق الإسلام وحق الْجِوارِ، وأَمَّا الَّذِى لَهُ ثَلاثةُ حُقُوقٍ، فَجَارٌ مُسْلِمٌ ذُو رَحِم لَهُ حق الجوار وحق الإسلام وحَقُّ الرحِمِ". واتە: دراوسێ سێ جۆرە: دراوسێ هەیە یەك مافی هەیە کە کەمترین مافی هەیە لە نێوان دراوسێکاندا و دراوسێ هەیە دوو مافی هەیە و دراوسێ هەیە سێ مافی هەیە، کە چاکترین دراوسێیە بەراستی. ئەوەی یەك مافی هەیە دراوسێی هاوبەشدانەرە کە خزمایەتی نییە تەنها مافی دراوسێیەتی هەیە، بەڵام ئەوە دوو مافی هەیە دراوسێی مسوڵمانە کە مافی ئیسلامەتی و دراوسێیەتی هەیە، بەڵام ئەوەیان کە سێ مافی هەیە دراوسێی خزمی موسڵمانە کە مافی دراوسێیەتی و ئیسلامەتی و خزمایەتی هەیە.

فەرموودەی نۆیەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە تەڵحەی کوڕی عەبدوڵڵاوە هاتووە وتوویەتی: عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) پرسیاری کرد لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: من دوو دراوسێم هەیە دیاری بدەم بە کامیان؟ فەرمووی: ئەوەیان دەرگای ماڵەکەی نزیکترە لێتەوە (رواه البخاري من حديث شعبة).

فەرموودەی دەیەم: تەبەرانی و ئەبو نەعیم لە عەبدوڕەحمانەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەست نوێژی دەگرت خەڵك بە ئاوی دەست نوێژەکەی سەر و چاو و دەستیان دەسڕی، فەرمووی: چی پاڵی پێوە ناون ئەوە بکەن؟ وتیان: خۆش ویستنی خوا و پێغەمبەرەکەی، فەرمووی: "من سره أن يحب الله ورسوله فليصدق الحديث اذا حدث وليؤد الأمانة اذا ائتمن" واتە: کێ حەز دەکات خوا و پێغەمبەر خۆشیان بوێت با هەرچی قسەیەك دەکات ڕاست بکات، وە ئەگەر سپاردەیەکیان لا دانا بیداتەوە بە خاوەنەکەی.

فەرموودەی یانزەیەم: ئەحمەد وتوویەتی: قوتەیبە لە ئیبنو لەهیعەوە

بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ان أول الخصمين يوم القيامه جاران" واتە: ئەو دوو دژ بەیەکەی ڕۆژی قیامە یەکەم جار دەهێنرێنە پێشەوە دوو دراوسێن.

وە فەرمایشتی خوای بەرز: ﴿وَٱلصَّاحِبِ بِٱلْجَنۢبِ﴾ سەوری لە جابیری جوعفییەوە لە شەعبییەوە دەگێڕێتەوە کە عەلی ئیبنو مەسعود وتوویانە: ئەو ژنی پیاوە، ئیبنو عەباس و موجاهید و عەکریمە و قەتادە وتوویانە: هاوەڵی ڕێگایە، سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: هاوەڵی چاکە، زەیدی کوڕی ئەسلەم وتوویەتی: ئەو کەسەیە لەناو ئاوەدانیدا لەگەڵتا دادەنیشێ و هاوەڵتە لە سەفەردا.

﴿وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُكُمْ﴾ ڕاسپاردنە بەرامبەر بەندە و کۆیلەکان، چونکە بەندەی لاواز کۆیلەی دەستی خەڵکە، لەبەرئەوە چەسپاوە لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) کە لەسەرەمەرگدا دەیفەرموو: "الصلاة الصلاة وما ملكت أيمانكم" واتە: ئاگاداری نوێژەکانتان بن و ئاگاتان لەو بەندانە بێت لەژێر دەستانتاندان.

ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە کە مەعدی یەکروب وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ما أطعمت نَفْسَك فهو لك صدقةٌ، وما أطعمتَ وَلَدَكَ فهو لك صدقة، وما أطعمت زَوْجَتَكَ فهو لك صَدَقَةٌ، ومَا أطعَمْتَ خَادِمَكَ فهو لَك صَدَقَةٌ" (وإسناده صحيح). واتە: هەرچی خۆت و منداڵ و خێزان و خزمەتکارت بیخۆن لە ماڵەکەت بۆت ئەبێ بە خێر و سەدەقە. عەبدوڵڵای کوڕی عەمر بە قارەمانی وت: خواردنت داوە بە بەندەکان؟ وتی: نەء، وتی: ڕاکە خواردنیان بدەرێ، چونکە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "كفى بالمر و إثما أن يحبس عمن يملك قوتهم" رواه مسلم، واتە: ئەوەندە بەسە پیاو پێی تاوانبار بێت کە خواردن لە کۆیلەکانی بگرێتەوە.

وە لە ئبی هورەیرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إذا أتى أحدكم خادمه بطعامه، فإن لم يجلسه معه، فليناوله لقمةً أو لقمتين أو أَكْلَةً أو أَكْلَتين، فإنه وَلِيَ حَرّه وعلاجه" (أخرجاه ولفظه

للبخاري) واتە: کاتێ کەسێك لە ئێوە بەندەکەی خواردنەکەی بۆ دەهێنێ ئەگەر لەگەڵ خۆیدا داینەنیشێنێ بخوات با پارویەك یان دوو پاروی بداتێ.

لە ئەبی زەڕەوە هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هم إخوانكم خَوَلكم، جعلهم الله تحت أيديكم، فمن كان أخوه تحت يده فليطعمه مما يأكل، وليلبسه مما يلبس، ولا تكلفوهم ما يغلبهم، فإن كلفتموهم، فأعينوهم". (أخرجاه) واتە: ئەوانە براو هاوەڵی ئێوەن، خوا خستویەتییە ژێر دەستی ئێوە، جا هەر کەس براکەی کەوتە ژێر دەستی با چی دەخوات ئەوەش بدات بەو و خۆی چی لەبەر دەکات ئەوەش لەبەر ئەو بکات، وە لە توانایان بەدەر ئەرکیان مەدەن بەسەردا، ئەگەر ئەوەتان کرد یارمەتی بدەن.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالًا فَخُورًا﴾ واتە: شانازی بەخۆیەوە بکات و خۆی بە زل بزانێ و وابزانێ لە هەموو کەس چاکترە، ئەو کەسە لای خوا قێزەوونە و خەڵکیش چارەیان ناوێت.

موجاهید دەربارەی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخۡتَالًا فَخُورًا﴾ واتە: خۆی بە زل بزانێ، (فخورا) واتە: هەرچی بەخشی حسابی دەکات بێ ئەوە شوکری خوا بکات، واتە: شانازی بەسەر خەڵکەوە دەکات بەو نیعمەتەی خوا پێی بەخشیوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە شوکرانەی خوا دەکات لەسەر ئەوانە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: ئەبی رەجای هیرەوی وتوویەتی: کەسێك نابینی خوخراپ شانازی کار و خۆبەزلزان نەبێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا مَلَكَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ﴾ وە کەسێك نییە ئازاری دایك و باوکی بدات ستەمکار و چارەڕەش نەبێت وە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَتِي وَلَمۡ يَجۡعَلۡنِي جَبَّارًا شَقِيًّا﴾ [مريم: ٣٢].

ئیبنو ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوە لە موترەفەوە کە وتوویەتی: فەرموودەیەکم پێ گەیشت لە ئەبی زەڕەوە حەزم دەکرد چاوم پێی بکەوێ، پێیگەیشتم وتم: ئەی ئەبازەڕ پێمگەیشتووە تۆ وتووتە: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن الله يحب ثلاثة ويُبْغض ثلاثة"؟ خوا سێ جۆرە کەسی

خۆش دەوێت و ڕقی لە سێ جۆر کەسە؟ وتی: بەڵێ، هەرگیز بەبیرما نەهاتووە درۆ بەدەم خۆشەویستەکەمەوە بکەم، وتم: ئەو سیانە کامانەن خوا ڕقی لێیانە؟ وتی: (المختال الفخور) خۆبەزلزانی شانازیکەر بەخۆیەوە، ئەی لە کتێبەکەی خوا نەتانخوێندووەتەوە کە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالًا فَخُورًا﴾.

ئەبی تەمیمە لە پیاوێکی بەلهوجەیمەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: وتم: ئەی نێردراوی خوا ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: "إياك وإسبالَ الإزار، فإن إسبال الإزار من المَخِيلة، وإن الله لا يحب المَخِيلة"، واتە: هەرگیز ئیزارەکەت یان شەرواڵەکەت درێژ نەکەیت لە خوار قولەپێتەوە بێت، چونکە درێژکردنەوەی شەرواڵ لەخۆبەزلزانینە و خوایش ئەو کەسانەی خۆش ناوێکە خۆیان بە زل دەزانن.

﴿ٱلَّذِينَ يَبْخَلُونَ وَيَأْمُرُونَ ٱلنَّاسَ بِٱلْبُخْلِ وَيَكْتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضْلِهِۦ ۗ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿٣٧﴾ وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ وَلَا يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ ۗ وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا ﴿٣٨﴾ وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا ﴿٣٩﴾﴾

واتە: ئەو کەسانەی چکوسی دەکەنە پیشە و خەڵکیش بۆ ڕژدی هان دەدەن، ئەو بەشەی خودا پێی داون دەیشارنەوە، با بزانن ئێمە بۆ بێ نەزانان ئازاری ئابڕووبەرمان ئامادەیە. ئەو کەسانەش کە بۆ ڕووبینی لە مەردم ماڵی خۆ بەخت دەکەن و و باوەڕیشیان بە خودا و ڕۆژی قیامەت نییە و هاوەڵی شەیتان دەکەن، هەر کەسیش شەیتان یاری بێت خراپترین یاری هەیە، چییان لێ دەهات ئەمانە باوەڕیان با بە خوا و ڕۆژی دوایی بهێنایە ئەوسا لەو ماڵەی کە خودا بەشی داون بیانبەخشیبا؟ خوا بەکاروباری ئەوان باش دەزانێ.

خوای گەورە زەمی ئەوانە دەکا کە ڕژدی دەکەن ماڵەکانیان بەو شێوەیە

سەرف ناکەن کە خوا بۆی داناون لە چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك و چاکە کردن لەگەڵ خزم و کەس و هەتیوان و هەژاران و دراوسێی نزیك و دراوسێی دوور و ڕێبوار و ئەوانەی لە ژێر دەستان بە بەندەیی و مافی خودا نادەن لە ماڵەکانیاندا وە فەرمان دەکەن بە خەڵك ڕژدو دەس نوقاو بن، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "وأی دا و أدوأ من البخل؟" واتە: کام درم و درم ترینە لە ڕژدی و دەس نوقاوی، وە فەرموویەتی: "إياكم والشح، فإنه أهلك من كان قبلكم، أمرهم بالقطيعة فقطعوا، وأمرهم بالفجور ففجروا"، واتە: دوورکەونەوە لە ڕژدی و دەست نوقاوی، چونکە هەر ئەوە نەتەوەکانی پێش ئێوەی لەناوبردووە. هەر ئەوە فەرمانی خۆدابڕانی لە خەڵك پێ ئەکردن، ئەوانیش خۆیان دادەبڕی، وە فەرمانیان پێ دەکردن تاوان بکەن ئەیان کرد.

﴿وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ﴾ مرۆڤی دەست نوقاو ئینکاری نیعمەتەکانی خوا دەکات هیچی پێوە دیار نییە، نە لە خواردنیا، نە لە جلوبەرگیا، نە لە بەخشیندا، وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لِرَبِّهِۦ لَكَنُودٞ ٦ وَإِنَّهُۥ عَلَىٰ ذَٰلِكَ لَشَهِيدٞ ٧﴾ واتە: بە بارودۆخیاو بە کردەوەکانیدا ﴿وَإِنَّهُۥ لِحُبِّ ٱلۡخَيۡرِ لَشَدِيدٌ﴾ [العاديات: ٦ ـ ٨]. ئالێرەدا خوای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَيَكۡتُمُونَ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۗ﴾ ئەوە ئەشارنەوە کە خوا بە فەزڵی خۆی پێی داون، لەبەر ئەوە هەڕەشەیان لێدەکات دەفەرموێت: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾. بێ باوەڕی (الكفر) شاردنەوە و سەرپۆشە مرۆڤی ڕژدیش نیعمەتەکانی خودا دەشارنەوە و دایان دەپۆشن و ئینکاری لێ دەکەن، ئیتر ئەو کەسە بێ باوەڕە بە نیعمەتەکانی خوا کە پێی بەخشیوە.

لە فەرموودەدا هاتووە: "إن الله إذا أنعم نعمة على عبد أحب أن يَظْهَرَ أثرُها عليه" واتە: کاتێ خوا نیعمەتێك ئەبەخشێ بە بەندەیەکی حەز دەکات پێوەی دیار بێت.

وە لە نزاکانی پێغەمبەردا هاتووە: "واجعلنا شاكرين لنعمتك، مثنين بها عليك قابليها - ويروى: قائليها - وأتممها علينا" واتە: خوایە وامان لێ بکە

هەمیشە سوپاسگوزاری نیعمەتەکانت بین و ستایشت بکەین بەرامبەری و تۆش نیعمەتەکانمان بۆ تەواو بکە.

هەندێ لە پێشینەکان ئەم ئایەتەیان لەسەر بەخیلی جولەکە داناوە کە ئەو زانیارییانەیان ئەشاردەوە دەربارەی سیفەتەکانی موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) ئەیانزانی، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾ لە ڕواڵەتیشدا سیاقەکە دەربارەی بەخیلی کردنە لەماڵدا هەر چەندە بەخیلی بە زانستیش دەگرێتەوە، چونکە سیاقەکە داوای ماڵ بەخشین دەکات بە خزمان و لاوازەکان، هەروەها ئایەتەکەی دوای ئەو کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمۡوَٰلَهُمۡ رِئَآءَ ٱلنَّاسِ﴾ خوای گەورە باسی دەست نوقاوە زەمکراوەکان دەکات کە ڕژدەکانن، پاشان باسی ئەوانە دەکات کە ماڵ سەرف دەکەن بۆ سومعە و ریایی نەك لە ڕێی خوادا، وە لەو حەدیسەی باسی ئەو سیانە دەکات کە ئاگریان پێ خۆش دەکرێ و ئەوانیش: زانا و خەزاکارو ماڵ سەرفکارن بەریایی "خاوەن ماڵەکە دەڵێت: واز لە شتێك نەهێناوە تۆ حەزت کردبێ ماڵی بۆ ببەخشرێ بەخشیومە لە ڕێگای تۆدا، خوای گەورەش دەفەرموێت: درۆ دەکەیت، بەڵکو بەخشیوتە کە پێت بڵێن دڵ نەرمی، ئەوەش وترا، مەبەستی ئەوەیە پاداشتەکەت لە دونیادا وەرگرتووە، هەر ئەوەشت ویستووە بەو کارەت.

لە فەرموودەدا هاتووە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە عەددی کوڕی حاتەمی وتووە: باوکت شتێکی ویستووە پێی گەیشتووە.

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کاتی دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی جەدعان لێچیان پرسی ئایا ماڵ بەخشین و بەندە ئازادکردنەکانی سوودی پێ دەگەیەنێت؟ فەرمووی: نەء، چونکە ڕۆژێك لە ڕۆژان نەیوتووە خوایە لە ڕۆژی قیامەتدا لە تاوانەکانم ببورە.

لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ وَلَا بِٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِۗ﴾ واتە: بۆ ئەو کارە ناشیرینەیان و دوورکەوتنەوەیان لە بەرفەرمانی خوا لەسەر شێوەی ڕاستی، شەیتان پاڵی پێوە ناون، هەر ئەوە بووە ئەو ڕێیەی نیشان داون و بۆی ئاسان کردوون و شتە ناشیرینەکانی لا جوان کردوون،

لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكُنِ ٱلشَّيْطَٰنُ لَهُۥ قَرِينًا فَسَآءَ قَرِينًا﴾ هەر کەس شەیتان بێتە هاوەڵی هاوەڵێکی زۆر خراپی گرتووە.

پاشان خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَمَاذَا عَلَيْهِمْ لَوْ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ وَأَنفَقُوا۟ مِمَّا رَزَقَهُمُ ٱللَّهُ﴾. واتە: چی زیانی پێ دەگەیاندن ئەگەر باوەڕیان بە خوا بکردایە و ڕێگای ڕاستیان بگرتایە و پشتیان بکردایە ڕیایی و بەڕەو ئیخلاس بۆ خوا بچوونایە بە ئومێدی ئەو پاداشتەی بوونایە کە خوا پەیمانی داوە بیدات بەوانەی کاری چاکە دەکەن، وە لەو بڕێویەی خوا پێی داون بیانبەخشییایە لەو ڕووانەوە کە خوا پێی خۆشە و پێی ڕازییە، وە دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِهِمْ عَلِيمًا﴾ واتە: خوا ئاگادارە بە نیازە چاك و خراپەکانیان و زانایە بەوانەی شایستەی سەرخستنە، سەری دەخات و ڕێی نیشان دەدات، وە ئامادەی دەکات بۆ کاری چاکە و ڕازی دەبێت لێی. وە ئاگاداری ئەوانەیە شایستەی سەرشۆڕییە دەرکردنە لە ڕەحمەتی خوا وای لێ دەکات بەو شێوەیە دونیا و ئاخیرەتی لە دەست داوە، خوا پەنامان بدات لەوە.

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةً يُضَٰعِفْهَا وَيُؤْتِ مِن لَّدُنْهُ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍۭ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾ يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَعَصَوُا۟ ٱلرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ ٱلْأَرْضُ وَلَا يَكْتُمُونَ ٱللَّهَ حَدِيثًا ﴿٤٢﴾﴾

واتە: خوا بە سنگی مێرولەی زەردی وردیلەش ناهەقی لە هیچ کەس ناکا، بەڵام هەمبەر بە هەر چاکەیەکی بیکەن دوو ئەوەندە پاداشت دەداو سەرەڕای ئەو پاداشە دانەش خەڵاتی گرنگیان هەیە، دەبێ چۆن ئەگەر ئێمە لە هەر کۆمەڵێ هاوئایین یەکێکمان لێ هەڵبژارد کە ببنە شایەت لەسەریان، تۆشمان کردە شایەتێك لەسەر ئەمانە، ئەوێ ڕۆژێ ئەو کەسانەی لە ڕێی خوادا کلابوون و بە قسەی پێغەمبەریان نەکرد، حەزێ دەکەن ڕێکی ڕووکاری زەوی بان، ناشتوانن هیچ قسەیەك لە خوا بشارنەوە.

خوای گەورە هەواڵ دەدات کە ئەوەی مسقاڵە زەڕەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا ستەم لە دروستکراوەکانی ناکات، بەڵکو پاداشتی دەداتەوە و بۆی زیاد دەکات ئەگەر چاکەی هەبوو، وەك دەفەرموویّت: ﴿وَنَضَعُ ٱلۡمَوَٰزِينَ ٱلۡقِسۡطَ﴾ [الأنبياء: ٤٧]، وە خوای گەورە دەربارەی لوقمان هەواڵ دەدات کە وتوویەتی: ﴿يَٰبُنَيَّ إِنَّهَآ إِن تَكُ مِثۡقَالَ حَبَّةٖ مِّنۡ خَرۡدَلٖ فَتَكُن فِي صَخۡرَةٍ أَوۡ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَوۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ يَأۡتِ بِهَا ٱللَّهُۚ﴾ [لقمان: ١٦]، هەر خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿يَوۡمَئِذٖ يَصۡدُرُ ٱلنَّاسُ أَشۡتَاتٗا لِّيُرَوۡاْ أَعۡمَٰلَهُمۡ ٦ فَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٍ خَيۡرٗا يَرَهُۥ ٧ وَمَن يَعۡمَلۡ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ شَرّٗا يَرَهُۥ ٨﴾ [الزلزلة: ٦ ـ ٨].

لە هەردوو سازەواردا هاتووە لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە فەرموودەی شەفاعەتدا بەدرێژی فەرموویەتی: "خوای گەورە لە فریشتەکانی دەفەرموویّت: بگەڕێنەوە بۆ ناو دۆزەخ هەرکەستان بینی ئەوەندەی دەنکە خەردەلێك باوەڕ لە دڵیا بوو لە ئاگر دەری بهێنن"، پاشان ئەبو سەعید وتوویەتی: ئەگەر حەزدەکەم ئەم ئایەتە بخوێننەوە کە دەفەرموویّت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖ﴾.

لە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە هاتووە کە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود وتوویەتی: ڕۆژی دوایی بەندەیەك لەگەڵ کەنیزەکێك دێنن یەکێك لە نێوانیاندا بانگەواز دەکات دەڵێت ئەمە فلانی کوڕی فلانە کێ مافێکی بەسەریەوە هەیە با بێت مافەکەی لێوەربگرێتەوە، ژن حەز دەکات کە مافی هەبێت بەسەر باوك و دایك و برا و مێردەکەیەوە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿فَلَآ أَنسَابَ بَيۡنَهُمۡ يَوۡمَئِذٖ وَلَا يَتَسَآءَلُونَ﴾ [المؤمنون: ١٠١]، خوای گەورە لە مافەکانی خۆی خۆش دەبێت، بەڵام لە مافەکانی خەڵك هیچ خۆش نابێت ئەویش دەڵێت: دونیا کۆتایی هات لە کوێوە مافەکانیان بدەمەوە، ئەفەرموێ: لە کردەوە چاکەکانی هەڵگرن بیدەن بەوانەی مافیان بەسەریەوە هەیە هەر کەس بەپێی خۆی. ئەگەر ئەو کەسە دۆستی خوا بوو تۆزقاڵێك لە چاکەکانی جیادەکرێتەوە خوا بۆی چەند جارە دەکاتەوە هەتا پێی دەچێتە بەهەشت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا﴾، پاشان پێی دەوترێ بچۆرە بەهەشتەوە، بەڵام ئەگەر بەندەیەکی شەقی بوو فریشتەکە

دەڵێت: پەروەردگار چاکەکانی تەواوبوو، بەڵام خەڵکێکی زۆر ماوە داوای مافی خۆیان لێ دەکەن لێ دەکەن خودای گەورە دەفەرمووێ لە خراپەکانی ئەوانە هەڵبگرن بیخەنە سەر خراپەکانی پاشان چەکێکی بۆ بکەن بۆ ناو ئاگر.

ئیبنو ئەبی حاتیمە لە عەبدوڵلای کوری عومەرەوە دەگێرێتەوە وتویەتی ئەم ئایەتە: ﴿مَن جَآءَ بِٱلۡحَسَنَةِ فَلَهُۥ عَشۡرُ أَمۡثَالِهَاۖ﴾ [الأنعام: ١٦٠]. دەربارەی ئەعراب هاتۆتە خوارەوە. پیاوێك وتی ئەی عبدالرحمن چی بۆ کۆچ کەرانە؟ ئەو شتەی لەوە چاکترە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظۡلِمُ مِثۡقَالَ ذَرَّةٖۖ وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا ۝٤٠﴾.

ئەبو زورعە دەگێرێتەوە لە عەتای کوری دینار لە سەعیدی کوری جوبەیرەوە دەگێرێتەوە کە دەربارەی ئایەتی ﴿وَإِن تَكُ حَسَنَةٗ يُضَٰعِفۡهَا﴾ وتوویەتی: بەڵام هاوبەشدانەر ڕۆژێ قیامەت سزای لە سەر سووك دەکرێ، بەڵام هەرگیز ئاگر نایەتەدەر. ئەوەش کردۆتە بەڵگە کە عەباسی مامی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە پێغەمبەری وت: ئەبو تالیبی مامت پشتی گرتبوی و یارمەتی دەدایت ئایا هیچ سودی پێدەگەیەنێ؟ فەرمووی: بەڵێ لە تەنکاییەکی ئاگردایە، ئەگەر من نەبوومایە ئێستا لە بەشی ژێرەوەی ئاگردا دەبوو ئەبێ ئەوە تایبەت بێت بە ئەبو تالیبەوە بەبێ خوانەناسەکانی تر بە بەڵگەی ئەوەی ئەبو داوی طهیالیسی لە مەسنەدەکەیدا لە قەتادەوە دەگێرێتەوە کە ئەنەس وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمویەتی (إن الله لا يظلم المؤمن حسنة، يثاب عليها الرزق فی الدنيا ويُجْزَى بها فی الآخرة، وأما الكافر فيطعم بها فی الدنيا، فإذا كان يوم القيامة لم يكن له حسنة) واتە: خودای گەورە بە هیچ شێوەیەك ستەم لە باوەڕدار ناکات هەرچی چاکەیەك بکات لە دونیادا پاداشتی دەداتەوە بەوەی بژێوی دەداتێ و ڕۆژی قیامەتیش پاداشتی دەداتەوە بەڵام خوانەناس خوا بە چاکەکانی بژێوی پێ دەدات هەر تاوای لێ دێت ڕۆژی قیامەت چاکەی نامێنێ.

ئەبو هورەیرە و عەکریمە و سەعیدی کوری جوبەیر و قەتادە و زەحاك دەربارەی: ﴿يُضَٰعِفۡهَا وَيُؤۡتِ مِن لَّدُنۡهُ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ وتوویانە: ئەوە بەهەشتە خوا پێ دەبەخشێ داوای ڕازی بون و بەهەشت لە خودا دەکەین.

ئیمام ئەحمەد لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێمگەشتووە کە خوای بەرز بە چاکەیەکی بەندەی باوەڕدار هەزار هەزار چاکەی دەداتێ. ئەبی عوسمان گێڕەرەوەی حەدیسەکە وتی: وا ڕێککەوت چووم بۆ حەج و عومرە بە ئەبی هورەیرە گەشتم پێم وت: لە تۆوە فەرموودەیەکم پێگەشتووە کە وتووتە گوێبیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووم فەرموویەتی: (یجزی العبد بالحسنة الف الف حسنة)، واتە: بەندە بە چاکەیەکی خوا هەزار هەزار چاکەی دەداتێ، وتی: ئەی ئەبو عوسمان بۆچی لەوە سەرت سوڕدەمێنێ خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿مَّن ذَا ٱلَّذِي يُقۡرِضُ ٱللَّهَ قَرۡضًا حَسَنٗا فَيُضَٰعِفَهُۥ لَهُۥٓ أَضۡعَافٗا كَثِيرَةٗۚ وَٱللَّهُ يَقۡبِضُ وَيَبۡصُۜطُ وَإِلَيۡهِ تُرۡجَعُونَ ٢٤٥﴾ [البقرة: ٢٤٥]، وە دەفەرمووێ: ﴿فَمَا مَتَٰعُ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فِي ٱلۡأٓخِرَةِ إِلَّا قَلِيلٌ﴾ [التوبة: ٣٨]. بەوەی گیانی ئەبو هورەیرەی بەدەستە گوێبیستی پێغەمبەر بووم دەیفەرموو: "ان الله لیضاعف الحسنة الفی الف حسنة". خوای گەورە چاکەیەك دەکات بە دوو هەزار هەزار چاکە.

﴿فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ٤١﴾، خوای گەورە هەواڵی ناخۆشی ڕۆژی قیامەت دەدات ئەفەرمووێ ئەبێ کاروبار و بارودۆخی ڕۆژی قیامەت چۆن بێت کاتێ بۆ هەر کۆمەڵێك شایەتێك ئەهێنرێ، واتە پێغەمبەرەکان وەك خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَشۡرَقَتِ ٱلۡأَرۡضُ بِنُورِ رَبِّهَا وَوُضِعَ ٱلۡكِتَٰبُ وَجِاْيٓءَ بِٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلشُّهَدَآءِ﴾ [الزمر: ٦٩] هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَيَوۡمَ نَبۡعَثُ فِي كُلِّ أُمَّةٖ شَهِيدًا عَلَيۡهِم مِّنۡ أَنفُسِهِمۡۖ﴾ [النحل: ٨٩]، بوخاری وتوویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرمووم: قورئانم بۆ بخوێنە، وتم: ئەی نێردراوی خوا من بۆ تۆی بخوێنم کە بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوە؟ فەرمووی: بەڵێ من حەز دەکەم لە یەکێکی تر بیبیستم، ئەڵێ: منیش سورەتی "النساء"م بۆ خوێند هەتا گەیشتمە: ﴿فَكَيۡفَ إِذَا جِئۡنَا مِن كُلِّ أُمَّةِۭ بِشَهِيدٖ وَجِئۡنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ شَهِيدٗا ٤١﴾ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) گریا هەتا ڕیشی تەڕ بوو فەرمووی: "ئەی پەروەردگار ئەوە شایەت دەبم بەسەر ئەوانەوە کە لەگەڵیاندام ئەی چۆن شایەت بم بە سەر ئەوانەی کە نەم بینیون.

ئیبن و جەریر وتوویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: واتە "شهید علیهم ما دمت فیهم، فإذا توفیتنی کنت أنت الرقیب علیهم". واتە: لە ناویانم شایەتم بە سەریانەوە کاتێ گیانت کێشام خۆت چاودێری بەسەریانەوە، بەڵام ئەوەی ئەبو عەبدوڵڵای قرتوبی لە کتێبی "التذكرة"دا هێناویەتی لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە کە وتویەتی: ڕۆژ نییە بەیانی و ئێوارە کردەوەکانی نەتەوەکەی نیشانی پێغەمبەر نەدرێ هەر هەموویان بە ناوەکانیان و کردەوەکانیاندا ئەیانناسێتەوە. بەوە شایەتە بەسەریانەوە کە خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أُمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَىٰ هَٰؤُلَاءِ شَهِيدًا ﴿٤١﴾﴾ ئەوە بۆ ماوەیە و پچڕاندنی تێدایە، وە پیاوێك لە سەنەدەکەیدا هەیە نەناسراوە و ناوی نەهێنراوە، وەلە قسەی سەعیدی کوڕی موسەیبە بێ ئەوەی ڕەفعی بکات.

﴿يَوْمَئِذٍ يَوَدُّ الَّذِينَ كَفَرُوا وَعَصَوُا الرَّسُولَ لَوْ تُسَوَّىٰ بِهِمُ الْأَرْضُ﴾. واتـــە: زەوی لەت بوایە و ئەوانی هەڵوشیایە لەبەر ناخۆشی و توندی ڕۆژی قیامەت و ئەو سەرشۆڕی و ئابڕوچونەی بەسەر یانا دێت وەك: ﴿إِنَّا أَنذَرْنَاكُمْ عَذَابًا قَرِيبًا يَوْمَ يَنظُرُ الْمَرْءُ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ وَيَقُولُ الْكَافِرُ يَا لَيْتَنِي كُنتُ تُرَابًا ﴿٤٠﴾﴾ [النبأ: ٤٠].

کە دەفەرمووێ: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا﴾ ئەوە هەواڵێکە دەربارەیان کە دان بەوانەدا دەنێن کردوویانە بێ ئەوەی هیچ لە خوا بشارنەوە.

ئیبنو جەریر دەگێڕێتەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە کە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای ئیبنو عەباس پێی وت: بیستوومە خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ [الأنعام: ٢٣]. وەك لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا﴾. ئیبنو عەباس وتی: ئەوەی فەرموویەتی: ﴿وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ [الأنعام: ٢٣] کاتێ تاوانبارەکان دەبینن هەر کەس موسڵمان نەبوبێت ناچێتە بەهەشتەوە ئەڵێن با ئێمەش ئینکاری بکەین، بۆیە دەڵێن: ﴿وَاللَّهِ رَبِّنَا مَا كُنَّا مُشْرِكِينَ﴾ [الأنعام: ٢٣] خوای گەورەش دەممان مۆر دەکات دەست و قاچیان دێنێتە قسە ﴿وَلَا يَكْتُمُونَ اللَّهَ حَدِيثًا﴾..

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِى سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟ ۚ وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَـٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٤٣﴾﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان بەسەر خۆشی لە نوێژی نزیك مەبنەوە هەتا تێبگەن دەڵێن چی، بە لەش پیسی نوێژ مەکەن، مەگەر وەختێ ڕاگوزەربن تا کاتێ کە خۆتان دەشۆرن ئەگەر دنیابوو نەخۆش بوو یان ڕێبواربوون یان یەکێکیان لە سەر پێشاوێ هاتەوە یان توخنی ژنان دەکەوتن و دەست و بە ئاوڕانەگەشتن خۆڵێکی پاك دەستەکانتانی تەیەموم. خودا چاوپۆشی لێ دەکاو لێتان دەبورێ.

خوای بەرزی پیرۆز قەغەی دەکات بەندەکانی بە سەرخۆشی نوێژ بکەن لە باروودۆخێکدا کە نەزانن چی دەڵێن، وەنزیك بوونەوە لە شوێنی نوێژ کە مزگەوتە لە بڕوانە دەرێ بەبی ئەوەی بمێنێتەوە، ئەوەش پێش هەرام کردنی ئارەق بووە وەك ئەو حەدیسەی باسمان کرد لە سورەتی (البقرە) بەڵگەیە لەسەری لای فەرمایشی: ﴿يَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ﴾ [البقرة: ٢١٩] پێغەمبەر بۆ عومەری خوێندەوە عومەر وتی: خوایە دەربارەی عارەق ڕوون کردنەوەی تەواومان بۆ ڕەوانە بکە، کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە عومەر ئەو نزایەی کرد، ئیتر کاتێ نوێژکەرەکان عارەقیان نەدەخواردەوە کاتێ ئایەتی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾ وە دەفەرمووێت: ﴿فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ [المائدة: ٩٠ ـ ٩١]. عومەر وتی: وازمان هێنا وازمان هێنا، لە ڕیوایەتی ئیسرائیلدا لە ئەبی ئیسحاقەوە لە عەمری کوڕی شەرحەبیلەوە لە عومەرەوە دەربارەی بەسەرهاتی حەرام کردنی ئارەق هاتووە باسی ئەوەشی تێدایە ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە کە لە سورەتی "النساء"دا هاتووە دەفەرمووێ: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَقْرَبُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَـٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا۟ مَا تَقُولُونَ﴾ بانگ بێژی پێغەمبەر (درودی

خوای لێ بێت) کاتێ قامەتی دەکرد بۆ نوێژ ئەیوت سەرخۆشەکان نزیك نوێژ نەکەونەوە.

ئیبنو ئەبی حاتەم دەگێڕتەوە لە سەماکی کوڕی حەربەوە کە وتویەتی: گوێبیستی مەصعەبی کوڕی سەعد بووم قسەی بۆ سەعد دەکرد دەیوت دەربارەی من چوار ئایەت هاتوەتە خوارەوە پیاوێك لە ئەنصار خواردنێکی دروست کرد کۆمەڵێ خەڵکی لە ئەنصار و مهاجر کۆکردەوە. ئەڵێن تێرمان خوارد و تێرمان خواردەوە هەتا سەرخۆش بوون، پاشان دەستمان کرد بە خۆهەڵمان و شانازی کردن پیاوێك ئێسکی شەوێلگەی حوشتێرێکی بەرزکردەوە و لوتی سەعدی بریندار کرد ئەویش پێش حەرام کردنی ئارەق بوو، ئیتر ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾.

هۆیەکی تر لە ئیبنو ئەبی حاتەمەوە هاتووە لەعەلی ئەبی تالیبەوە کە وتوویەتی: عەبدوڕەحمان کوڕی عەوف خواردنێکی دروست کرد دەعوەتی کردین و تێرمان خوارد و تێرمان خواردەوە سەرخۆش بووین کاتی نوێژ هات فلانە کەسیان کردە ئیمام ئەویش ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ی خوێند ئەی وت: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ خوای گەورە ئایەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾.ی نارده خوارەوە.

ئیبنو جەریر دەگێڕێتەوە لە ئەبی عەبدوڕەحمان و عەلییەوە دەگێڕێتەوە: کە ئەو و عەبدوڕەحمان و پیاوێکی تر ئارەقیان خواردبۆوە، کاتی نوێژ هات، ئەویش ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ی خوێند تێکەڵ و پێکەڵی کرد، خوای گەورەش ئایەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ﴾. ی نارده خوارەوە.

هەر ئیبنو جەریر لە ئەبی عەبدوڕەحمانی سوللەمییەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: عەلی لەگەڵ چەند کەس لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە ماڵی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف کۆدەبنەوە خواردن دەخۆن و عارەقیان بۆ دەهێنن لێ دەخۆنەوە ئەویش: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ۝١﴾ پێش حەرام بوونی عارەق بووە کاتی نوێژ دێت عەلی دەبێتە ئیمامیان ئەویش

دەخوێنێ بەڵام وەك پێویست نایخوێنێ خوای گەورەش ئایەتی ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ﴾. دەنێرێتە خوارەوە.

عەوفی لە ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە کۆمەڵێك پیاو دەهاتن بۆ نوێژ بەسەرخۆشی پێش ئەوەی عارەق حەرام بکرێ خوای گەورە دەفەرمووێ ﴿لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ﴾..

زەحاك دەربارەی ئایەتەکە دەڵێت: مەبەست بێ ئاگای عارەق نییە، بەڵکو مەبەستی بێ ئاگایی خەوە.

بەڵام ئیبنو جەریر وتوویەتی: ڕاستی بێ ئاگای شەراب مەبەستە. وە وتوویەتی: قەدەغە کردنە کە بەوانە نەوتراوە کە بێ ئاگان و لە قسە تێناگەن، چونکە ئەوانە حوکمی شێتیان هەیە، بەڵکو بەوانە وتراوە کە سەرخۆش و لە قسە تێدەگەن. چەند کەسە لە ئوصوڵییەکان وتویانە: ئەو قسەیە بەرامبەر ئەوانە وتراوە کە لە قسە تێدەگەن نەك بەرامبەر سەرخۆشێك نازانێ چی پێدەوترێ، چونکە تێگەیشتن مەرجی تەکلیفە.

وەئەوەش هەڵدەگرێ کە مەبەستی لە نەخواردنەوەی عارەق بێت بە تەواوی، چونکە فەرمانیان پێکرابوو پێنج جار نوێژ بکەن لە شەو و ڕۆژێکدا، بەڵام کەسێك عارەق بخواتەوە ناتوانێ لە کاتی خۆیدا هیچ نوێژێك بەجێ بگەیەنن. لەسەر ئەوە وەك فەرمایشی خوایە دەفەرمووێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ﴾ [آل عمران: ١٠٢]، ئەوەش فەرمانە پێیان کە خۆ ئامادە بکەن بۆ مردن لەسەر ئیسلام و بەردەوام بوون لە سەر فەرمانی خوا لەبەر ئەوە.

﴿حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾ ئەوە چاکترین شتە دەربارەی ڕادەی ئەو سەرخۆشەی نازانێ چی دەڵێت، چونکە کەسێك عارەقی خواردبێتەوە خوێندنەوەکەی تێکەڵ و پێکەڵ دەکات و لێ تێناگات و مل کەچی تەواوی نابێت کاتی نوێژ کردنەکە.

ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە ئەنەسەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "اذا نعس احدكم وهو يصلى فلينصرف فليتم

حتى يعلم ما يقول" واتە: کاتێ یەکێ لە ئێوە خەو بیباتەوە کاتی نوێژەکەی باوازی لێ بهێنێ کاتێ نوێژەکەی تەواو بکات بزانێ چی دەڵێت.

﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾ ئیبنو ئەبی حاتم وتویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا﴾ واتە: مەچنە مزگەوتەوە بە لەشی پیسەوە مەگەر تەنها بەناویا بڕۆن دانەنیشن تێیدا.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئەبو صالحەوە لە لەیسەوە کە یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیب وتوویەتی: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ کۆمەڵێك لە ئەنصارییەکان دەرگای خانووەکانیان لەسەر مزگەوت بوو توشی لەش پیسی دەبوون ئاویان لانەبوو ئەچون ئاو بهێنن ڕێگای تریان نەبوو لە ناو مزگەوت بەولاوە خوا ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە، شایەتی بۆ قسەکەی یەزیدی کوڕی ئەبی حەبیب ئەوەیە کە لە سازەواری بوخاریدا چەسپاوە کە پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "سروا كل خوخة في المسجد الا خوخة أبي بكر" دەرگای خانووەکانی سەر مزگەوت دابخە، کە لە دەرگای خانووەکەی ئەبوبەکر، چونکە ئیزانی کە ئەبو بەکر دوای ئەو (درودی خوای لێ بێت) کاروباری موسڵمانان ئەگرێتە دەست لەبەر ئەوە فەرمانی دا ئەو دەرگایانەی لەسەر مزگەوتن دابخرێن جگە لە دەگاکەی ماڵی ئەبوبەکر، هەرکەس ڕیوایەتی کردبێ وتبێتی جگە لە دەرگاکەی عەلی وەك لە هەندێ نوسخەدا هاتووە هەڵەیە ڕاستی ئەوەیە کە لە سازەواردا چەسپاوە.

لە سەر ئەو ئایەتە زۆرێك لە پێشەواکان بە حەرامیان داناوە لەش پیس لە مزگەوتدا بمێنێتەوە بەوشێوەیە بێ نوێژ و زەیستان، بەڵام هەندێکیان ڕێ نادەن ئەو دوانەش بە ناویا تێپەڕن نەك پیسی بکەن، وەهەیانە وتویەتی: ئەگەر هەردووکیان ترسی پیس بوونە مزگەوتیان نەبوو دروستە پێیدا تێپەڕبن ئەگینا نەء.

لە سازەواری موسلیمدا چەسپاوە کە عائیشە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پێی وتم: ئەو سەرپۆشەی ناو مزگەوتم پێبدە، منیش وتم: من بێ نوێژم. فەرمووی: بێ نوێژیەکەت لە دەستدا نییە. وەلە ئەبی هورەیرەوە وەك ئەوە هاتووە. بەڵگەی ئەوی تێدایە کە دروستە بێ نوێژ بە مزگەوتدا تێپەڕێ زەیستانیش هەر ئەو واتایەی هەیە، ئیتر خوا دەزانێ.

ئەبو داود دەگێڕێتەوە لە عایشەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لیٚ بێت) فەرموویەتی: (اني لا أحل المسجد الحائض ولا جنب) واتە: من مزگەوت ڕەوا ناکەم بۆ بێ نوێژ و لەش پیس (کۆمەڵێك ئەم فەرمودەیان بەلاواز داناوە) ئەبو عیسا تیرمزی حەدیسێکی هێناوە ئەویش زەعیفە.

فەرمودەیەکی تر دەربارەی واتای ئایەتەکە: ئیبنو ئەبی حاتم وتوویەتی: لە عەلییەوە هاتووە دەربارەی: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ وتوویەتی: نابێ نزیك نوێژ بکەوێتەوە جگە لە ڕێبوار تووشی لەش پیسی بێت ئاوی دەست نەکەوێت نوێژ بکات هەتا ئاوی دەست دەکەوێت. شایەتی ئەو قسەیە ئەوەیە ئەحمەد و ئەهلی سونەن گێڕاویانەتەوە لە ئەبی زەڕەوە کە وتویەتی : پێغەمبەر (دروودی خوای لیٚ بێت) فەرموویەتی (الصعيد الطيب طهور مسلم) گڵ و خۆڵی خاوێن پاككەرەوەی موسڵمانە، ئەگەر دە ساڵیش ئاوی دەست نەکەوێت، ئەگەر ئاوت دەست نەکەوت خۆتی پێبشۆ ئەوە بۆ تۆ خێرترە. ئیبنو جەریر دوای ئەوەی ئەو دوو قسەیەی گێڕاوەتەوە وتوویەتی: یەکەمیان قسەی کەسێکە وتوویەتی: ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ واتە: بە ناو مزگەوتدا تێپەڕ بێت. ئەوەش حوکمی ڕێبواری ڕوونکردۆتەوە کاتێ ئاوی دەست نەکەوێت و لەشی پیس بوو لە فەرمایشی ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ بەوە ئاشکرا دەبێت کە ﴿وَلَا جُنُبًا إِلَّا عَابِرِي سَبِيلٍ﴾ ئەگەر مەبەستی پێی ڕێبوار بوایە لە دووبارەکردنەوەی زاراوەی ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ﴾ واتایەکی تێگەیشتووی نەدەبوو لە پێشەوە باسی حوکمی باسکردنی ئەوەی کراوە جا ئەگەر ئەوە بەو شێوە بێت واتای ئایەتەکە بەم شێوەیە دەبوو: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە نزیك مەکەونەوە لە مزگەوت بۆ نوێژ کردن تێیدا کاتێ سەرخۆش بوون هەتا بزانن چی دەڵێن، هەروەها لەشتان پیس بوو لێی نزیك مەکەونەوە هەتا خۆتان نەشۆرن مەگەر بە ڕێبواری. ئەوەش قسەی جەماوەر و ڕواڵەتە لە ئایەتەکە وەك ئەوەی خوای بەرز قەدەغەی کردوە نوێژ کردن لە سەر شێوەیەکی ناتەواو هەڵوەشاندنەوەی مەبەستەکەی و قەدەغەی کردوە چوونە شوێنی نوێژ لە سەر شێوەی ناتەواو ئەویش لەش پیسییە کە دوور خەرەوەیە لە نوێژ و شوێنەکەی. ئیتر خوا دەزانێ.

﴿حَتَّىٰ تَغْتَسِلُوا۟﴾ بەڵگەیە لەسەر ئەوەی سێ پێشەواکە بۆی چوون ئەبو حەنیفە و مالیك و شافیعی کە وتوویانە: حەرامە لەسەر لەش پیس مانەوە لە مزگەوتدا هەتا خۆی نەشوا یان تەیەموم نەکات کاتی نەبوونی ئاو.

ئیمام ئەحمەد بۆ ئەوە چووە هەر کاتێ کەسێك بە لەشی پیسی دەست نوێژی گرت دروستە مانەوەی لە مزگەوتدا.

بەپێی ئەوەی سەعیدی کوڕی مەنصور لە سونەنەکەیدا بە سەنەدی صەحیح گێڕاویەتییەوە کە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەیان کردوە کە وتوویەتی : عەتای کوڕی یەسار وتوویەتی: چەندەها پیاوم بینیوە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە لەشی پیسەوە لە مزگەوتدا دادەنیشتن تەنها دەست نوێژیان دەگرت وەك دەست نوێژ گرتن بۆ نوێژ (ئەمە ئیسنادەکەی لە سەر مەرجی موسلیم). ئیتر خوا دەزانێ.

﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ فَلَمْ تَجِدُوا۟ مَآءً فَتَيَمَّمُوا۟ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ واتە: ئەو نەخۆشییەی تەیەموم ڕەوا دەکات ئەوەیە لە بەکار هێنانی ئاودا ترس هەبێت کە ببێتە هۆی لە دەست چونی ئەندامێکی یان تێکدانی یان بێتە هۆی درێژ خایەنی نەخۆشییەکە و چاك بوونەوەی دوابکەوێ.

لە ناو زانایاندا هەیە ڕێ ئەدا بە تەیەموم کردن بەنەخۆشی یەتی بە پێی گشتێتی ئایەتەکە.

ئیبنو ئەبی حاتیم لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾ ، وتوویەتی: دەربارەی پیاوێکی ئەنصاری هاتۆتە خوارەوە کە نەخۆش بووە نەیتوانیوە هەڵسێ دەست نوێژ بگرێ خزمەت کاریشی نەبووە ئاوەکەی بداتە دەست. هاتووە بۆ لای پێغەمبەر(دروودی خوای لێ بێت) ئەوەی بۆ گێڕاوەتەوە خوای گەورەش ئەو ئایەتی ناردۆتە خوارەوە، ئەمە مورسەلە. سەفەریش زانراوە جیاوازی کورت و درێژ نییە.

﴿أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ﴾ (الغائط) شوێنێکی نزم و بێ ترسە لە زەوی بەو ناوەوە ناو نراوە کە کاری دەست بە ئاو گەیاندن تێدا ئەنجام دەدرێ کە ڕووداوی بچوکە، بەڵام فەرمایشی ﴿أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ بە "لمستم

ولامستم' دەخوێنرێتەوە زانایان جیاوازن لە واتای ئەوەدا بە دوو قەول، یەکەمیان: ئەوە کینایەتە بۆ جیماع کردن بەپێی فەرمانیشتی خوای بەرز: ﴿وَإِن طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ﴾ [البقرة: ٢٣٧]، هەروەها فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نَكَحْتُمُ الْمُؤْمِنَاتِ ثُمَّ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِن قَبْلِ أَن تَمَسُّوهُنَّ فَمَا لَكُمْ عَلَيْهِنَّ مِنْ عِدَّةٍ تَعْتَدُّونَهَا﴾ [الأحزاب: ٤٩]. ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی 'اولمستم النساء' وتوویەتی: ئەوە جیماعە، وە لە عەلی کوڕی کەعب و مەجاهید و تاووس و حەسەن عوبێدی کوڕی عومەیر و سەعیدی کوڕی جەریر و شەعبی قەتادە و موقاتیلی کوڕی حەیانەوە ئەوە دەگێڕنەوە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە وتوویەتی: باسی 'اللمس'یان کرد کۆمەڵێك لە مەوالییەکان وتیان: ئەوە جیماع نییە، وە کۆمەڵێك لە عەرەب وتیان: 'اللمس' جیماعە، وتوویەتی: چووم بۆ لای ئیبنو عەباس پێم وت کۆمەڵێك لە مەوالیەکان و عەرەبەکان تێکچوون لەسەر واتای 'اللمس' وتوویەتی: کۆمەڵی مەوالییەکان شکان، چونکە 'اللمس، المس، المباشرة' جیماعە، بەڵام خوا ئارەزووی خۆیەتی چۆن ناوی دەهێنێ.

بەڵام ئیبنو جەریر وتوویەتی: کۆمەڵێکە تر لە زانایان وتوویانە: خوای گەورە مەبەستی لە هەموو لێدانێك بە دەست یان بە شوێنێکی تر لە ئەندامەکانی لەسی مرۆڤ، ئەوانە لە هەر لێدانێك بە بەشەکانی لەشی مرۆڤ لە بەشێکی جەستەی مرۆڤێکی تر کە بەری بکەوێ بەڕووتی دەست نوێژ گرتنەوەیان پێویست کردووە. پاشان وتوویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە هاتووە وتوویەتی: 'اللمس' لە خوار جیماعەوەیە، وە وتوویەتی: ماچ کردن لە 'لمس'وەیە ئەبێ دەست نوێژی بۆ بگیرێتەوە وە تەبەرانی بە ئیسنادی خۆی لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پیاوێك ئەبێ دەست نوێژ بگرێتەوە کاتێ پێستی بەر لەشی ئافرەتێکی نامەحرەم بکەوێ و لە دەست لێدانییەوە و ماچ کردنییەوە. وە دەربارەی ئایەتی 'اولامستم النساء' دەیوت: ئەوە تێوە ژنە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: نافع دەگێڕێتەوە: کە ئیبنو عومەر بە ماچ کردن

دەست نوێژی ئەگرتەوە لە ئافرەت وە ڕای وابوو ماچ کردنی ئافرەت دەست نوێژ دەشکێنێ.

ئیبنو ئەبی حاتیم دەگێڕێتەوە کە سالیمی کوڕی عەبدوڵڵای کوڕی عومەر لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە دەی وت ماچ کردنی ژن و دەست لێدانی بە ڕووتی لە "الملامسه"وەیە جا هەر کەس ژنەکەی ماچ کرد یان بەدەستی دەستی لێدا ئەبێ دەست نوێژەکەی تازە بکاتەوە وە لە عومەری کوڕی خەتابەوە دەگێڕنەوە کە ژنی خۆی ماچ کردوە بێ ئەوەی دەست نوێژ تازەبکاتەوە نوێژی کردووە. لەوانەیە ئەوەی وتوویەتی دەربارەی تازە کرنەوەی دەست نوێژ لەبەر پەسەندی بووە. ووتن بە پێویست بوونی دەست نوێژ گرتنەوە لە "المس" قسەی شافیعی و هاوەڵەکانیەتی و لە مالیك و ئەوەی بەناوبانگ بێت لە ئەحمەدە. ئەوەی پاڵپشتی ئەو وتەیە وتوویەتی: ئەو وشەیە بە "لامستم"وە "لمستم" خوێنراوەتەوە وشەی "اللمس" لە شەرعدا بە دەست لێدان دەوترێ. خوای گەرە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ كِتَٰبًا فِى قِرْطَاسٍ فَلَمَسُوهُ بِأَيْدِيهِمْ﴾ [الأنعام: ٧] واتە: دەستان لێئەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە ماعیزی فەرموو: کاتێ دانی نا بە زینا کردنەکەیدا لەوانەیە ماچت کردبێ یان دەست لێدابێ، وە لە فەرموودەی سازدا هاتووە کە فەرموویەتی: "والید زناها اللمس" دەستیش زیناکردنەکەی دەست لێدانە وە عائیشە وتوویەتی: کەم ڕۆژ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نەگەڕابێ بە سەرمانەوە و ماچی نەکردبین وە دەستی لێنەدابین وە هەر لەوە ئەوەیە کە چەسپاوە لە هەردوو سازەواردا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نەهی کردوە لە "بیع الملامسه" بە دەست لێدان فرۆشتنی شت ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ لێدانی دەست لە سەر هەردوو تەفسیر کردنەکە وتوویانە: لە زماندا بە دەست لێدان دەوترێ و بە جیماعیش ئەحمەد دەگێڕێتەوە لە موعازەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: چی دەڵێن دەربارەی پیاوێك بگات بە ژنێك نەی ناسێ چی لەگەڵ ژنی خۆیدا دەیکات لەگەڵ ئەو ژنەشدا بیکات جگە لە جیماع دەڵێ: خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَىِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ

ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ذَٰلِكَ ذِكۡرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾ [هود: ١١٤]، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: دەست نوێژ بگرە پاشان نوێژ بکە موعاز ئەڵێت وتم: ئەی نێردراوی خوا ئەوە تایبەتە بەوەوە یان بۆ هەموو بڕوادارانە فەرمووی: (بۆ هەموو بڕوادارانە).

وتوویانە بۆیە فەرمانی پێکردووە دەست نوێژ بگرێ، چونکە دەستی داوە لە ژنەکەوە، بەڵام جیماعی لەگەڵدا نەکردووە پاشان لەوانەیە بۆیە فەرمانی بە دەست نوێژ گرتن کردووە بۆ ئەوەی نوێژ بکات و تەوبە بکات وەك لە پێشەوە لە حەدیسەکەی ئەبو بەکری صدیقدا هاتووە کە پێغەمبەر(دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ما من عبد يذنب ذنبا فيتوضأ ويصلي ركعتين إلا غفر الله له) بەندەیەك تاوانێك بکات، پاشان دەست نوێژ بگرێ و دوو ڕکات نوێژ بکات خوا لە تاوانەکەی ئەبورێ. ئەوەش لە سورەتی (آل عمران)دا باس کراوە لە ئایەتی: ﴿ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ﴾ [آل عمران: ١٣٥].

پاشان ئیبنو جەریر وتوویەتی: یەکەم وتە لەو وتەیە پێکاویەتی وتەی ئەوانەی دەڵێن: "او لمستم النساء" مەبەستی جیماعە بەپێی ئەو هەواڵە ڕاستەی لە پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) هاتووە کە یەکێ لە ژنەکانی ماچ کردووە پاشان بێ ئەوەی دەست نوێژ تازە بکاتەوە نوێژەکەی کردووە. وەك لە عمرەوە وتوویەتی: کە عائیشە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەست نوێژی دەگرت، پاشان ماچی دەکرد بێ ئەوەی دەست نوێژ بگرێتەوە نوێژەکەی دەکرد.

ئەبو کریب بۆی گێڕاینەوە لە وەکیعەوە لە ئەعمەشەوە لە حەبیبەوە لە عەروەوە لە عائیشەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) یەکێ لە ژنەکانی ماچ دەکرد بێ ئەوەی دەست نوێژ بگرێتەوە ئەچوو بۆ نوێژ. عەروە دەڵێت: وتم: ئەو ژنە تۆ نەبێت کێ بووە؟ ئەویش پێئەکەنی.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: ئیبراهیمە تەیمی لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر(دروودی خوای لێ بێت) ماچی دەکردم دوای دەست نوێژ گرتن پاشان دەست نوێژەکەی نوێ نەدەکردەوە.

ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوە: لە یەحیای کوڕی ئەبی کەسیرەوە لە ئوم و سەلەمەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە ڕۆژوو بووە ماچی کردووە ڕۆژوەکەی نەشکاندووەو دەست نوێژی نوێ نەکردۆتەوە.

خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ زۆر لە زانایان لەم ئایەتە ئەوەیان هەڵێنجاوە کە دروست نییە کەسێك ئاوی پێی نەبێ تەیەموم بکات هەتا هەوڵی بەست هێنانی ئاو نەدات، هەر کاتێ هەوڵی بە دەست هێنانی داو ئاوی دەست نەکەوت ئەو کاتە تەیەموم دەکات.

لە هەردوو سازەواردا هاتووە لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پیاوێکی بینی دورە پەرێز وەستا بوو لەگەڵ کۆمەڵەکەدا نوێژە نەدەکرد فەرمووی: فڵانە کەس چی وای لێکردووی لەگەڵ ئەوانەدا نوێژت نەکرد؟ ئایا تۆ موسڵمان نیت؟ کابرا وتی: بەڵێ موسڵمانم ئەی نێردراوی خوا، بەڵام تووشی جەنابەت بووم ئاویش نییە خۆمی پێی بشۆرم فەرمووی: خۆڵ بەکاربهێنە ئەوەت بەسە. لەبەر ئەوەی خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَلَمْ تَجِدُوا مَاءً فَتَيَمَّمُوا صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ "التيمم" لە زمانی عەرەبی مانای ڕووکردنە.

وشەی "الصعيد" هەموو ئەوانە دەگرێتەوە لەسەر زەوین، جا گڵ و خۆڵ و لم و دار و بەرد و ڕووەك دەگێرێتەوە. ئەوەش قسەی مالیکە. وتراوە: هەرچی لە ڕەگەزی گڵ بێت صەعیدی پێدەڵێن وەك عەرد و زەرنیخ و نورە. ئەوەش بۆچوونی ئەبی حەنیفەیە، وتراوەکە صەعید تەنها گڵ و خۆڵە ئەوەش بۆچوونی شافیعی و ئەحمەد و هاوەڵەکانیانە، بەڵگەشیان ئایەتی: ﴿فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا﴾ [الكهف: ٤٠]، واتە: خۆڵێکی لوسی خاوێن، وە بەبێ ئەوەی کە چەسپاوە لە سازەواری موسلیمدا کە حوزەیفەی کوڕی یەمان وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "فضلنا على الناس بثلاث: جعلت صفوفنا كصفوف الملائكة وجعلت لنا الارض كلها مسجد وجعلت تربستها لنا طهورا اذا لم نجوا الماء" وفي لفظ "وجعل ترابها لنا طهورا أذا لم نجد الماء" واتە: ئێمە بە سێ شت فەزڵمان دراوە بەسەر خەڵك: ڕیزەکانمان وەك ریزی فریشتەکانی لێکراوە، وە هەموو زەویمان بۆ کراوە بە

مزگەوت وە گڵ و خۆڵەکەیمان بۆ کراوە بە خاوێن کەرەوە کاتێ ئاومان دەست نەکەوت. وتوویانە خاوێنکردنەوەیان تایبەت کراوە بە گڵەوە ئەگەر شتێکی تر جێگەی بگرتایەوە باسی دەکرد وشەی (الطیب) لێرەدا وتراوە: حەڵاڵە، وە وتراوە ئەوەیە کە پیس نەبێت وەك ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتییەوە لە ئەبی زەڕەوە کە پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (الصعيدُ الطيِّبُ طَهُورُ المسلم، وإن لم يجد الماء عَشْرَ حِجَجٍ، فإذا وجده فَلْيُمِسَّه بَشَرته، فإن ذلك خير) قال الترمزي (حسن صحيح). واتە: گڵ و خۆڵێکی خاوێن پاککەرەوەی موسڵمانەی ئەگەر دەساڵیش ئاوی دەست نەکەوێت کاتێ ئاوی دەست کەوت بیکات بە خۆیدا ئەوە بۆی خێر ترە.

وەئیبنو عەباس فەرموویەتی: خاوێن تریش شتی سەر زەوی گڵی زەوی کێڵراوە. (رواه ابن ابی حاتم ورفعه ابن مردويه فی تفسيره).

﴿فَٱمۡسَحُواْ بِوُجُوهِكُمۡ وَأَيۡدِيكُمۡۗ﴾ تەیەموم لە جیاتی دەست نوێژە بۆ خۆ پاککردنەوە بە گڵ و خۆڵ، نەك جێی ئاو بگرێتەوە بۆ هەموو پارچەکانی لەش، بەڵکو تەنها دەست هێنانە پێی بە سەر و چاو و دەستەکاندا بەڕای هەموو زانایان، بەڵام پێشەواکان ناڕێکن لە سەر چۆنیەتی تەیەموم کردن لە سەر چەند وتە: یەکەمیان بۆچوونی شافیعییە لە قەولی تازەیدا: ئەویش ئەوە کە ئەبێ ڕووخسار و هەردوو دەست مەسح بکرێت هەتا ئانیشك بە دوو جار دەست دان بە زەویدا، چونکە زاراوەی هەردوو دەست بە ڕاست گێڕانی ڕەها کردنیان تا ئەگاتە هەر دوو شان، وە لە سەر ئەوەش هەتا دەگاتە هەردوو ئانیشك وەك لە ئایەتی دەست نوێژدا هاتووە، وە ڕەها دەکرێت مەبەست پێیان هەتا دەگاتە هەردوو دەست وەك لە ئایەتی باسی دزی کرندا هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا﴾ [المائدة: ٣٨]، وە هەڵگیراوە لە سەر ئەوەی بە ئایەتی دەست نوێژ، وە لە پێش ترە لەبەر ئەوەی لە خۆگری هەموو خاوێنکەرەوەکانەوە بەستنەوەی قسیەکی لە زانایان باسی ئەوەی کردووە کە دارەقوتنی لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر فەرموویەتی: "التيمم ضربتان: ضربة للوجه، وضربة لليدين إلى المرفقين". (بەڵام صەحیح نییە ئەم فەرموودەیە، چونکە چەند زەعیف هەیە لە سەنەدەکەیدا)

واتە: تەیەموم دوو جار دەست دانە بەگڵ و خۆڵدا دەست دانێك بە زەویدا بۆ دەم و چاو و دەست دانێك بە زەویدا بۆ هەردوو دەست هەتا ئانیشکەکان.

ئیبنو داود لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر دەستی کێشا بە دیوارێکدا هێنا بە دەم و چاویدا و پاشان جارێکی تر دەستی کێشا بەدیوارەکەدا و هەردوو قۆڵێ پێ سڕی (بەڵام لە ئیسنادەکەیدا موحەممەدی کوڕی سابتی عەبدی هیە کە هەندێ لە فەرموودە زانەکان بە لاوازیان داناوە).

وە لە ئەعرەجەوە هاتووە کە ئیبنو صومە وتوویەتی: (پێغەمبەر تەیەمومی دەکرد دەستی هێنا بە ڕوخساریدا و هەردوو قۆڵی).

ئیبنو جەریر وتوویەتی: ئەعرەج لە ئەبی جوهمەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) میزی دەکرد، منیش سڵاوم لێکرد، وەڵامی نەدامەوە هەتا لێبووەوە، پاشان چوو بۆ لای دیوارێك هەردوو دەستی کێشا بە دیوارەکەدا دەستی هێنا بە ڕوخساریدا و پاشان جارێکی تر دەستی پێداکێشا و هەردوو دەستی هەتا ئانیشکی پێ سڕی، پاشان وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە.

قسەی دووەم: پێویستە روخسار و هەردوو دەست هەتا مەچەك مەسح بکرێت ئەوەش قسەی شافیعییە لە قەولی کرنیدا.

سێیەم: تەنها هێنان بە سەر روخسار و هەردوو دەستدا هەتا مەچەك بەسە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: عبدالرحمن کوڕی ئەبزی لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە لای عومەر وتی: تووشی لەش پیسی هاتووم ئاوم دەست ناکەوێت خۆمی پێ بشۆرم عومەر وتی: نوێژ مەکە، عەممار وتی: ئەی پێشەوای باوەڕداران نایەتەوە بیرت کە من و تۆ لە سریەیەکدا بووین تووشی لەش پیسی بووین ئاویشمان دەست نەکەوت، ئەوە بۆ تۆ نوێژت نەکرد، بەڵام من خۆم هەڵکێشا لە خۆڵ و نوێژەکەم کرد کاتێ هاتینەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەمان بۆ گێڕایەوە ئەویش فەرمووی: (إنما كان يكفيك وضرب النبى بيده الارض ثم نفخ فيها ومسح بها وجهه وكفيه) واتە: دەست کێشان بە زەویدا و پاشان فوپێداکرن و ڕوخسار و هەردوو دەستی هەتا مەچەك.

ڕێگایەکی تر ئەحمەد وتوویەتی: ئەبو موسا بە عەبدوڵڵای وتووە: ئەگەر ئاوی دەست نەکەوت ئەبێ نوێژ نەکات؟ عەبدوڵڵا وتی: نەء. ئەبو موسا وتی: ئەی لەبیرت نایەت عەمار بە عومەری وت: ئەی لە بیرت نایەت کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) من و تۆی نارد بۆ وشتر لەوەڕاندن تووشی لەش پیسی هاتم چوو خۆم هەڵکێشا لە خۆڵ کاتێ گەڕامەوە بۆ پێغەمبەرم گێڕایەوە. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێکەنی و فەرمووی: ئەوەت بەس بوو دەست بکێشی بە زەویدا و هەردوو دەستی هەتا مەچەك سڕی و ڕوخساری سڕی بە یەك دەست دان بە زەویدا. عەبدوڵڵا وتی: بێگومان باوەڕناکەم عومەر بەوە قەناعەت بکات، ئەبو موسا پێی وت: ئەی چی دەکات لە ئایەتی: ﴿فَلَمۡ تَجِدُواْ مَآءٗ فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدٗا طَيِّبٗا﴾ ئەڵێ: عەبدوڵڵا نەیزانی چی بڵێ، وە وتوویەتی: ئەگەر ڕێمان پێ بدرێ تەیەموم بکەین خەرێکە کاتێ ئاوی سارد یەکێ لە ئێوە تووشی نەخۆشی بکات ئەبێ تەیەموم بکات.

خوای گەورە لە ئایەتی سورەتی (المائدة)دا فەرموویەتی: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾ شافیعی ئەوەی کردووەتە بەڵگە کە ئەبێ هەر تەیەموم بکرێ بە خۆڵێکی خاوێن کە تۆزی هەبێ بچێت لە سەر ڕوخسارییەوە و لە هەردوو دەستیەوە. وەك شافیعی لە ئیسنادەکەی پێشوو لە ئیبنو صومەوە دەگێڕێتەوە کە بە لای پێغەمبەر(دروودی خوای لێ بێت) تێپەڕی میز دەکات سڵاوی لێدەکات وەڵامی نەداتەوە هەتا هەڵنەسا چو بۆ لای دیوارێکەوە بە دارودەستەکەی دیوارەکەی ڕوشاند و دەستی پێدا کێشا، پاشان ڕوخسار و هەردوو قۆڵی پێ سری وەکە دەفەرمووێ: ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجۡعَلَ عَلَيۡكُم مِّنۡ حَرَجٖ﴾ واتە دەربارەی ئەو ەستانەی خوا پی داون ﴿وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمۡ﴾ لە بەر ئەوە تەیەمومی بۆ ڕەوا کردون کاتێ ئاوتان دەست نەکەوت، بە صەعید تەیەموم بکەن ﴿وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ﴾ [المائدة: ٦]، لە بەرئەوە نەتەوەکە تایبەت کراوە بە مەشروعی تەیەموم بێ ئەوەی نەتەوەکانی تر ئەو تایبەتمەندییەیان هەبێت وەك چەسپاوە لە هەردوو سازەواردا لە جابیری کوری عەبدوڵڵاوە وتوویەتی: پێغەمبەر(دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (أُعْطِيتُ خمسًا لم يُعْطَهُنَّ أحدٌ قبلي، نُصِرتُ بالرُّعب مسيرة

شهر، وجُعِلَت لي الأرض مسجدًا وطهورًا، فأيُّما رجل من أمتي أدركته الصلاة فَليُصَلِّ) لە زاراوەیەکی تردا هاتووە فەرمویەتی: (فعنده طَهُوره ومَسْجِدُه ـ وأُحِلّت لي الغنائم ولم تَحِلَّ لأحد قبلي، وأُعْطِيتُ الشفاعة، وكان النبي يُبْعَثُ إلى قومه وبُعِثْتُ إلى الناس عامَّةً) واتە: پێنج شتم پێ بەخشراوە بە کەسی تر نەبەخشراوە پێش من، مانگە ڕێگایەك بە سەر دوژمنداریدا سەر ئەخرێنم هەر بە ترس کە دەچێتە دڵیانەوە وە زەویم بۆ کراوە بە مزگەوت و خاوێن کەرەوە. هەر کەسێك لە نەتەوەکەم کاتی نوێژی بەسەردا هات با نوێژەکەی بکات، لە زاراوەیەکی تردا هاتووە هەر کەس لە نەتەوەکەم کاتی نوێژی بەسەردا هات خاوێن کەرەوەکە بۆ مزگەوتەکەی لە بەر دەستیایەتی وە دەست کەوتی جەنگم بۆ ڕەواکراوە کە بۆ کەسی تر پێش من ڕەوا نەکراوە وە شەفاعەتم پێی بەخشراوە، هەر پێغەمبەرە بۆ سەرکەوتنەکەی خۆی نێردراوە من بۆ سەر هەموو خەڵك بەگشتی. وە لە پێشەوە لە حەدیسەکەی حوزەیفە لای موسلیم هاتووە کە ئەفەرمووێ: (فُضِّلنا على الناس بثلاث، جُعِلت صفوفنا كصفوف الملائكة، وجُعِلَت لنا الأرض مسجدًا، وتُربتُها طهورًا إذا لم نجد الماء).

﴿فَٱمْسَحُوا۟ بِوُجُوهِكُمْ وَأَيْدِيكُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾ واتە: لەوانەی لێتان بورراوە ئەوەیە کە تەیەمومی بۆ داناون وە کردنی نوێژی پێ ڕەوا کردووە کاتێ ئاوتان دەست نەکەوت، چونکە ئەم ئایەتە پیرۆزە بە خاوێن کردنی نوێژی تێدایە کە بە شێوەیەکی ناتەواو بکرێ لە سەر خۆشی هەتا کەسەکە هۆشی بێتەوە بە خۆیدا وە بزانێ چی دەڵێت، یان کە تووشی لەش پیسی بوو هەتا خۆی نەشوات یان ڕووداوی بچوکی بە سەردا هات هەتا دەست نوێژ نوێ نەکاتەوە مەگەر نەخۆش بێت یان ئاوی دەست نەکەوێت خوای گەورە ڕێ پێداوە کە تەیەموم بکات ئەو بارودۆخەش ڕەحمەتێکە بە بەندەکانی دەکات سوپاس و ستایش هەر بۆ خودایە.

## باسی هۆی هاتنە خوارەوەی دانانی تەیەموم:

ئێمە لێرەدا بۆیە باسی ئەوە دەکەین، چونکە ئەم ئایەتەی سورەتی

(النساء) پێش هاتنە خوارەوەی ئایەتەکەی سورەتی (المائدە)یە، وە ئەم ئایەتەش پێش حەرام کردنی عارەق هاتۆتە خوارەوە، چونکە عارەق بە ماوەیەکی کەم دوایی جەنگی ئوحود هاتۆتە خوارەوە وە وتراوە: لە کاتی چوار دەور گیرانی بەنی نەچیر بووە لەلایەن پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، بەڵام سورەتی (المائیدة) لەو سورەتانەیە کە هاتنە خوارەوەی دواخراوە بەتایبەتی سەرەتاکەی، لەبەر ئەوە گەنجاوە کە هۆکەی لێرەدا باس بکرێ.

ئیمام ئەحمەد وتویەتی: لە عائیشەوە هاتووە کە لە ئەسماوە ملوانکەیەك بە ئەمانەت وەردەگرێ، بەڵام ملوانکەکە لە ملیا دەپچڕێ، پێغەمبەر چەند کەس دەنێرێ بۆ ئەوەی دەنکەکانی بدۆزنەوە ئەوانیش ئەی دۆزنەوە هەتا دەیدۆزنەوە کاتی نوێژ دێت بەسەریانا و ئاویان پێنابێت بە بێ دەست نوێژ نوێژەکەیان دەکەن، لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) باسی حاڵی خۆیان کرد، خوای گەورەش ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوە، ئەسیدی کوڕی خوزەیر بە عائیشەی وت: خوا پاداشتی خێرت بداتەوە، سوێند بە خوا تووشی هەر شتێك بین کە لاتان ناخۆش بێت خوا دەیکات بە خێر بۆ خۆت و بۆ موسڵمانان.

ڕێگایەکی تر: بوخاری وتوویەتی: عائیشە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) بە سەفەرێك چووم هەتا گەیشتینە بیابانێك ملوانکەیەکم لە ملدا بوو پچڕا، پێغەمبەر لەو شوێنەدا مایەوە بۆ ئەوەی بیدۆزنەوە، وە خەڵکەکەش لەگەڵیا مانەوە نە لە سەر ئاو مابونەوە نە ئاویان پێ بوو خەڵکەکە هاتن بۆ لای ئەبو بەکر وتیان: نایبینی عائیشە چی کردووە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) و خەڵکەکەی ڕاگرتووە لە شوێنێکدا نە ئاوی لێیە نە خۆشیان ئاویان پێیە؟ عائیشە وتی: لەو کاتەدا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) سەری لەسەر ڕانم بوو خەوی لێکەتبوو. ئەبو بەکر هات و وتی: خەڵکەکەت گیرداوە لەگەڵ پێغەمبەردا نە شوێنەکە ئاوی لێیە نە خۆشیان ئاویان پێیە، عائیشە وتوویەتی: ئەبو بەکر سەرزەنشتی دەکردم هەرچی خواییەی هات بە دەمیا و بە پەنجە دەیژەن بە پەراسووم منیش لە بەر پێغەمبەر نەدەجوڵامەوە، چونکە

سەر لە سەر ڕانم بوو کاتێ ڕۆژمان کردەوە ئاومان پێ نەبوو، ئیتر خوا ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوە، ئیتر تەیەمومیان کرد ئوسەیدی کوڕی خوزەیر وتی: ئەمە یەکەم بەرەکەتی ئێوە نییە ئەی ئالی ئەبوبەکر، ئەو وشترەمان هەڵسان کە من سواری بوو بووم سەیرمان کرد ملوانکەکە لە ژێریا بوو.

فەرموودەیەکی تر ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عەمماری کوڕی یاسرەوە هاتووە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە شوێنێکدا مایەوە ناوی (ذات الجیش) بوو، عائیشەی خێزانیشی لەگەڵی دابوو. ملوانکەیەکی لە ملدابوو پچڕا، خەڵکەکە مانەوە لە بەر ملوانکەکەی هەتا ڕۆژ بووە، بەڵام خەڵکەکە ئاویان پێنەبوو، خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی ناردە خوارەوە ڕێ پێدان بە گڵ دەست نوێژ بگرن. موسڵمانەکان لەگەڵ پێغەمبەردا هەڵسان دەستیان کێشا بە زەویدا و پاشان دەستیان بەرز کردەوە هیچ گڵی پێوە نەبوو، پاشان دەستیان هێنا بە سەروچاویا وە بە دەستیاندا هەتا شانیان وە لە ناو لەپی دەستیانەوە هەتا بن باڵیان.

ئیبنو جەریر دەگێڕێتەوە لە ئەبی یەقظانەوە کە وتویەتی: لەگەڵ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بوین ملوانکەکەی عائیشە ون بوون، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) مایەوە لەو شوێنەدا هەتا ڕۆژ بووەوە، ئەبو بەکر توڕە بوو لە عائیشە ئیتر ڕێ پێدان بۆ بەکارهێنانی گڵ و خۆڵی خاوێن هاتە خوارەوە، ئەبو بەکر هات بۆ لای عائیشە و پێی وت: تۆ موبارەکیت دەربارەی تۆ ئەوە هاتە خوارەوە. ئیتر دەستان کێشا بە زەویدا یەکجار بۆ ڕوخسارمان وە جارێکی تر بۆ هەردوو دەستمان هەتا شان و بن باڵمان.

فەرموودەیەکی دیکە: ئەبو بەکری کوڕی مەردویە وتوویەتی: لە ئەسلەعی کوڕی شورەیکەوە هاتووە وتوویەتی: من وشترم بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئامادە دەکرد لە سەفەردا توشی لەش پیسی هاتم لە شەوێکی زۆر ساردا. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ویستی بار بکات منیش لام ناخۆش بوو وشترەکەی پێغەمبەر ئامادە بکەم بە لەشی پیسەوە وە ترسام ئەگەر بە ئاوی ساردیش خۆم بشۆم ئەمرم یان نەخۆش ئەکەوم. بە چەند پیاوێکی ئەنصاریم وتم: وشترەکەیان بۆ ئامادە کرد پاشان چەند بەردم گەرم کرد و

ئاوم پێی گەرم کرد و خۆمم شۆری پاشان گەشتم بە پێغەمبەر هاوەڵەکانی. پێغەمبەر فەرمووی: چی بوو کە ئامادەکردنی وشترەکە گۆڕاوە. وتم: ئەی نێردراوی خوا من ئامادەم نەکردوە، بەڵکو پیاوێکی ئەنصاری ئامادەی کردووە فەرمووی: بۆچی؟ وتم: من توشی جەنابەت بووم ترسام تووشی تاوان ببم ئەگەر ئامادەی بکەم بە لەشی پیسەوە. دوای خۆم بەردم ڕیز کردوو ئاوم گەرم کروو خۆم شۆری. ئیتر خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە .﴿لَا تَقْرَبُوا الصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُوا مَا تَقُولُونَ﴾ هــــەتــــا: ﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا غَفُورًا﴾.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ أُوتُوا نَصِيبًا مِّنَ الْكِتَٰبِ يَشْتَرُونَ الضَّلَٰلَةَ وَيُرِيدُونَ أَن تَضِلُّوا السَّبِيلَ ﴿٤٤﴾ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِأَعْدَائِكُمْ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ وَلِيًّا وَكَفَىٰ بِاللَّهِ نَصِيرًا ﴿٤٥﴾ مِّنَ الَّذِينَ هَادُوا يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ وَيَقُولُونَ سَمِعْنَا وَعَصَيْنَا وَاسْمَعْ غَيْرَ مُسْمَعٍ وَرَٰعِنَا لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِى الدِّينِ وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٤٦﴾﴾

واتە: ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە کە بەشێك لە کتێبی خودایان پێدراوە چۆن ڕێ لە خۆیان هەڵە دەکەن دەشیانەوێ ئێوەش لە ڕێگە لا بدەن. خودا دوژمنانی ئێوە لە خۆتان باشتر دەناسێ. ئێوە هەر خوا یاریدەدەرتان بێ بەسە. هێندێ کەس لە جولەکەکان وتاری خودا دەگۆڕن و قسەی تری دەخەنە جێ. بە تۆش دەڵێن بیستمان و گوێمان نەدا، تۆش ببیسە دەك قەت گوێت لە ئێمە نەبێ. زمانیان دەلا لچ دەگرن و تانە لە دینت دەدەن و بە تەشەر ئەڵێن (راعنا) ئەگەر ئەمان بیانگوتایە: بیستمان و بە قسەی دەکەین و لێمان بیستی و دەبێ چاوێکت لێمان بێ. بۆیان چاکتر و ڕاستر بوو، بەڵام خودا لە سەر ئەو ڕێ گۆڕینەیان نەفرینی خۆی لێکردوون و لەوانە کەمێکیان نەبێ نایانەوێ بروابێنن.

خوای گەورە دەربارەی جولەکە هەواڵمان دەداتێ کە ئەوان گومڕایی بە

ڕێنمایی دەكرن پشت دەكەنە ئەوەی كە خوا ناردویەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەرەكەی، وە واز لە وانە دێنن كە بە دەستیانەوەیە لە زانستی لە پێغەمبەرانی پێشوو دەربارەی پێغەمبەر موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) بۆ ئەوەی شتێكی كەمی پێبكڕن لە كەلوپەلی پوكاوی دونیا "ویریدون ان تظلوا السبیل" واتە: بە ئومێدی ئەوەن كە ئێوە بێباوەڕ بن بەوانەی خودا ناردوویەتی بۆ تان وە پشت بكەنە ئەوانەی كە ئێوە لە سەرینی لە ڕێنمایی زانستی بەسود "والله اعلم بأعدائكم" خوا خۆی باشیان دەناسێ داواتان لێدەكات خۆتانیان لێ دوور بخەنەوە "وكفى بالله وليا وكفى بالله نصيرا" خوا بەسە بۆ ئەو كەسانەی پەنای بۆ دەبەن وە یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی داوای سەرخستنی لێدەكات .

پاشان خوای بەرز دەفەرمووێت: (من الذين هادوا) وشەی (من) لەوەدا بۆ دەرخستنی ڕەگەزە وەك فەرموویەتی: ﴿فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ﴾ [الحج: ٣٠]. وە ئایەتی: ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ واتە: قسەی خوا بە شێوەیەك لێك دەدەنەوە كە دورە لەڕاستی و وەك ئەوەنییەكە خوا مەبەستێتی بە قەستی و بە درۆ ﴿وَيَقُولُونَ سَمِعۡنَا وَعَصَيۡنَا﴾، واتە ئەی موحەممەد هەر چیبت وت ئێمە بیستومانە بەڵام بە فەرمانیت ناكەین بەوشێوەیە موجاهید و ئیبنو زەید ڕافەیان كردوە. هەر ئەوەش مەبەستە ئەوە ئەوپەڕی بێ باوەڕی و عینادیانە، چونكە پشتیان كردۆتە كیتابەكەی خوا دوای ئەوەی ئاوەزیان پێی شكاوە، وە ئەشزانێ چی سزایان دەدرێ لە سەر ئەوە ﴿وَٱسۡمَعۡ غَيۡرَ مُسۡمَعٖ﴾ واتە: هەرچی دەڵێین ببیستە نەك نەیبیستی. زەحاك و ئیبنو عەباس ئەوەیان وتووە. موجاهید و حەسەن وتوویانە: گوێبیست بە بێ ئەوەی لێت وەربگیرێ.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: یەكەمیان ڕاستە. ئەوەش بەگاڵتەجارییەوە وتوویانە: بەر نەفرینی خوا بكەن ﴿وَرَٰعِنَا لَيَّۢا بِأَلۡسِنَتِهِمۡ وَطَعۡنٗا فِي ٱلدِّينِۚ﴾ واتە: وا ئەزانن دەڵێین گوێڕایەڵێتان دەكەین بە وتنی (راعنا)، بەڵكو ڕەعونەیان دەوێ، بەوە قسەی خراپ وتن بە پێغەمبەر لە پێشەوە باسی ئەوەمان كرد لە باسی ئایەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرۡنَا﴾ [البقرة: ١٠٤]. لەبەر ئەوە خوای بەرز دەربارەی ئەوانە دەفەرمووێت كە بە قسەكانیان

ئەیانەویْ پێچەوانەی ئەوە دەربخەن کە دەریدەبڕن: ﴿لَيًّا بِأَلْسِنَتِهِمْ وَطَعْنًا فِي الدِّينِ﴾، واتە: بە قسەوتنیان بە پێغەمبەر، پاشان خوای بەرز دەفەرمووێ: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ قَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا وَاسْمَعْ وَانظُرْنَا لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَقْوَمَ وَلَٰكِن لَّعَنَهُمُ اللَّهُ بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: دڵیان لە خێر دەرکراوە دورە لێوەی هیچ شتێك لە باوەڕ کە سودی هەبێت ناچێتە دڵیانەوە لە پێشەوە باسمان کرد لە ئایەتی: ﴿فَقَلِيلًا مَّا يُؤْمِنُونَ﴾ [البقرة: ٨٨]، مەبەستی ئەوەیە کە باوەڕ ناهێنن باوەڕێك سوودی هەبێ بۆیان.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ آمِنُوا بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰ أَدْبَارِهَا أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّا أَصْحَابَ السَّبْتِ ۚ وَكَانَ أَمْرُ اللَّهِ مَفْعُولًا (٤٧) إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِاللَّهِ فَقَدِ افْتَرَىٰ إِثْمًا عَظِيمًا (٤٨)﴾

واتە: ئەی ئەوانەی لە پێشوودا کتێبی خودا و بۆ هاتبوو! بڕوابێنن بەمەی ئێمە ناردومانەتە خوارەوە، کە بڕوای بەوانەش هەیە وان لە کتێبەکەی ئێوەدا بەر لەوەی دەم و چاو گەلێ ساف بکەین و وەکی پشتی سەریان لێکەین ئێوەش هەر وەك ئەوانەی شەمۆیان شکاند بەر نەحلەتی ئێمە کەوتن و خوا بە هەرچی فەرمان بدا هەر وەدی دێ. خودا لەوانە خۆش نابێ کە بێژن خوا هاوکاری هەیە لەمە بەدەر هەر کێ خودا مەیلی لێ بێ لێی دەبورێ، ئەو کەسانەی دەڵێن خوا هاوکاری هەیە بوختانێکی گەورەیان لە دەم دەردەچێ تاوانێکی مەزن دەکەن.

خوای گەورە فەرمان بە ئەهلی کیتاب دەکات باوەڕبهێنن بەوەی ناردوویەتییە خوارەوە بۆ سەر بەندە و نێردراوەکەی موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) لەو کتێبە گەورەییەی ڕاستی ئەو هەواڵانە دەسەلمێنێ کە بەدەستیانەوە لە مژدەدان وە هەڕەشەیان لێدەکات ئەگەر کار نەکەی بە قسەکانی ﴿مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰ أَدْبَارِهَا﴾. ڕوویان وەردەگێڕن بۆ لای پشتیانەوە، لەوانەشە مەبەست ئەوە بێت پێش ئەوەی ڕوویان داپۆشین نە گوێ، نە چاوی تێدا نەمێنێ لەگەڵ ئەوەشدا پشتاوپشتی دەکەین، عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە

دەگێڕێتەوە دەربارەی ﴿مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا﴾. وتوویەتی: کوێریان بکەین ﴿فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ﴾. وتوویەتی: ڕوویان وەردەگێڕین بۆ لای پشتیانەوە، ئیتر پشتاوپشت دەڕۆن بەڕێوە بۆ هەریەکەیان دوو چاو ئەخەینە پشت سەریان ئەوە ئەوپەڕی سزا و سوکایەتی پێکردنە، ئەوەش نموونەیەکە خودا هێناویەتییەوە دەربارەیان کە لە هەق لادراون و بەرەو باتڵ براون، وە پەشیمان بوونەوەیان لە بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا و چوون بەرەو ڕێگای گومڕایی بە پەلە پاشەوپاش دەگەڕێنەوە واتە لە گومڕاییدا.

سوودی وتوویەتی: ڕێی لێ ئەگرین کە هەق نەبینێ، وە وتوویەتی: بەبێ باوەڕی دەیانگێڕینەوە بە مەیمونی ئیبنو زەید وتوویەتی: ئەیانگێڕێتەوە بۆ وڵاتی شام لە حیجازەوە، باسکراوە کە کەعبی ئەحبار کاتێ ئەو ئایەتەی بیست موسڵمان بوو.

ئیبنو حەجەر وتوویەتی: لە عیسای کوڕی موغیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: لای ئیبراهیم باسی موسڵمان بوونی کەعبمان کرد وتی: کەعب لە سەردەمی عومەردا موسڵمان بوو، جارێك ئەیویست بچێت بۆ (بیت المقدس) بە مەدینەدا تێپەڕی، عومەر بۆی چووە دەر وتی: ئەی کەعب موسڵمان ببە، ئەویش وتی: ئەی ئێوە لە کتێبەکەتاندا ئەمە ناخوێنن کە دەڵێت: ﴿مَثَلُ ٱلَّذِينَ حُمِّلُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ﴾ ـ إلى ـ ﴿أَسۡفَارَۢا﴾ [الجمعة: ٥]، وەمن ئێستا تەوراتم بە کۆڵەوەیە. ئەڵێ عومەر وازی لێ هێنا ئەویش ڕۆیشت هەتا گەیشتە حیمص گوێ لە پیاوێك بوو بە غەمبارییەوە ئەیووت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ ءَامِنُواْ بِمَا نَزَّلۡنَا مُصَدِّقٗا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبۡلِ أَن نَّطۡمِسَ وُجُوهٗا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدۡبَارِهَآ﴾ الآیـة. کەعب وتی: ئەی پەروەرین واموسڵمان بووم، ترسا لەوەی ئەو ئایەتەی تووش بێت، پاشان گەڕایەوە چووەوە بۆ یەمەن و چوو بۆ لای کەس و کاری، پاشان هەموویانی هێنا بە موسڵمانی.

ئیبنو ئەبی حاتەم بە زاراوەیەکی تر هێناویەتی و وتوویەتی: ئەبو موسلیمی جەلیلی مامۆستای کەعب بوو، هەمیشە لۆمەی دەکرد لەسەر ئەوەی ناچێت بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) ئەڵێ: ناردی بۆ ئەوەی چاوی پێی بکەوێت بزانێ ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە؟ کەعب وتوویەتی: سوار وڵاخ بووم

هەتا گەیشتمە مەدینە کە چاوم پێی کەوت قورئانی دەخوێندو دەیووت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ ءَامِنُوا۟ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقًا لِّمَا مَعَكُم مِّن قَبْلِ أَن نَّطْمِسَ وُجُوهًا فَنَرُدَّهَا عَلَىٰٓ أَدْبَارِهَآ﴾، ئەڵێ: چووم بۆ لای ئاوەکە و خۆم شۆری ئاوم دەکرد بەسەر و چاومدا لە ترسی ئەوەی نەك سەروچاوم داپۆشرێ، پاشان موسڵمان بووم.

﴿أَوْ نَلْعَنَهُمْ كَمَا لَعَنَّآ أَصْحَٰبَ ٱلسَّبْتِ﴾ واتە: ئەوانەی لە ڕۆژانی شەممەکانیاندا بە فێڵ و تەڵەکە ڕاویان دەکرد، خوای گەورەکردنی بە مەیمون و بەراز. چیرۆکەکەیان لە سورەتی (الاعراف)دا باسیان دەکرێ.

﴿وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا﴾ واتە: کاتێ فەرمانی کرد بە کارێك پاشگەزنابێتەوەو ڕێیشی لێ ناگیرێت، پاشان خوای گەورە هەواڵی داوە کە ﴿لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ﴾ واتە: لەو بەندەیە خۆش نابێ کاتێ بە خوا دەگات هاوبەشی بۆ داناوە ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ﴾، واتە: لە تاوانەکان ﴿لِمَن يَشَآءُ﴾، واتە: لە بەندەکانی لەوبارەیەوە چەند فەرموودەیەك هاتووە چەند بتوانین باسیان دەکەین.

فەرموودەی یەکەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عائیشەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەیفەرموو: "الدواوين عند الله ثلاثة، ديوان لا يعبأ الله به شيئا، وديوان لا يترك الله منه شيئا، وديوان لا يغفره الله. فأما الديوان الذى لا يغفره الله، فالشرك بالله، قال الله عز وجل: ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ﴾ [المائدة: ٧٢]، وأما الديوان الذى لا يعبأ الله به شيئا، فظلم العبد نفسه فيما بينه وبين ربه، من صوم يوم تركه، أو صلاة تركها؛ فإن الله يغفر ذلك ويتجاوز إن شاء. وأما الديوان الذى لا يترك الله منه شيئا، فظلم العباد بعضهم بعضا؛ القصاص لا محالة". (تفرد به أحمد).

واتە: تۆمارەکان لای خوا سێ جۆرن: جۆرێکیان خوا گوێیان پێ نادات، وە تۆمارێکیان خوا واز لە هیچی ناهێنێ، وە تۆمارێکیان خوا لە هیچی خۆش نابێت، ئەو تۆمارەی لێی نابورێ، هاوبەش دانانە بۆ خوا، خوای گەورە فەرموویەتی: خوا نابورێ لەوەی هاوبەشی دانرابێ، هەروەها

فەرموویەتی: هەرکەس هاوبەشی بۆ خوا دابنێ خوا بەهەشتی لەسەر حەرام دەکات، بەڵام ئەو تۆمارەی خوا گوێی پێ نادات، ستەمی بەندەیەلە خۆی لەو شتانەدا لە نێوان خۆی و پەروەرینیدایە لە نەگرتنی ڕۆژێك ڕۆژوو یان نەکردنی نوێژێك، خوای گەورە لەوانە ئەبوورێ ئەگەر بیەوێ، وە ستەمی بەندەکان خۆیان لە خۆیان لەو شتانەدا لە نێوان ئەوان و پەروەردگاریاندایە، بەڵام ئەو ستەمەی وازی لێ ناهێنێ ستەمی بەندەکانە لە یەك هەتا هەندێکیان لێیان دەپرسێتەوە لە هەندێك تۆڵەش هەردەبێ بسەنرێتەوە.

فەرموودەی دووەم: بەزار لە مەسنەدەکەیدا وتوویەتی: لە موعاویەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: گوێبیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووم دەیفەرموو: "كل ذنب عسى الله أن يغفره، إلا الرجل يموت كافرًا، أو الرجل يقتل مؤمنًا متعمدًا". (رواه النسائي).

واتە: خوای گەورە لەوانەیە لە هەموو تاوانێك ببورێ جگە لە تاوانی پیاوێك کە بە بێ باوەڕی بمرێ، یان پیاوێك کەسێك بکوژێ بە عەمدی.

فەرموودەی سێیەم: ئەبو بەکری بەزار وتوویەتی: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "الظلم ثلاثة، فظلم لا يغفره الله، وظلم يغفره الله، وظلم لا يتركه الله: فأما الظلم الذي لا يغفره الله فالشرك، وقال ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ [لقمان: ١٣] وأما الظلم الذي يغفره الله فظلم العباد لأنفسهم فيما بينهم وبين ربهم، وأما الظلم الذي لا يتركه فظلم العباد بعضهم بعضا، حتى يدين لبعضهم من بعض".

واتە: ستەم سێ جۆرە: ستەمێك خوا لێی نابوورێ، وە ستەمێك خوا لێی دەبوورێ، وە ستەمێك خوا وازی لێناهێنێ، ئەو ستەمەی لێی نابوورێ هاوبەش دانانە، بەڵام ئەو ستەمەی خوا لێی دەبورێ ستەم کردنی بەندەیە لە خۆی لەوانەدا لەنێوان ئەوان و پەروەردگاریاندایە، بەڵام ئەو ستەمەی وازی لێناهێنێ ستەمکردنی بەندەکانە لە یەکتری هەتا ئەو کاتەی پرسینەوەی لەسەر دەکرێت.

فەرموودەی چوارەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: ئەبو زەڕ وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن الله يقول: يا عبدي، ما عبدتني ورجوتني فإني غافر لك على ما كان فيك، يا عبدي، إنك إن لقيتني بقراب الأرض خطيئة ما لم تشرك بي، لقيتك بقرابها مغفرة". (تفرد به أحمد).

واتە: خوای گەورە دەفەرمووێت: ئەی بەندەکەم تا بمپەرستی و تکام لێ بکەی لەسەر هەر شتێك بێت لێت ئەبورم، ئەی بەندەکەم ئەگەر پێم بگەی کوندەیەك تاوانت بە کۆڵەوە بێت بە مەرجێك هاوبەشت بۆ دانەنابم بە کوندەیەك لێخۆشبوونەوە پێت دەگەم.

فەرموودەی پێنجەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: ئەبو زەڕ وتوویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "ما من عبد قال: لا إله إلا الله. ثم مات على ذلك إلا دخل الجنة" قلت: وإن زنى وإن سرق؟ قال: "وإن زنى وإن سرق" قلت: وإن زنى وإن سرق؟ قال: "وإن زنى وإن سرق". ثلاثا، ثم قال في الرابعة: "على رغم أنف أبي ذر"! (أخرجاه من حديث حسين، به).

واتە: هەر بەندەیەك بڵێ (لا إله إلا الله) پاشان لەسەر ئەوە بمرێ ئەچێتە بەهەشتەوە، ئەڵێ: وتم: ئەگەر زیناشی کردبێ یان دزی کردبێ؟ فەرمووی: با زینای کردبێ یان دزی، هەتا سێ جار، لە چوارەم جاردا فەرمووی: ئەبوزەڕ پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت.

ڕێگەیەکی دیکە: بۆ حەدیسەکەی ئەبی زەڕ، ئەحمەد وتوویەتی: ئەبو موعاویە بۆی گێڕاینەوە لە ئەعمەشەوە لە زەیدی کوڕی وەهەبەوە لە ئەبی زەڕەوە وتوویەتی: ئێوارەیەك بەناو حەرەی مەدینەدا لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) دەڕۆیشتین بەڕێوە، چاوەڕوانمان دەکرد کە بچین بۆ جەنگی ئوحود، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەی ئەبا زەڕ، وتم: بەڵێ ئەی نێردراوی خوا، فەرمووی: "حەز ناکەم سێ ئەوەندەی ئەو کێوی ئوحودەم هەبێت بەقەدەر دینارێك لام خۆشەویست تر بێت کە لە ڕێی خوادا سەرفی بکەم، پاشان ڕۆشتینەوە، دووبارە فەرموویەوە: ئەی ئەبا زەڕ ئەو

خەڵکە زۆرە کەمێکن لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەڵێ: دەستمان کردەوە بە ڕۆیشتن، فەرمووی: ئەی ئەبا زەڕ، لێرە بوەستە هەتا دێمەوە بۆ لات، ڕۆیشت (دروودی خوای لێ بێت) هەتا لە چاوم ونبوو، ئەڵێ: گوێم لە دەنگە دەنگێك بوو، وتم: لەوانەیە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) تووشی شتێکی خراپ بووبێت، ویستم شوێنی بکەوم، پاشان بیری قسەکەیم کەوتەوە کە فەرمووی: لێرە مەجولێ هەتا دێمەوە، چاوەڕوانم کرد هەتا گەڕایەوە، باسی ئەوەم بۆ کرد کە گوێبیستی بووم، فەرمووی: ئەوە جوبرائیل بوو هات بۆ لام وتی: هەر کەس لە نەتەوەکەت بمرێ هیچی نەکردبێتە هاوبەش بۆ خوا دەچێتە بەهەشتەوە، منیش وتم: ئەگەر زینای کردبێ، یان دزی؟ فەرمووی: ئەگەر زیناشی کردبێ یان دزی (أخرجاه فی الصحیحین).

فەرموودەی شەشەم: عوبیدی کوڕی حەمید لە مەسنەدەکەیدا وتوویەتی: لە جابیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا دوو شتە پێویستکارەکە چییە؟ فەرمووی: "هەر کەس مرد و هاوبەشی بۆ خوا بڕیار نەدابێ بەهەشتی بۆ پێویست دەبێ، وە هەر کەس مردوو هاوبەشی بۆ خوا بڕیاردابێ ئاگری بۆ پێویست دەبێ".

ڕێگایەکی دیکە: ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە جابیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ما من نفس تموت، لا تشرك بالله شیئا، إلا حلت لها المغفرة، إن شا و الله عذبها، وإن شا و غفر لها: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾. واتە: هەر نەفسێك بمرێ هیچی نەکردبێتە هاوبەش بۆ خوا لێبوردنی بۆ ڕەوا دەبێ خوا بیەوێ لێی دەبورێ و ئەگەر بیەوێ سزای دەدات.

ئەبو یەعلا لە مەسنەدەکەیدا وتوویەتی: لە جابیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا تزال المغفرة علی العبد ما لم یقع الحجاب". قیل: یا نبی الله، وما الحجاب؟ قال: "الإشراك بالله". قال: "ما من نفس تلقی الله لا تشرك به شیئا إلا حلت لها المغفرة من الله تعالی، إن یشأ أن یعذبها، وإن یشأ أن یغفر لها غفر لها". ثم قرأ نبی الله: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾.

واتە: بەردەوام لێبوردن بەسەر بەندەی خواوە بە هەتا پەردەکە دانەدرێتەوە، وتیان: پەردەکە چییە ئەی نێردراوی خوا؟ فەرمووی: هاوبەش بۆ خوا بڕیاردانە، پاشان فەرمووی: نەفس نییە بگات بە خوا و هاوبەشی بۆ بڕیارنەدابێ لێبوردنی لە لایەن خواوە بۆ ڕەوا نەکرێ بیەوێ لێی دەبورێ و بیەوێ لێی خۆش دەبێ، پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەو ئایەتەی خوێندەوە.

فەرموودەی حەوتەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی ئەیوبی ئەنسارییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هات بۆ ناومان و پێی وتین: پەروەردگارتان کردومییە سەرپشك لە نێوان حەفتا هەزار لە نەتەوەکەم کە بێ لێپرسینەوە بچنە بەهەشتەوەو لە نێوان دانانی کۆمەڵێك لای خۆی لە نەتەوەکەم کە لە ڕۆژی قیامەتدا بە ئارەزووی خۆی لێیان ببورێ یەکێ لە هاوەڵەکانی وتی: ئەی نێرروای خوا خوا ئەوە دەشارێتەوە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چووە ژورێ و پاشان هاتە دەرەوە وتی: (الله اکبر) پەروەردگارم لەگەڵ هەریەك هەزارێکدا هەفتا هەزاری بۆ زیادکردم و شاراوەکەش هەر لای خۆی دەبێ، ئەڵێ: ئەبو ڕەهم وتی: ئەی ئەبا ئەیوب ئەو شاراوەیەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چییە خەڵك بە زاریان دەیخۆن؟ ئەڵێن: تۆ لە کوێو شاراوەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە کوێ؟ ئەبو ئەیوب وتی: واز لەو پیاوە بهێنن کە هەواڵی شارراوەکەی پێغەمبەری پێداون وە گومانم هەیە، بەڵام بە دڵنیاییەوە شارراوەکەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەیە کە فەرموویەتی: "من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدا عبده ورسوله مصدقا لسانه قلبه أدخله الجنة"، واتە: هەر کەس شایەتی بدات کە شایستەیەکی پەرستن نییە جگە لە خوای تاك و تەنها و بێ شەریك و موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەوە خوا دەیخاتە بەهەشتەوە.

فەرموودەی هەشتەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من مات لا يشرك بالله شيئا دخل الجنة"، (تفرد به من هذا الوجه) واتە:

هەر کەس مرد و هیچی بەهاوبەش بۆ خوا بڕیار نەدابێ دەچێتە بەهەشتەوە.

فەرموودەی نۆیەم: ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە ئەبی ئەیوبی ئەنصاریەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پیاوێ هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: برازایەکم هەیە واز لە حەرام ناهێنێ، فەرمووی: لەسەر چ دینێکە؟ وتی: نوێژ دەکات و خوا بە تاك و تەنها دەزانێ، فەرمووی: "استوهب منه دينه، فإن أبى فابتعه منه". واتە: داوای لێ بکە کە ئاینەکەی خۆیت پێ ببەخشێ، ئەگەر ڕازی نەبوو لێی بکڕە، پیاوەکە چوو بۆ لای ئەو پیاوە ئەوەی لێ داواکرد ڕازی نەبوو، هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەواڵی پێدا فەرمووی: "وجدته شحيحا في دينه". بینیت چەند ڕۆژە لە دینەکەیدا، خوا ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ﴾.

فەرموودەی دەیەم: ئەبو یەعلا وتوویەتی: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا وازم لە هیچ پێویستییەك و خاوەن پێویستییەك نەهێناوە کردوومە، فەرمووی: "أليس تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله؟" ثلاث مرات. قال: نعم. قال: "فإن ذلك يأتي على ذلك كله" واتە: تۆ شایەتی نادەیت کە شایستیەکی پەرستن نییە جگە لە خوا و موحەممەد نێردراوی ئەوە؟ سێ جار، کابرا وتی: بەڵێ، فەرمووی: ئەوە هەموو ئەوانە دادەپۆشێ.

فەرموودەی یانزەهەم: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی هوڕەیرەوە دەگێڕێتەوە کە بە کوڕی جەوشی یەمامی وتووە: ئەی یەمامی بە هیچ پیاوێم مەڵێ: خوا لێت خۆش نابێ، یان خوا هەرگیز ناتخاتە بەهەشتەوە، وتم: ئەی ئەبو هوڕەیرە هەموومان ئەو وشەیە بە براکەمان یا بە هاوەڵەکەمان دەڵێین کاتی تووڕەبین، وتی: تۆ مەیڵێ، چونکە من لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە فەرموویەتی: "دوو پیاو لەناو بەنی ئیسرائیلدا هەبوون یەکێکیان خۆی ماندوو دەکرد لە خواپەرستییدا ئەویتریان درێغی لە خۆی نەدەکرد، هەردووکیانم بووبوونە برای یەك ئەوەی کە خۆی ماندوو کردبوو لە

خواپەرستییدا ئەیبینی ئەویتریان بەردەوام تاوانکاری دەکات پێی دەوت: واز لەو کارە خراپانە بهێنە، ئەویش دەیوت واز لە پەروەردگارم بهێنە، ئایا تۆ چاودێری بەسەرمەوە، ئەڵێ: هەتا ڕۆژێك لەسەر تاوانێك بینی بە گەورەی زانی پێی وت: خوا بتگرێ وازبهینە، ئەویش وتی: وازمان لێ بهێنە، ئەویش وتی: سوێند بە خوا، خوا لێت نابورێ یان هەرگیز ناتخاتە بەهەشتەوە، فەرمووی: خوا فریشتەی گیانکێشانی نارد بۆ هەردووکیان، گیانیانی کێشا، هەردووکیان لای خوا کۆبوونەوە، خوا بە تاوانبارەکەی فەرموو: بڕۆ بە ڕەحمەتی خۆم بچۆرە بەهەشتەوە، بەویتریانی فەرموو: ئایا تۆ زانا بووی؟ ئایا تۆ توانات هەبوو بەسەر ئەوەدا کە بەدەستی منە؟ بیبەن بۆ ناو ئاگر، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: بەوە گیانی منی بەدەستە قسەیەکی کرد دونیا و ئاخیرەتی لە دەست دا. (ابوداود).

فەرموودەی دوانزەیەم: تەبەرانی وتوویەتی: عەکریمە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: خوای گەورە فەرموویەتی: "من علم أني ذو قدرة على مغفرة الذنوب غفرت له ولا أبالي، ما لم يشرك بي شيئا" واتە: هەرکەس بزانێ من خاوەن توانام بەسەر لێبووردندا بێ ئەوەی گوێ بدەمێ لێی ئەبورم، بەمەرجێ هیچی نەکردبێتە هاوبەشم.

فەرموودەی سانزەهەم: ئەبو بەکری بەزار و ئەبو یەعلا وتوویانە: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من وعده الله على عمل ثوابا فهو منجزه له، ومن توعده على عمل عقابا فهو فيه بالخيار". هەرکەس خوا پەیمانی پێدابێ پاداشتی بداتەوە لەسەر کردەوەیەك ئەوە هەر جێبەجێی دەکات، هەر کەس هەڕەشەی لێ کردبێ لەسەر کردەوەیەك سزای بدات ئارەزووی خۆیەتی یان سزای ئەدا یان لێی ئەبورێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئێمە هاوەڵانی پێغەمبەر گومانمان نەبوو لەوەی بکوژ و ماڵی هەتیو خۆر و تاوان گرە بێ تاوانی باوەڕدار و شایەتی درۆ ئەچنە دۆزەخەوە هەتا خوا ئەم

ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ وتوویەتی: کاتێ ئەوەمان بیست وازمان لەوە هێنا فەرمانەکانمان گێڕایەوە بۆ لای خوا.

بەزار وتوویەتی: نافیع لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئێمە داوای لێخۆشبوونمان بۆ خاوەن تاوانە گەورەکان نەدەکرد هەتا گوێبیستی پێغەمبەر بوین ئەیفەرموو: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ وە فەرموویەتی: "أخرت شفاعتي لأهل الكبائر من أمتي يوم القيامة". واتە: تکای خۆم دواخستووە بۆ خاوەنی تاوانە گەورەکان لە نەتەوەی من لە ڕۆژی سەڵادا.

ئەبو جەعفەری ڕازی لە ڕەبیعەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: موجەبەر لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە بۆمان دەگێڕێتەوە وتوویەتی: کاتێ ئایەتی: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾ [الزمر: ٥٣] پیاوێك هەڵسا وتی: هاوبەش بۆ خوا بریاردانیش ئەی نێردراوی خوا؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەی لا ناخۆش بوو ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا ﴿٤٨﴾﴾. (رواه ابن جرير. وقد رواه ابن مردويه من طرق عن ابن عمر).

ئەو ئایەتەی سورەتی (التنزيل) مەرجی تۆبەکردنی لەسەرە، هەر کەس تۆبە بکات لە هەر تاوانێك کە ئەنجامی دەدات با چەند جار دووبارەی بکاتەوە خوا تۆبەکەی لێ وەردەگرێ، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا﴾، واتە: بەمەرجێ تۆبە کردن ئەگەر بەو شێوەیە نەبوو هاوبەشدانان ئەچێتە ناوی، وە ئەویش ڕاست نییە لێرەدا، لەبەر ئەوەی خوا لە هاوبەش دانان نابورێ وە حوکمی داوە بەوەی لەوە بەولاوە ئەبورێ لە هەر کەس ئارەزوو بکات، واتە: ئەگەر خاوەنەکەی تۆبە نەکات ئەوە ئومێدەوارترە لەوە لەو ڕووەوە. ئیتر خوا ئەزانێ.

﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا﴾ وەك فەرمایشتی: ﴿إِنَّ ٱلشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ﴾ [لقمان: ١٣].

لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە لە ئیبنو مەسعوودەوە کە وتوویەتی: وتم: ئەی نێردراوی خوا کام تاوانە گەورەترین تاوانە؟ فەرمووی: "أن تجعل لله ندا وهو خلقك..." واتە: هاوتایەك بۆ خوا بڕیار بدەی کە ئەو دروستی کردووی.

ئیبنو مەردەویە لە عیمرانی کوڕی حوسەینەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "أخبركم بأكبر الكبائر: الشرك بالله" گەورەترین تاوان هاوبەش بۆ خوا بڕیاردانە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدِ ٱفْتَرَىٰٓ إِثْمًا عَظِيمًا﴾ وە ئازاردانی دایك و باوك، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرمووێت: ﴿أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ﴾ [لقمان: ١٤].

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم ۚ بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّى مَن يَشَآءُ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۖ وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثْمًا مُّبِينًا ﴿٥٠﴾ أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَٰبِ يُؤْمِنُونَ بِٱلْجِبْتِ وَٱلطَّٰغُوتِ وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا ﴿٥١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَعَنَهُمُ ٱللَّهُ ۖ وَمَن يَلْعَنِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ نَصِيرًا ﴿٥٢﴾﴾

واتە: تۆ لەوانەت نەڕوانیوە کە هەر خۆیان پاکانە بۆ خۆیان دەکەن؟ نازانن پاکانەی هەرکەس بەخودایە و هەر خودایە کە بە قەد هەودا باریکی ناوکە خورماش ناهەقی لە هیچ کەس ناکات، دەبڕوانە درۆی چلۆن بە دەم خواوە هەڵدەبەستن، تاوان لەمە ئاشکراتر نەبووە و نابێ. ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە کەوا بەشێك لە کتێبیان پێدراوە و بە بت و تاغوتێ بڕوایان هێناوە؟ ئەڵێن: ڕێی خواناسەکان لە ڕێگەی بڕوادارەکان بەر ڕاست ترە؟ ئەوانە بەبەر نەحلەتی خوا کەوتوون، هەرکەسێ خوا نەحلەتی لێ بکا هیچ کەسێ بەهانای نایەت.

حەسەن و قەتادە وتوویانە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم﴾ دەربارەی جولەکە و گاور هاتۆتە خوارەوە کاتێ وتیان: ئێمە نەوەی خوا و خۆشەویستەکانی خواین.

ئیبنو زەید وتوویەتی: دەربارەی ئەو وتەیەیان هاتۆتە خوارەوە کە وتوویانە: ﴿نَحْنُ أَبْنَٰٓؤُا۟ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥ﴾ [المائدة: ١٨]، وە دەربارەی ئەوەی وتوویانە: ﴿لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾ [البقرة: ١١١].

وە موجاهید وتوویەتی: گاورو جولەکە لە نزاو نوێژدا منداڵەکانیان پێش خۆیان دەدا بۆ ئەوەی کە پاڕانەوەی بڵێن (ئامین)، ئەیانوت ئەمانە بێ تاوانن.

هەروەها عەکریمە و ئەبو مالیك ئەوەیان وتووە.

عەوفی وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە دەربارەی ئەو ئایەتەی وتوویەتی: ﴿لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾ [البقرة: ١١١]. جولەکە ئەیانوت: ئەو منداڵانەمان کە مردوون ئەبنە هۆی نزیکییمان لە خواوە و تکامان بۆ دەکەن و بە پاکمان رادەگرن، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە بۆ سەر موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) کە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم﴾ (راوه ابن جرير).

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: جولەکەکان منداڵەکانیان پێش خۆیان دەخست و دەیانکردنە ئیمام و قوربانییەکانیان دەکرد ئەیانوت: ئەمانە هەڵەیان هەیە نە تاوان، درۆیان دەکرد، خوای گەورە فەرمووی: من کەسێکی تاوانکار پاکناکەمەوە بەبێ تاوانێك، ئیتر ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم﴾، پاشان وتوویەتی: لە موجاهید و ئەبی مالیك و سوودی و عەکریمە و زەحاك وەك ئەوە دەگێڕنەوە.

زەحاك وتوویەتی: وتوویانە ئێمە تاوانمان نییە وەك چۆن منداڵەکانمان تاوانیان نییە، خوای گەورە ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم﴾ی دەربارەیان نارده خوارەوە.

وتراوە دەربارەی ئەوانە نێردراوەتە خوارەوە کە مەدحی خۆیان دەکەن و خۆیان بە پاك دادەنێن، لە سازەواری موسلیمدا هاتووە لە میقدادی کوڕی ئەسوەدەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمانی پێ کردین خۆڵ هەڵدەین بەرەو سەرو چاوی ئەوانەی خۆیان هەڵدەنێن.

لە هەردوو سازەواردا هاتووە لە ڕێگەی خالیدی حەزاوە لە عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبو بەکرەوە لە باوکییەوە هاتووە، کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) گوێی لەر پیاوێك بوو بەپیاوێکی تردا هەڵی ئەدا، فەرمووی: "ويحك. قطعت عنق صاحبك". وەیح بۆ تۆ، ملی هاوەڵەکەتت شکاند، پاشان فەرمووی: "إن كان أحدكم مادحا صاحبه لا محالة، فليقل: أحسبه كذا ولا يزكى على الله أحدا" ئەگەر کەسێك لە ئێوە هەردەبێ مەدحی هاوەڵەکی بکات با بڵێ وابزانم ئاوایە، کەس بەسەر خوادا تەزکیە نەکات.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عومەری کوڕی خەتابەوە هاتووە وتوویەتی: هەر کەس وتی: من باوەڕدارم ئەوە بێ باوەڕە، وە هەر کەس وتی: من نازانم، ئەوە نەزانە، وە هەر کەس وتی: من دەچمە بەهەشتەوە، ئەوە دەچێتە ئاگرەوە.

ئیبنو مەردەویە لە ڕێگای موسای کوڕی عوبێدەوە هاتووە کە عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: ئەوەی من لێی دەترسم تووشی ئێوە بێت ڕای خۆ بە چاك زانینە، هەر کەس وتی: باوەڕدارم ئەوە بێ باوەڕە، هەرکەس وتی: من زانام، ئەوە نەزانە، وە هەر کەس وتی: ئەچمە بەهەشتەوە ئەچێتە دۆزەخەوە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: مەعبەدی جوهەنی وتوویەتی: موعاویە یەکەم فەرموودەی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕایەوە و وتوویەتی: کەم جار ڕۆژانی هەینی ئەم وشانەی واز لێدەهێنا کە لە پێغەمبەرەوە دەیگێڕایەوە کە دەیفەرموو: "من يرد الله به خيرا يفقهه في الدين، وإن هذا المال حلو خضر، فمن يأخذه بحقه يبارك له فيه، وإياكم والتمادح فإنه الذبح" هەرکەس خوا بیەوێ تووشی خێری بکات زانستی ئاینی فێر دەکات، ئەم ماڵەش سەوزو شیرینە هەر کەس بە هی خۆی بیگرێتە دەست، خوا لێی پیرۆز دەکات، دوورکەونەوە لە خۆهەڵنان، چونکە ئەوە کوشتنەوەیە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە پیاوی وایە بەیانی بە دینەکەیەوە دەڕوات، پاشان کە دەگەڕێتەوە هیچی پێنامێنێ، پیاوی وایە کە ئەگات بە پیاوێکی تر نەسوود و قازانجی هەیە بۆی

کەچی پێی دەڵێت: سوێند بە خوا تۆ وایت، لەوانە کە گەڕایەوە هیچ لە پێویستییەکانی چارە ناکات، بەڵام خوا لێی تووڕە بووە، پاشان ﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يُزَكُّونَ أَنفُسَهُم﴾ی خوێندەوە.

پاشان بە درێژی لەسەر ئەوە دەدوێین لای ئایەتی: ﴿فَلَا تُزَكُّوٓاْ أَنفُسَكُمۡۖ هُوَ أَعۡلَمُ بِمَنِ ٱتَّقَىٰٓ﴾ [النجم: ٣٢]. لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿بَلِ ٱللَّهُ يُزَكِّي مَن يَشَآءُ﴾ واتە: سەرچاوەی ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ خوای بەرز و شکۆمەند، چونکە ئەو زاناترینە بە ڕاستییەکانی کاروبارەکان و نادیارەکان.

پاشان خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُظۡلَمُونَ فَتِيلًا﴾ واتە وازی لە پاداشتی کەس ناهێنێ کە بیداتێ ئەوەندەی فەتیلێك.

ئیبنو عەباس و موجاهید و عەکریمە و عەتا و حەسەن و قەتادە و چەند کەس لە پێشینەکان وتوویانە: فەتیل ئەوەیە لەناوکی خورمادایە.

لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە ئەوەیە لە نێوان پەنجەکانتەوە دەرچێ. هەردوو قسەکە نزیکن لە یەکەوە.

﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ يَفۡتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَۖ﴾ واتە: چۆن درۆ دەکەن دەربارەی ئەوەی خۆیان بە پاك ڕادەگرن وە ئەوەی دەیڵێن کە ئەوان نەوەی خوا و خۆشەویستانیانن، وە ئەوەی وتوویانە: ﴿لَن يَدۡخُلَ ٱلۡجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوۡ نَصَٰرَىٰۗ﴾ [البقرة: ١١١] وە ئەوەی وتوویانە: ﴿لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعۡدُودَٰتٍۚ﴾ [آل عمران: ٢٤] وە ئەوەی پشتیان بەستووە بە کاری چاکی باووباپیرەکانیان، وە خوای گەورە حوکمی داوە کە کردەوەی باوو باپیرەکانیان بۆ نەوەکانیان نابێت کە دەفەرموێت: ﴿تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ﴾ [البقرة: ١٣٤]، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَكَفَىٰ بِهِۦٓ إِثۡمٗا مُّبِينًا﴾ ئەوەیان بەسە ببێتە درۆ و ئیفترا بۆیان.

﴿أَلَمۡ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ نَصِيبٗا مِّنَ ٱلۡكِتَٰبِ يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡجِبۡتِ وَٱلطَّٰغُوتِ﴾

لە عومەری کوڕی خە تتابەوە دەگێڕنەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە (الجبت) واتە سیحر، وە (الطاغوت) شەیتانە. وە ئەوەش لە ئیبنو عەباس و ئەبی عالیە و موجاهید و عەتا و عەکریمە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و شەعبی و حەسەن و زەحاك و سوودییەوە دەگێڕنەوە.

لە ئیبنو عەباس و ئەبی عالیە و موجاهید و عەتا و عەکریمە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و شەعبی و حەسەن و عەتییەوە دەگێڕنەوە وتوویانە: (الجبت) شەیتانە، ئیبنو عەباس وتوویەتی: بەحەبەشی، وە هەر لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە کە (الجبت) بتەکانە، شەعبی وتوویەتی: (الجبت) کاهینە، لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە کە (الجبت) حویەی کوڕی ئەختەبە، لە موجاهیدەوە هاتووە کە (الجبت) کەعبی کوڕی ئەشرەفە.

ئەبو نەصر ئیسماعیل کوڕی حەممادی جەوهەری لە کتێبەکەیدا بە ناوی (الصحاح) وتوویەتی: (الجبت) وشەیەکە بەرامبەر بت و کاهین و ساحیر و هاوشێوەکانیان بەکاردێت. لە فەرموودەدا هاتووە کە "الطيرة والعيافة والطرق من الجبت".

ئەو فەرموودەیەی ئیمام ئەحمەد باسی کردووە لە مەسنەدەکەیدا، کە لە موخاریقەوە هاتووە کە گوێی لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووە فەرموویەتی: "إن العيافة والطرق والطيرة من الجبت" عەوف وتوویەتی: (العيافة) سەرزەنشتی باڵندە کردنە، (الطرق) هێڵە لەسەر زەوی دەکیشرێ، وە (الجبت) حەسەن وتوویەتی: شەیتانە.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە جابیرەوە دەگێڕنەوە کاتێ دەربارەی (الطواغيت) پرسیاریان لێ کردووە وتوویەتی: ئەوانە کاهێنن کە شەیتان دێتە خوارەوە بۆ لایان.

موجاهید وتوویەتی: (الطاغوت) شەیتانە لەسەر وێنەی مرۆڤ دادی خۆیان دەبەنە لای هەر ئەو خاوەنی کاروباریانە.

ئیمام مالیك وتوویەتی: هەموو ئەوانەی لە بریتی خوا دەپەرسترێن تاغوتن.

﴿وَيَقُولُونَ لِلَّذِينَ كَفَرُوا۟ هَـٰٓؤُلَآءِ أَهْدَىٰ مِنَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ سَبِيلًا﴾ واتە: بێباوەڕەکان بە چاکتر دەزانن لە موسڵمانەکان بە نەزانییان و کەمی ئایینیان، وە بێباوەڕییان بە کتێبەکەی خوا کە لەبەردەستیاندایە.

ئیبنو ئەبی حاتیم دەگێڕێتەوە لە عەکریمەوە وتوویەتی: حویەی کوڕی ئەختەب و کەعبی کوڕی ئەشرەف هاتن بۆ مەککە، پێیان وتن: ئێوە ئەهلی

کیتاب و ئەهلی عیلمن دەربارەی موحەممەد و ئێمە شتێکمان بۆ ڕوون بکەنەوە، وتیان: ئێوە کێن و موحەممەد کێیە؟ وتیان: ئێمە سیلەی ڕەحم دەگەیەنین و وشتر دەکەینە قوربانی و ئاو و شیر ئەدەین بە خەڵك و دیلەکان ئازاد ئەکەین، وە ئاو دەدەین بە حەجاج، موحەممەد صەنبوەر سیلەی ڕەحمی بریوین، ئەوانەی حاجییەکانی بەنی غیفار تاڵان دەکەن شوێنی کەوتوون، جا ئێمە چاکین یان ئەو؟ وتیان: ئێوە چاکترن و لەسەر ڕێی ڕاستن، خوای گەورە ئایەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا﴾ ... [النساء: ٥١].

ئیبنو ئیسحاق وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: ئەوانەی حزبەکانی ئەحزابیان دروست کرد لە قورەیش و بەنی غەتەفان و بەنی قورەیزە بوون، لە بەنی قورەیزە حویەی کوڕی ئەختەب و سەلامی کوڕی ئەبی حەقیق و ئەبو ڕافیع و ڕەبیعی کوڕی ڕەبیع و ئەبو عەممار و حوحی کوڕی عامیر و هوزەی کوڕی قەیس و مۆح و ئەبو عامیر و هوزە لەبەنی وائیل بوون، ئیتر ئەوانی دیکە لە بەنی نەزیر بوون، کاتێ هاتن بۆ لای قورەیش وتیان: ئەوە زاناکانی جولەکە و دەربارەی کتێبی یەکەم، شت دەزانن، لێیان بپرسن ئایا ئایینەکەی ئێوە چاکە یان ئایینی موحەممەد؟ ئەوانیش پرسیاریان لێ کردن، وتیان: دینەکەی ئێوە چاکترە لە دینەکەی موحەممەد و ئێوە لەسەر ڕێگای ڕاستن نەك موحەممەد و شوێنکەوتوانی، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ نَصِيبًا مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ﴾ هەتا ﴿وَءَاتَيْنَـٰهُم مُّلْكًا عَظِيمًا﴾.

لەبەر ئەوە نەفرینی لێ کردوون و هەواڵی ئەوەی داوە کە ئەوانە کەس فریایان ناکەوێت نە لە دونیا و نە لە ئاخیرەتدا، چونکە کاتێ ڕۆیشتن داوای یارمەتییان لە هاوبەشدانەرەکان کرد بۆ ئەوەی لا بکەن بە لایانەوە و سەریان بخەن، بێ سۆ وەڵامیان دانەوە لە جەنگی ئەحزابدا لەگەڵیاندا هاتن بۆ جەنگ هەتا پێغەمبەر و هاوەڵەکانی خەندەقێکیان بە دەوری مەدینەدا هەڵکەند، ئیتر خوا شەڕی ئەوانەی لێ دوورخستنەوە ﴿وَرَدَّ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِغَيْظِهِمْ لَمْ يَنَالُوا۟ خَيْرًا ۚ وَكَفَى ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلْقِتَالَ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ قَوِيًّا عَزِيزًا﴾ [الأحزاب: ٢٥].

﴿أَمۡ لَهُمۡ نَصِيبٌ مِّنَ ٱلۡمُلۡكِ فَإِذًا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا ﴿٥٣﴾ أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا عَظِيمًا ﴿٥٤﴾ فَمِنۡهُم مَّنۡ ءَامَنَ بِهِۦ وَمِنۡهُم مَّن صَدَّ عَنۡهُۚ وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا ﴿٥٥﴾﴾

واتە: ئاخۆ ئەمانەشیان بەو موڵکەوە هەیە؟ ئەگەر بیشیانبێ ئەوەندە تێکوڵی دەنکە خورمایەك بەهرەیان بۆ مەردم نییە، یان ئەوانە ئیرەیی بەمانە دەبەن کە خوا چاکەی لەگەڵ کردوون؟ خۆ دیاریشە ئێمە بە بەرەی ئیبراهیم کتێب و کارزانییمان داو دەسەڵاتێکی گەورەشمان پێ سپاردن، بڕێك بڕوایان هێناو بڕێکیتر ڕوویان وەرگێڕا، کە ئەوانە گڵی جەهەنەم بەشیانە و بەشیشیانە.

خوای بەرز فەرموویەتی: ئایا ئەوانە بەشیان هەیە لە موڵکدا، ئەوە پرسیارێکی ئینکارییە، واتە هیچ بەشیان نییە لە موڵك دا، پاشان بە بەخیل وەسفی کردوون، فەرموویەتی: ﴿فَإِذًا لَّا يُؤۡتُونَ ٱلنَّاسَ نَقِيرًا﴾ واتە: لەبەر ئەوەی ئەگەر بەشیان لە موڵکدا هەبوایە لە تەسەڕوف کرندا هیچیان نەئەدا بە کەس بەتایبەتی بە موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) هیچیان نەئەدا، ئەم ئایەتەش وەك فەرمایشی: ﴿قُل لَّوۡ أَنتُمۡ تَمۡلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحۡمَةِ رَبِّيٓ إِذًا لَّأَمۡسَكۡتُمۡ خَشۡيَةَ ٱلۡإِنفَاقِۚ﴾ واتە: لە ترسی ئەوەی کە لە دەستیان بچێت لەگەڵ ئەوەی وێنا ناکرێت تەواوبوونی ئەوەش لە بەخیلی و ڕژدییانە، لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ قَتُورًا﴾ [الإسراء: ١٠٠] واتە: بە ڕژدی، پاشان دەفەرموێت: ﴿أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ﴾ واتە: بەوەی حەسوودییان برد بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لەسەر ئەوەی خوا لە پێغەمبەرایەتی بەشی داوە، وە ئەوەی ڕێگای لێ گرتوون کە باوەڕی پێ نەهێنن حەسوودییانە پێی، لەبەر ئەوەی لە عەرەب بووە لە بەنی ئیسرائیل نەبووە.

تەبەرانی وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە دەربارەی ئایەتی: ﴿أَمۡ يَحۡسُدُونَ ٱلنَّاسَ عَلَىٰ مَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦۖ﴾ وتوویەتی: ئێمە خەڵکین خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَقَدۡ ءَاتَيۡنَآ ءَالَ إِبۡرَٰهِيمَ ٱلۡكِتَٰبَ وَٱلۡحِكۡمَةَ وَءَاتَيۡنَٰهُم مُّلۡكًا

﴿عَظِيمًا﴾ واتە: لە نەوەکانی بەنی ئیسرائیلدا ئەوانەی لە نەوەکانی ئیبراهیمدا پێغەمبەرمان ناردووە و کتێب و حیکمەتمان بۆ ناردوون چەندەها ساڵ حوکمیان پێکردووە، وە پاشا و دەسەڵاتدارمان لێ دروست کردوون لەگەڵ ئەوەشدا ﴿فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ﴾ واتە بەو پێدانە ئەوەش لە نیعمەتەکانی ﴿وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾ واتە بێباوەڕییان پێ کرد، پشتیان تێکرد و هەوڵیان دا خەڵکی لێ دووربخەنەوە، کە لە وانەو لە ڕەگەزی ئەوان بوو واتە لە بەنی ئیسرائیل، ئەوەبوو لەسەری جیاوازییان هەبوو، ئەی موحەممەد ئەبێ حاڵی تۆ چۆن بێ کە لە بەنی ئیسرائیل نیت؟ موجاهید وتوویەتی: ﴿فَمِنْهُم مَّنْ ءَامَنَ بِهِۦ﴾ واتە بە موحەممەد (درودی خوای لێ بێت)، ﴿وَمِنْهُم مَّن صَدَّ عَنْهُ﴾ بێباوەڕەکان زۆرتر بە درۆیان دادەنایەوە زۆرتر دوورن لەو ڕێنماییەی بۆت هێناون ئەو هەقە دیارییە، لەبەر ئەوە هەڕەشەیان لێ دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَكَفَىٰ بِجَهَنَّمَ سَعِيرًا﴾ واتە: بەسە بۆ ئەوان بە ئاگر سزایان بدرێ لەسەر ئەو بێباوەڕی و عینادییەیان و پێچەوانەکردنی خوا و پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت).

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِـَٔايَٰتِنَا سَوْفَ نُصْلِيهِمْ نَارًا كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُواْ ٱلْعَذَابَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿٥٦﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا ﴿٥٧﴾﴾

واتە: ئەو کەسانەی لە نیشانەکانی ئێمە حاشا دەکەن لە دواڕۆژدا بە ئاگر دەیانسووتێنین هەتا پێستیان داپڵۆسا پێستی تریان بۆ دەگۆڕین تا ئازار بچێژن، خودا خاوەن دەسەڵاتی لەکار زانە، ئەو کەسانەش کە بوونە خاوەنی بڕوا و ئاکاری چاك ڕەچاو دەکەن دەیانبەینە باغاتی وا جۆباریان بەبەردا دەڕواو هەتا سەر هەر تیایا دەبن، ژنانی پاك لە گشت عەیب و سێبەری پڕیان دەدەینێ.

خوای گەورە هەواڵ دەدات هەر کەس بێباوەڕی بکات و بەرەنگاری نێردراوەکەی بێت بە ئاگری دۆزەخ سزای دەدات، جا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ

﴿ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا﴾ ئەیانخەینە ئاگرێك كە چواردەوریان بدات و هەموو تاوانەكان و ئەندامەكانی لەشیان بگرێتەوە، پاشان هەواڵی بەردەوامی ئەو سزایانەیان و سەرشۆڕكردنیان دەدات دەفەرموێت: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ ئەعمەش لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: كاتێ پێستی لەشیان دەسووتێ و دەبێ بە كۆڵۆ خوا بۆیان دەگۆڕێ بە پێستێكی تری وەك كاغەز سپی.

یەحیای كوڕی زەیدی حەزرەمی وتوویەتی دەربارەی ئەو ئایەتە پێم گەیشتووە كە بێ باوەڕ سەد پێستی بۆ درویت دەبێ لە نێوان هەردوو پێستد شێوەیەك لە سزا دروست دەبێت (رواه ابن ابی حاتم).

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە دەربارەی: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم﴾، وتوویەتی: لە ڕۆژێكدا حەفتار هەزار جار پێستەكانیان دەبێتە كۆڵۆ.

فوزەیل وتوویەتی: هیشام لە حەسەنەوە دەگێڕێتەوە ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم﴾، هەر كاتێ پێستی لەشیان سوتا و داپڵۆسا و گۆشتەكەیان خوارد پێیان دەڵێن وەك خۆتان لێبێتەووە، وەك خۆیان لێدێتەوە.

لە نافیعەوە لبە ئیبنو عومەروە هاتووە وتوویەتی: پیاوی لای عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم بَدَّلْنَٰهُمْ جُلُودًا غَيْرَهَا لِيَذُوقُوا۟ ٱلْعَذَابَ﴾ی خوێندەوە، عومەر وتی: دووبارەی بكەروە بۆم، ئەووزیش دووبارەی كردەوە، لەولاوە موعازی كوڕی جەبەل وتی: واتاكەی لای منە، وتی: هەر سەعاتێك سەد جار پێستەكەی دەگۆڕێ، عومەر وتی: منیش بەو شێوەیە لە پێغەمبەرم بیستووە.

ڕەبیعی كوڕی ئەنەس وتوویەتی: لە كتێبی یەكەمدا نووسراوە پێستی هەریەكەیان چل باڵ درێژ و پان دەبێ و دانەكانی حەفتا باڵ درێژ دەبن وە سكی ئەگەر كێوێكی تێبخرێ ئەیگرێت، كاتێ ئاگر ئەو پێستەیان هەڵدەقرچێنێ پێستێكی تریان بۆ دروست دەبێت.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: موجاهید لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە لە

پێغەمبەرەوە کە فەرموویەتی: "يعظم أهل النار في النار، حتى إن بين شحمة أذن أحدهم إلى عاتقه مسيرة سبعمائة عام، وإن غلظ جلده سبعون ذراعا، وإن ضرسه مثل أحد". (تفرد به احمد من هذا الوجه) واتە: دۆزەخییەکان هەریەکەیان لە ئاگردا گەورە دەکرێ هەتا لە نێوان پەڕەی گوێچکەی و شانیدا حەفتا ساڵ دوورە وە ئەستووری پێستەکەی حەفتا باڵ ئەستوور دەبێ، وە دانەکانی ئەوەندەی کێوی ئوحود دەبێ.

وە وتراوە مەبەست لە فەرمایشی: ﴿كُلَّمَا نَضِجَتْ جُلُودُهُم﴾، واتە: شەرواڵەکانیان، (وهو ضعيف لانه خلاف الظاهر).

فەرمایشی: ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ الصَّٰلِحَٰتِ سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّٰتٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾. ئەمە هەواڵێکە لە خواوە دەربارەی ئەوەی بەختەوەرەکان لە بەهەشتانێکدان جۆگە و رووبار بە ناویاندا دەڕوات شوێنەکان و لاکانی چۆنیان بوێت وا دەبێ و هەر شوێنێك هەڵبژێرن بۆ هەمیشە تێیدا دەبن بێ ئەوەی بگوێزرێتەوەو لا نابرێن و نایەنەوێ بە هیچ لایەکی تردا ببرێن ﴿لَّهُمْ فِيهَآ أَزْوَٰجٌ مُّطَهَّرَةٌ﴾، واتە: تووشی بێنوێژی زەیستانی ئازار و رەوشتی ناشیرین و کەموکوڕی نابن وەك ئیبنو عەباس وتوویەتی: واتە خاوێنن لە پیسی و ئازار، موجاهید وتوویەتی: خاوێنن لە میز و بێنوێژی و بەڵغەم و چڵم و مەنی و منداڵ.

قەتادە وتوویەتی: خاوێنن لە ئازار و تاوانەکان و بێنوێژی و پیسی.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَنُدْخِلُهُمْ ظِلًّا ظَلِيلًا﴾ واتە: سێبەری چڕوپڕو خۆش و خاوێن، ئیبنو جەریر وتوویەتی: شوعبە دەگێڕێتەوە کە زەحاك لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن في الجنة لشجرة يسير الراكب في ظلها مائة عام لا يقطعها، شجرة الخلد"، واتە: لە بەهەشتدا درەختێك هەیە سوارێك سەد ساڵ بە سێبەرەکەیدا بڕوات تەواوی ناکات ئەوە درەختی هەمیشەییە.

﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا۟ الْأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا۟ بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِۦٓ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿٥٨﴾﴾

واتە: خودا فەرمانت پێدەدا هەرچی ماڵی ئەمانەتە بیاندەنەوە بە خاوەنیان هەر گایەکیش بەکاری مەردم ڕادەگەن بێ لاگری و بە یەکسانی پێ ڕا بگەن خودا زۆر باش ئامۆژگاریتان بۆ دەکا، خودا هەموو شتێك دەبیسێ و هەموو شتێکیش دەبینێ خوای گەورە هەواڵی داوە کە فەرمان دەکات بە بەندەکانی ئەمانەت بگێڕنەوە بۆ خاوەنەکانیان.

لە فەرموودەیەکی حەسەندا لە سەمورەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "أد الأمانة إلى من ائتمنك، ولا تخن من خانك". واتە: ڕاسپاردە بدەنەوە بەوانەی شتیان لا داناون و ناپاکی مەکە بەرامبەر کەسێك ناپاکی بەرامبەر کردوی.

ئەوە هەموو ڕاسپاردە پێویستەکان لەسەر مرۆڤ لە مافەکانی خوا بەسەر بەندەکانییەوە لە نوێژ و ڕۆژو و زەکات و کەفارەت و نەزر و گەلێ شتی دیکە لەوانەی ئامانەتن بەسەر بەندەکانەوە و بەندە بێ ئاگان لێو لە مافی بەندەکان بەسەریەکەوە وەك ڕاسپاردە وە گەلێ لەو شتانەی خەڵك یەکتر بە دەستپاك دادەنێن و لایان دادەنێن بێ ئەوەی شایەتی لەسەر بگرن، خوای گەورە فەرمانی داوە بە دانەوەی ئەوانە بە خاوەنەکانیان، هەر کەس لە دونیادا ئەوە نەکات خوا ڕۆژی دوایی لێی دەسێنێتەوە وەك چەسپاوە لە فەرموودەی سازدا کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لتؤدن الحقوق إلى أهلها، حتى يقتص للشاة الجما و من القرناء" واتە: هەر مافێکی خەڵك بەسەرتانەوەیە لێتان دەسێنرێتەوە هەتا هەقی بزنی بێ شاخ لە شاخدار دەسێنرێتەوە.

ئیبنو ئەبی حاتیم دەگێڕێتەوەە کە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود وتوویەتی: شەهیدبوون ئەبێتە کەفارەتی هەموو تاوانێك جگە لە ئەمانەت، ڕۆژی قیامەت پیاوێك دێنن هەر چەندە لە ڕێگەی خوادا کوژراوە پێی دەوترێ ئەو ئەمانەتەی لاتە بیدەرەوە بە خاوەنەکەی، ئەڵێت چۆن بیدەمەوە خۆ دونیا ڕۆیشتووە؟ لەناو بنکی دۆزەخدا ئەمانەتەکە ئەکرێت بە شتێك ئەو هەڵدەگرێ و فڕێ دەدرێتە ناو دۆززەخەوە.

زادان وتوویەتی: ئەوەم گێڕایەوە بۆ بەڕا وتی: براکەم ڕاست دەکات: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ سوفیانی سەوری لە ئیبنو ئەبی

لەیلاوە لە پیاوێکەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: ئەو نادیارە بۆ چاك و خراپ.

موحەممەدی کوڕی حەنەفییە وتوویەتی: ئەوە نوسراوە بۆ چاك و خراپ.

ئەبو عالیە وتوویەتی: ئەمانەت ئەوەیە کە فەرمانتان پێ کراوە بیکەن و قەدەغە کراوە لێتان.

ئوبەی کوڕی کەعب وتوویەتی: لە ئەمانەتە کە ژن پارێزگاری لە داوێنی خۆی بکات.

ڕەبیعی کوڕی ئەنەس وتوویەتی: ئەوەی لە نێوان خۆت و خەڵکدایە ئەمانەتە.

عەلیە کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا﴾ وتوویەتی: ئامۆژگاری کردنی ژنان لە لایەن کاربەدەستەوە لە ڕۆژانی جەژندا ئەچێتە ناو ئەوە.

زۆر لە ڕاڤەکاران وتوویانە کە ئەم ئایەتە دەربارەی عوسمانی کوڕی تەڵحەی کوڕی ئەبی تەڵحە هاتووەتە خوارەوە کە ناوی ئەبی تەڵحە عەبدوڵلای کوڕی عەبدولعیزی کوڕی عوسمانی کوڕی عەبدولداری کوڕی قوصەی کوڕی کیلابی قوڕەیشییە. عەبادەری حاجیبی کەعبەی پیرۆزە کە ئامۆزای شەیبەی کوڕی عوسمانی کوڕی تەڵحەیە کە حیجابە هەتا ئەمڕۆ لە نەوەکانیدایە ئەو عوسمانە لە نێوان هودنەی حودەیبیە و کردنەوەی مەککەدا موسڵمان بووە لەگەڵ خالیدی کوڕی وەلید و عەمری کوڕی عاص دا، بەڵام عوسمانی کوڕی تەڵحەی کوڕی ئەبی تەڵحە لە جەنگی ئوحوددا ئاڵای هاوبەشدانەرەکانی هەڵگرتبوو بە کافری کوژرا. ئەو نەسەبەمان بۆیە ڕوون کردەوە چونکە زۆر لە ڕاڤەکارانی قورئان ئەوەیان لێ تێك دەچێت، هەروەها هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە دەربارەی کاتێك بوو کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) کلیلەکانی کەعبەی لێ سەندەوە ڕۆژی کردنەوەی مەککە پاشان پێی دایەوە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەربارەی کردنەوەی شاری مەککەی پیرۆز دەڵێت: لە صەفییەی کچی شەیبەوە هاتووە وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە مەککە دابەزی و خەڵك دڵنیابوون هات هەتا گەیشتە کەعبە بەسەر وشترەکەیەوە حەوت جار بە دەوریدا سووڕایەوە و بە گۆچانەکەی ئاماژەی بۆ بەردە ڕەشەکە دەکرد، کاتێ سوورانەوەکەی تەواو کرد عوسمانی کوڕی تەڵحەی بانگ کرد کلیلەکانی کەعبەی لێوەرگرت و دەرگای کەعبەی بۆ کرایەوە چووە ناوی، کۆترێکی لە عیدان بینی بە دەستەکانی شکاندی و فڕییدایە دەرەوە، پاشان لە دەمی دەرگای کەعبەدا ڕاوەستا فەرمووی: "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، صدق وعده، ونصر عبده، وهزم الأحزاب وحده، ألا كل مأثرة أو دم أو مال يدعى، فهو تحت قدمى هاتين إلا سدانه البيت وسقاية الحاج". واتە: شایستەیەکی پەرستن نییە جگە لە خوای تاك و تەنها و بێ هاوبەش، پەیمانەکەی بەراست گێراو، بەندەکەی خۆی سەرخست و پارتەکانی بەتەنها لەناوبرد، بزانن هەموو تۆڵەسەندن یان خوێنێك یان ماڵێکی داوای بکرێ لە ژێر ئەم دوو پێیەی مندایە جگە لە مجەوەری ئەم ماڵە و ئاودان بە حاجیان، پاشان باسی وتارەکانی پێغەمبەری کردووە کە ئەو ڕۆژە فەرموویەتی: دەڵێت: پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە مزگەوتەکەدا دانیشت عەلی کوڕی ئەبی تالیب هەڵسا کلیلەکانی کەعبەی بەدەستەوەبوو وتی: ئەی نێردراوی خوا با حیجابە و سیقایە بەدەست ئێمە بێت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: عوسمانی کوڕی تەڵحە لە کوێیە؟ بۆیان بانگ کرد پێی فەرموو: ئەوە کلیلەکانتە ئەی عوسمان، ئەمڕۆ ڕۆژی وەفا و چاکەیە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئیبنو جورەیجەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی عوسمانی کوڕی تەڵحە هاتۆتە خوارەوە کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کلیلەکانی کەعبەی لێوەرگرت ڕۆژی کردنەوەی مەککە و چووە ناوی کە هاتە دەرەوە ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ عوسمانی بانگ کرد و کلیلەکانی دایەوە دەستی، عومەری کوڕی خەتتاب کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە کەعبە هاتە دەرەوە ئەو

ئایەتەی دەخوێندەوە وتی: دایك و باوكم بە فیدات بن لەوەو پێش گوێم لێی نەبووە ئەو ئایەتە بخوێنی.

لە زوهرییەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کلیلەکانی دایەوە دەستی و فەرمووی: یارمەتی بدەن.

ئیبنو مەردەویە لە ڕێگای کەلبییەوە لە ئەبی سالحەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) مەککەی کردەوە عوسمانی کوڕی تەلحەی بانگ کرد فەرمووی: "کلیلەکەم نیشان بدە" ئەویش بۆی هێنا کاتێ دەستی درێژ کرد عەباس بۆی هەڵساو وتی: ئەی نێردراوی خوا دایك و باوكم فیدات بێ ئەوەم لەگەڵ ئاودان پێ ببەخشە، عوسمان دەستی بردە دواوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: کلیلەکەم نیشان بدە، عوسمان دەستی درێژ کرد کلیلەکانی بداتێ عەباس قسەکانی پێشووی دووبارە کردەوە، عوسمانیش دەستی گێڕایەوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەی عوسمان ئەگەر باوەڕت هەیە بە خوا و ڕۆژی دوایی ئەو کلیلەم بدەرێ" عوسمانیش وتی: ئەوەتا بە ئەمانەتی خوا، ئەڵێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەڵساو دەرگای کەعبەی کردەوە بینی لەناو کەعبەدا هەیکەلێکی ئیبراهیمی (سلاوی خوای لێ بێت) تێدایە لەگەڵ پەرداخێکدا بۆ پشك خستن، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: هاوبەشدانەرەکان چ پەیوەندییەکیان هەیە بە ئیبراهیم و ئەم پەرداخەوە خوا بیانکوژێ"، پاشان داوای قاپێ ئاوی کرد، ئاوەکەی وەرگرت و دەستی خستە ناو ئاوەکە و پاشان ئەو هەیکەلانەی تێدا نوقوم کرد، پاشان مەقامی ئیبراهیم کە لەناو کەعبەدا بوو دەرهێنا و لچکاندی بە دیواری کەعبەوە، پاشان فەرمووی: ئەی خەڵکینە ئەو قیبلەیە، ئەڵێ: پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هاتە دەرو بەدەوری کەعبەدا سوڕایەوە کایەیەك بوو یان دوان بوو، پاشان جوبرائیل هاتە خوارەوە بۆ لای وەك بۆمان باسکراوە دەربارەی گێڕانەوەی کلیلەکە بووە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُكُمۡ أَن تُؤَدُّواْ ٱلۡأَمَٰنَٰتِ إِلَىٰٓ أَهۡلِهَا﴾ هەتا لە ئایەتەکە بووەوە.

ئەو لەو شتە بەناوبانگەیە کە ئەو ئایەتە دەربارەی هاتۆتە خوارەوە، جا

دەربارەی ئەوە هاتبێتە خوار یان نا حوکمەکەی گشتییە لەبەر ئەوە ئیبنو عەباس و موحەممەدی حەنەفییە وتوویانە: ئەو ئایەتە بۆ تاوانبار و چاکەکارە واتە ئەوە فەرمانە بۆ هەموو کەس.

﴿وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾ ئەمە فەرمانێکە لە خوای بەرزەوە بۆ حوکم کردن لە نێوان خەڵکیدا بە دادپەروەری، لەبەر ئەوە موحەممەدی کوڕی کەعب و زەیدی کوڕی ئەسلەم و شەهری کوڕی حەوشەب وتوویانە: ئەم ئایەتە دەربارەی کاربەدەستەکان هاتۆتە خوارەوە واتە ئەوانەی حاکمن لە نێوان خەڵکدا لە فەرموودەدا هاتووە کە "إن الله مع الحاكم ما لم يَجُرْ، فإذا جار وكله إلى نفسه" خوا لەگەڵ حامدایە هەتا ستەم نەکات کە کەوتە ستەمکردن وازی لێ دێنێ. لە بۆماوەدا هاتووە: "عدل يوم كعبادة أربعين سنة"، واتە: دادپەروەری یەك ڕۆژ ئەوەندەی چل ساڵ خواپەرستی خێری هەیە.

﴿إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ﴾ واتە بەوەی فەرمنتان پێدەدات کە ئەمانەت بدەنەوە بە خاوەنی و حوکم کردن لە نێوان خەڵکدا بە عەدالەت و جگە لەوانە لە فەرمانەکانی و شەریعەتە تەواوە گەورەکەی کە هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

﴿إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ واتە گوێبیستی قسەکانتانە و چاوی لە کردەوەکانتانە.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: ئەگێڕنەوە کە ئەبی هورەیرە: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا﴾ إلى قوله: ﴿إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُم بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ی دەخوێندەوە پەنجە گەورەکەی دەخستە سەر گوێی و ئەوەی دوای ئەوە دەخستە سەرچاوەکانی و دەشیوت بەوشێوەیە گوێم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بوو دەیخوێندەوەو پەنجەکانی دەخستە سەر ئەوانە.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ ۚ ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا (٥٩)﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان بەرفەرمانی خودا و پێغەمبەری خوا و کاربەدەستانی خۆتان بن هەرکاتێکیش لەسەر شتێ لە نێوخۆدا پێك نەهاتن، ئەگەر بڕواتان بە خودا و بە ڕۆژی قیامەت هەیە، کێشەی خۆتان حەواڵەی خوا و پێغەمبەری خودا بکەن، ئەم کارە بۆتان باشترە و ئاکامی چاکتری هەیە.

بوخاری وتویەتی: ئیبنو عەباس دەربارەی ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُوْلِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ وتوویەتی: دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی حوزافەی کوڕی قەیس هاتۆتە خوارەوە کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بەسەرکردایەتی لەگەڵ سریەیەکدا ناردوویەتی.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پۆلێك لە هاوەڵانی ڕەوانەکرد بە سەرکردایەتی پیاوێکی ئەنصاری کاتێ چوونە دەر لەسەر شتێك تێکچوون وتی: ئەی پێغەمبەری خوا (دروودی خوای لێ بێت) فرمانی پێنەکردوون بەرفەرمانم بن؟ وتیان: بەڵێ، وتی: دار و چیلکەم بۆ کۆبکەنەوە، پاشان داوای ئاگری کرد و ئاگری تێبەردا، پاشان وتی: ئەمەوێ خۆتانی تێ فڕێ بدەن، کۆمەڵەکە خەریك بوو خۆیانی تێ فڕێ بدەن، لاوێك لە ناویاندا وتی: ئێوە لە ئاگر هەڵاتوون کە چوونە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پەلە مەکەن هەتا دەگەنەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەگەر ئەو فەرمانی پێدان بچنە ناوی، بچنە ناوی، ئەڵێ: کە گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەواڵیان پێدا پێی وتن: ئەگەر بچونایەتە ناوی هەرگیز لێی نەئەهاتنە دەرەوە، چونکە بەرفەرمانی لە چاکەکردندا دەکرێ. (هەردوو شێخ دەریان هێناوە).

ئەبو داود وتوویەتی: نافیع لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: «السمع والطاعة على المرء المسلم فيما أحب وكره، ما لم يؤمر بمعصية، فإذا أمر بمعصية فلا سمع ولا طاعة». واتە: گوێڕایەڵی و بەرفەرمانی کردن لەسەر مرۆڤ پێویستە پێی خۆش بێت یان پێی ناخۆش بێت هەتا فەرمان بە خراپە نەکرێ، کە فەرمان بە خراپە کرا نەگوێڕایەڵی دەمێنێ نە بەرفەرمانی کردن.

وە لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە هاتووە وتوویەتی: پەیمانمان دا بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کە گوێڕایەڵ و بەرفەرمان بین پێمان خۆش بێت یان پێمان ناخۆش لە تەنگانە و خۆشیدا وە پێش بەرژەوەندی خۆمانی بخەین، وە کێشەمان نەبێت لەگەڵ کاربەدەستاندا وتوویەتی: مەگەر بێ باوەڕی ببینن کە لە خواوە بورهانی لەسەر بێت" (اخرجاه).

لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "اسمعوا وأطیعوا وإن أمر علیکم عبد حبشی کأن رأسه زبیبة". رواه البخاری واتە: گوێڕایەڵ و بەرفەرمان بن با بەندەیەکی حەبەشی ئەمیرتان بێت سەری وەك مێوژ وابێت.

لە ئەبو هورەیرەوە هاتووە وتوویەتی: خۆشەویستەکەم فەرمانی پێکردم گوێڕایەڵ و بەرفەرمان بم با عەبدێکی حەبەشی لوت بڕاو بێتە ئەمیرم (رواه مسلم).

لە ئوم حوسەینەوە هاتووە وتوویەتی: گوێم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بوو لە حەجی ماڵئاواییدا دەیفەرموو: "ولو استعمل علیکم عبد یقودکم بکتاب الله، اسمعوا له وأطیعوا" ئەگەر کۆیلەیەك سەرۆکیتان بکات بە کتێبەکەی خوا ئێوە گوێڕایەڵ و بەرفەرمانی بن.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "سیلیکم بعدی ولاة، فیلیکم البر ببره، ویلیکم الفاجر بفجوره، فاسمعوا لهم وأطیعوا فی کل ما وافق الحق، وصلوا وراءهم، فإن أحسنوا فلکم ولهم وإن أساءوا فلکم وعلیهم"، دوای من کۆمەڵێ ئەبنە سەرپەرشتییکارتان، چاك بە چاکەکەیەوە تاوانبار بە تاوانەکەیەوە، ئێوە گوێڕایەڵ و بەرفەرمانیان بن لە هەموو ئەوانەدا کە ڕێك دەکەوێ لەگەڵ هەقدا و لە دوایانەوە نوێژ بکەن، ئەگەر چاکەیان کرد بۆ ئێوەو بۆ ئێوەشە، ئەگەر خراپەیان کرد بۆ ئێوە لەسەر ئەوانە.

لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "بەنی ئیسرائیل پێغەمبەریان بۆ ئەنێردرا هەر کاتێ پێغەمبەرێك بمردایە

پێغەمبەرێکی تر ئەنێردرا بۆیان، بەڵام دوای من پێغەمبەری تر نییە، بەڵام جێنشین دێن و زۆریش دەبن، وتیان ئەی نێردراوی خوا: تۆ فەرمانی چیمان پێدەدەیت؟ فەرمووی: "وەفا بە بیەعەتی یەکەم بکەن و مافی خۆیان بدەنێ خوا دەربارەی ئەوەی داوێتییە دەستیان لێیان دەپرسێتەوە". (اخرجاه)

هەروەها لە ئیبنو عەباسەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من رأى من أميره شيئًا فكرهه فليصبر، فإنه ليس أحد يفارق الجماعة شبرا فيموت إلا مات ميتة جاهلية". (أخرجاه) هەر کەس لە ئەمیرەکەی شتێکی بینی لای ناخۆش بوو با ئارام بگرێ، چونکە هەر کەس لە کۆمەڵ جیابێتەوە بمرێ بە مردنی سەردەمی نەزانی مردووە.

هەروەها لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە کە گوێبیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووە فەرموویەتی: "من خلع يدا من طاعة، لقى الله يوم القيامة لا حجة له، ومن مات وليس فى عنقه بيعة مات ميتة جاهلية". (رواه مسلم)

هەر کەس دەستی لە بەرفەرمانی سەرۆکی کێشایەوە ڕۆژی قیامەت کە دەگاتەوە بە خوا بەڵگەی بەدەستەوە نییە، هەر کەس بمرێ و بەیعەتی بەکەس نەکردبێ وەك لە سەردەمی نەزانیدا مردبێ وایە.

موسلیم لە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەبدی رب الكعبەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: چووم بۆ مزگەوت سەیرم کرد عەبدوڵڵای کوڕی عەمری کوڕی عاص لە سێبەری کەعبەدا دانیشتبوو خەڵکیش لە دەوری کۆبووبوونەوە، منیش چووم دانیشتم ئەیوت: لەسەفەرێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) بووین لە شوێنێك لاماندا، هەمان بوو چادرەکەی چاك دەکرد، هەمان بوو گوێی پێ نەئەدا، هەمان بوو لە شوێنەکەی خۆیدا بوو، لەو کاتەدا یەکێك هاواری کرد وتی: "الصلاة جامعة" ئێمەش چووین بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "پێغەمبەر نەبووە لە پێش مندا لەسەری پێویست نەبوایە کە نەتەوەکەی بخاتە سەر ئەو خێرەی فێری بوو و بیانترسێنێ لەو شەڕەی کە دەیزانی، بەڵام ئەم نەتەوەیەی ئێوە چاکێتییەکەی لە سەرەتاکەیدایە، بەڵام کۆتاییەکەی تووشی بەڵا دەبێ و تووشی چەندەها کار و

فەرمان دەبێ کە ئینکاری لێ دەکەن و فیتنە بە دوای یەکدا دێت باوەڕدار دەڵێت ئەوە لەناوچوونمی تێدایە، پاشان ئەوە دەڕواو فیتنەیەکی دیکە دێ باوەڕ دەڵێت ئەوە ئەوەیە، جا هەر کەس حەز دەکات لە ئاگر ڕزگاری بێت و بچێتە بەهەشتەوە کاتێ دەمرێ ئەو باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی دەبێ و دێت بۆ ئەو خەڵکەی حەز دەکات بۆی بێت، هەر کەس بەیعەتی دا بە ئیمامێك با هەتا ئەتوانێ بەرفەرمانی بێت، ئەگەر یەکێکی تر کردی بە کێشە لەگەڵیا لە ملی بدەن"، ئەڵێ: لێی نزیك بوومەوە پێم وت: سوێندت دەدەم بە خوا خۆت ئەوەت بیستووە لە پێغەمبەر؟ پەلاماری هەردوو گوێی و دڵی دا بە بەدەستەکانی وتی: بەم گوێیانە لێم بیستووە و بەم دڵەم ئاگاداری بووم، ئەڵێ: پێم وت: ئەوە موعاویەی ئامۆزاتە فەرمان پێ دەدا کە ماڵ و سامانی یەکتری بخۆین بە باتڵ و خۆمان بکوژین خوایش دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأۡكُلُوٓاْ أَمۡوَٰلَكُم بَيۡنَكُم بِٱلۡبَٰطِلِ إِلَّآ أَن تَكُونَ تِجَٰرَةً عَن تَرَاضٖ مِّنكُمۡۚ وَلَا تَقۡتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمٗا﴾ [النساء: ٢٩] ئەڵێ: ماوەیەك بێ دەنگ بوو، پاشان وتی: ئەگەر لە شتێکدا بەرفەرمانی خوای کرد تۆش بەرفەرمانی بکەو ئەگەر سەرپێچی خوای کرد تۆش سەرپێچی بکە.

فەرمووده لەوبارەوە زۆرە: ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە سوودییەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی: (درروودی خوای لێ بێت) وتوویەتی: پێغەمبەر (درروودی خوای لێ بێت) بە سەرکردایەتی خالیدی کوڕی وەلید سریەیەکی ڕەوانە کرد لەناویاندا عەمماری کوڕی یاسری تێدابوو، بەرەو رووی ئەو قەومە ڕۆیشتن کە مەبەستیان بوو کاتێ گەیشتنە نزیکیان ذولعەینین چوو هەواڵی دانێ کە ڕۆژ بووەوە هەڵاتن جگە لە پیاوێك کە خێزانەکەی وتبوو شتوومەکەکانیان کۆکردەوە بەتاریکیی هات بۆ ناو سەربازگەکەی خالید، هەواڵی عەمماری کوڕی یاسری پرسی ئەویش چوو بۆ لای وتی: ئەی ئەبا یەقظان من موسڵمان بووم و شایەتی ئەدەم کە شایستەیەکی پەرستن نییە جگە لە خوای تاك و تەنها و موحەممەد بەندەو نێردراوی ئەوە، بەلام قەومەکەم بەئێوەیان زانی هەڵاتن، بەلام من مامەوە ئایا ئەو موسڵمان بوونەم سوودی هەیە بۆ پاشەڕۆژم، ئەگینا

منیش هەڵدەهاتم؟ عەممار وتی: بەڵێ سوودی هەیە بمێنەرەوە، ئەویش لە شوێنی خۆی مایەوە کاتێ ڕۆژ بووەوە خالید هێرشی کردە سەریان سەیری کرد لەو پیاوە بەولاوە کەسی لێ نەماوە، خالید گرتی وماڵەکەشی برد، هەواڵەکە گەیشتە عەممار، هات بۆ لای خالید و پێی وت: ئەو کابرایە بەڕاستی موسڵمان بووە و لە پەنای مندایە، خالید پێی وت: بۆچی تۆ پەنات داوە؟ قسەیان بە یەك وت و داواکەیان بەرزکردەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ڕێی بە پەنادانەکەی عەممار داو فەرمووی: جارێکی تر شتی وا مەکە، کاتێ عەممار قسەی بە خالید دەوت، خالید وتی: ئەو بەندە گوێ بڕاوەت بەرەڵا کردووە جوێنم پێ بدا، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەی خالید قسە بە عەممار مەڵێ، چونکە قسە بە عەممار بڵێی خوا قسەی پێ دەڵێ و هەر کەس ڕقی لێی بێ خوا ڕقی لێی دەبێ، هەر کەس لەحنەت لە عەممار بکات خوا لەحنەتی لێ دەکات»، عەممار تووڕەبوو هەڵسا ڕۆیشت، خالید شوێنی کەوت و کراسەکەی گرت و داوای لێبوردنی لێکرد، ئەویش ڕازی بوو خوای گەورە ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ی ناردە خوارەوە.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە ﴿وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ مانای ئەهلی فیقهو ئاینە، موجاهید و عەتا و حەسەن و ئەبو عالیە وتوویانە: واتە: زانایان، بەڵام وەك دەردەکەوێ خوایش دەزانێ هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە کاربەدەستن و زانان، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَوْلَا يَنْهَاهُمُ الرَّبَّانِيُّونَ وَالْأَحْبَارُ عَن قَوْلِهِمُ الْإِثْمَ وَأَكْلِهِمُ السُّحْتَ﴾ [المائدة: ٦٣]، هەروەها فەرموویەتی: ﴿فَاسْأَلُوا أَهْلَ الذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ [النحل: ٤٣].

لە فەرموودەی سازدا کە بوخاری و موسلیم لەسەری ڕێکن هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: «من أطاعني فقد أطاع الله، ومن عصاني فقد عصا الله، ومن أطاع أميري فقد أطاعني، ومن عصا أميري فقد عصاني» واتە: هەر کەس بەرفەرمانی من بێت ئەوە بەرفەرمانی خوایە وە هەر کەس سەرپێچی لە فەرمانی من بکات ئەوە سەرپێچی لە فەرمانی من کردووە هەر کەس بەرفەرمانی ئەمیری من بکات، ئەوە

بەرفەرمانی منی کردووە و هەر کەس سەرپێچی لە فەرمانی ئەمیرەکەم بکات ئەوە سەرپێچی لە فەرمانی من کردووە، ئا ئەوە فەرمانبەر فەرمانی کردنی زانایان و سەرکردەکانە لەبەر ئەوە خوا فەرموویەتی: ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ﴾ واتە: شوێن کتێبەکەی بکەون ﴿وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ واتە: لە سوننەتەکانی بڕۆن ﴿وَأُولِي الْأَمْرِ مِنكُمْ﴾ لەوانەدا بەرفەرمانیان بن کە چاکەیە نەك لە سەرپێچیکردندا، چونکە بەرفەرمانی هیچ کەس ناکرێ بۆ سەرپێچی کردنی خوا وەك لە فەرموودەی سازدا هاتووە (إنما الطاعة فی معروف).

﴿فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللَّهِ وَالرَّسُولِ﴾ موجاهید و چەند کەسی دیکە لە پێشینەکان وتوویانە: واتە بیگێڕنەوە بۆ قورئان و سوننەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەمە فەرمانێکە لە خوای بەرز و شکۆمەندەوە کە کێشە لەسەر هەرچی دروست بوو لە بنەماکانی ئایندا و لە لقەکانیدا کە بگێڕرێتەوە بۆ قورئان و سوننەت وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ﴾ [الشورى: ١٠]، هەرچی قورئان سوننەت حوکمیان لەسەر داو شایەتی ڕاستی بوون ئەوە هەقە، دوای هەقیش جگە لە گومڕایی هیچی تر نییە. لەبەرئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ﴾ واتە هەرچی نەزانی و تێکچوون هەیە بیگێڕنەوە بۆ کتێبەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر کەس قورئان و سوننەت نەکاتە ناوبژیوان لەسەر ئەوانەی کە ناکۆك دەبن ئەو کەسە باوەڕدار نییە بە خوا و بە ڕۆژی دوایی: ﴿ذَٰلِكَ خَيْرٌ﴾ واتە: قورئان و سوننەت کردنە ناو بژیوان و گەڕانەوە بۆیان خێرە، ﴿وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا﴾ واتە: عاقیبەتی چاکی هەیە.

سوودی و چەند کەسی تر وتوویانە: موجاهید وتوویەتی: چاکترین پاداشتی هەیە ئەوەش نزیکە لە پێکانی ڕاستەوە.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُوا بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوا إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوا أَن يَكْفُرُوا بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾ وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ تَعَالَوْا إِلَىٰ مَا أَنزَلَ اللَّهُ وَإِلَى الرَّسُولِ رَأَيْتَ الْمُنَافِقِينَ يَصُدُّونَ

عَنكَ صُدُودًا ﴿٦١﴾ فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ
أَيْدِيهِمْ ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا ﴿٦٢﴾
أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى قُلُوبِهِمْ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَعِظْهُمْ
وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا ﴿٦٣﴾

واتە: ئەدی ئەوانەت نەدیوە وایان خۆهەڵخستووەتەوە بەو قورئانەی بۆ تۆ هاتۆتە خوارەوەو بەو کتێبەش کە بەرلە تۆ ناردراوە، بڕوا دەکەن، دەشیانەوێ کێشەیان بەرنە لای تاغوت فەرمانیشیان پێدراوە، حاشای لێبکەن، دیارە شەیتان وای گەرەکە بە یەکجاری لە ڕێگەیان هەڵە بکا، ئەگەر بێتو پێیان بڵێن: وەرنە لای ئەم قورئانەوە کە خوا ناردوویەتی خوارێ و وەرنە لای ئەم پێغەمبەرە، دورازەکان دەبینی کە زۆر بە توندی ڕوویان لە تۆ وەردەگێڕن، ئەدی چۆنە کە ئەوانە لەسەر کاری خۆیان دەیکەن هەرکات تووشی بەلایەك بوون دێنە لات و بە خوا سوێند دەخۆن کە ئێمە بە نیازی چاکەکردن و نێوان خۆشی ئەو کارەمان ڕەچاو کرد، خوا دەزانێ ئەوانە چیان لە دڵدایە ئەتۆ هەر وازیان لێ بێنە و ئامۆژگاریان کەو تەرزێکی وایان بدوێنە دڵیان بەرەو خۆت ڕاکێشی.

ئەوە ئینکاری کردنێکە لە لایەن خواوە بەرامبەر کەسانێك دەڵێن ئێمە باوەڕمان هەیە بەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) و بۆ سەر پێغەمبەرانی پێشووش، لەگەڵ ئەوەشدا ئەیەوێت بۆ جیاکردنەوەی کێشەو گێرەکان پەنا بباتەبەر غەیری کتێبەکەی خوا و سوننەتی پێغەمبەرەکەی وەك باسکراوە لە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەدا کە دەربارەی پیاوێکی ئەنصاری و پیاوێکی جولەکە لە مەدینە کە کێشەیەك کەوتە نێوانیان، جولەکەکە دەیوت: با موحەممەد لە نێوانماندا بێت کێشەکەمان بۆ چارەسەر بکات، بەڵام ئەویتریان ئەیوت: با کەعبی ئەشرەف بکەوێتە نێوانمان.

هەروەها وتراوە دەربارەی کۆمەڵێك لە دوو ڕووەکان ئەوانەی وا خۆیان دەرخستووە موسڵمانن، هاتۆتە خوارەوە، کاتێ ئەیانویست کە ناوبژیوانەکانی

سەردەمی نەزانی بکەنە ناوبژیوان لە نێوان خۆیاندا، جگە لەوەش وتراوە، بەڵام ئایەتەکە لەوە گشتیی ترە، چونکە ئایەتەکە زەمی هەموو ئەوانە دەکات کە لە کیتاب و سوننەت لا ئەدەن و جگە لەو دوانە ئەکەنە ناوبژیوانی خۆیان بە باتڵ. مەبەست لە تاغوت لێرەدا ئەوەیە لەبەر ئەوەی فەرموویەتی: ﴿يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓاْ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ﴾ هەتا کۆتایی، وە کە دەفەرمووێت: ﴿يَصُدُّونَ عَنكَ صُدُودًا﴾ واتە: پشتت تێ ئەکەن وەك خۆبەزلزانەکان وەك خوای گەورە دەربارەی هاوبەشدانەرەکان دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱتَّبِعُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ قَالُواْ بَلْ نَتَّبِعُ مَا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَآ﴾ [لقمان: ٢١].

ئەوانە بە پێچەوانەی ئەو باوەڕدارانەوەن کە خوا دەربارەیان دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا﴾ [النور: ٥١].

پاشان خوای گەورە زەمی دووڕووەکان دەکات و دەفەرمووێت: ﴿فَكَيْفَ إِذَآ أَصَٰبَتْهُم مُّصِيبَةٌۢ بِمَا قَدَّمَتْ أَيْدِيهِمْ﴾ ئەی چۆن دەبێ کاتێ قەدەر رایان بماڵێ بۆ لای تۆ موسیبەت دەرگایان بکوتێ بەهۆی تاوانە کانیانەوە، وە بۆ ئەوەی پێویستییان بە تۆ هەبێت ﴿ثُمَّ جَآءُوكَ يَحْلِفُونَ بِٱللَّهِ إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا﴾ واتە: عوزرت بۆ دەهێننەوە و سوێند دەخۆن مەبەستمان لە چوونمان بۆ لای غەیری تۆ و دوژمنەکانی تۆمان کردە ناوبژیوان تەنها بۆ چاکە و سەرخستن بوو، واتە بۆ مودارات بوو، نەك باوەڕمان وابووبێ کە ئەوان راستتر بوون، وەك خوای گەورە لە فەرمایشی: ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِى قُلُوبِهِم مَّرَضٌ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمْ يَقُولُونَ نَخْشَىٰٓ﴾ إلى قولـه: ﴿فَيُصْبِحُواْ عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ نَٰدِمِينَ﴾ [المائدة: ٥٢]. هەواڵی ئەوانەمان پێ ئەدا.

تەبەرانی وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئەبو زەڕی ئەسلەمی کاهینێك بوو ناوبژیوانی نێوان جولەکەکانی دەکرد کاتێ تووشی کێشە و گێرەی ناوخۆیان بونایە، چەند کەسیش لە موسڵمانان دەچوون بۆ لای، خوای گەورە ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُواْ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ ی نارده خوارەوە هەتا ﴿إِنْ أَرَدْنَآ إِلَّآ إِحْسَٰنًا وَتَوْفِيقًا﴾.

پاشان خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَعْلَمُ ٱللَّهُ مَا فِى

﴿قُلُوبِهِمْ﴾ ئەو جۆرە کەسانە مونافیق بوون خوا ئەیزانی چی لە دڵیانایە لەسەر ئەوە سزایان دەدات، چونکە خوا هیچی لێ ناشاررێتەوە، ئەی موحەممەد وازیان لێ بهێنە هەر خوا زانایە بەوانەی لە دڵ و دەروونیاندایە و بەوانەی ئاشکرا دەکەن، لەبەر ئەوە پێی فەرمووە: ﴿فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ واتە: توندوتیژی مەنوێنە بەرامبەر ئەوەی لە دڵیاندایە ﴿وَعِظْهُمْ﴾ واتە: ئامۆژگاریان بکەو ئەوە قەدەغە بکە لێیان کە لە دڵیاندایە لە نیفاق و شەڕی شاراوە ﴿وَقُل لَّهُمْ فِىٓ أَنفُسِهِمْ قَوْلًۢا بَلِيغًا﴾ واتە: لە نێوان خۆت و خۆیاندا ئامۆژگارییان بکە بە قسەی کاریگەری لوت شکێن.

﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُوا۟ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُوا۟ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا ﴿٦٤﴾ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾﴾

واتە: هەر کەسێکمان بە پێغەمبەری ناردووە، بۆیە بووە بە پێغەمبەر کە بە خەڵك رابگەیەنێ، بە ئیزنی خودا دەبێ فەرمانی قبوڵ بکەن، جا ئەمانەش لە پاش ئەوەی کە ئەو غەدرەیان لە خۆ کرد، گەر بهاتبانەوە لای تۆ و داوای خودالێخۆشبوونیان بکردایە بێگومان ئەوسا دەیانزانی کە خوا پەشیمانییەکەیانی قبوڵ دەکا و دلۆڤانە. بەڵام نەخێر، سوێندەکە بە پەروەرندەی تۆ، نابنە خاوەنی بڕوا مەگەر وەختێ کە لە کێشە و هەرای نێوان خۆیان بتکەنە قازی و لە دڵەوە بەهرە فەرمانێ تۆ بیدەی ڕەدایان بێ و بە تەواوی ملکەچی بن.

خوای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ﴾ واتە: بەرفەرمان بوونی فەرز کراوە لەسەر ئەوانەی نێردراوەکەن بۆ نێردراوە ﴿بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ موجاهید وتوویەتی: واتە بەفەرمانی من نەبێ کەس بەرفەرمانی ناکرێ، ئەوانە نەبێ کە نەبێ کە تەوفیقم داون بەرفەرمانی

پێغەمبەر ناکەن وەك ئایەتی: ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ ٱللَّهُ وَعْدَهُۥٓ إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِۦ﴾ [آل عمران: ١٥٢] واتە بەرفەرمان و توانا و ویست و زاڵبوونی بەسەرتاندا.

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ﴾ خوای بەرز ڕێنمایی سەرپێچیکاران و تاوانباران دەکات کاتێ تاوان و سەرپێچییەکی لێ ڕوودان بێن بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لای ئەو داوای لێبوردن لەی خوا بکەن و داوای لێ بکەن کە ئەویش داوای لێبوردنیان بۆ بکات.

﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾ جا کاتێ ئەوەیان کرد خوا تۆبەیان لێوەردەگرێ و ڕەحمیان پێدەکات و لێیان خۆش دەبێت، لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾.

کۆمەڵێك دەگێڕنەوە لەوانە شێخ ئەبو نەصری کوڕی صەباح لە کتێبەکەیدا بەناوی (الشامل) بەسەرهاتێکی بەناوبانگ لە عوتباوە وتوویەتی: لای گۆڕەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دانیشتبووم عەرەبێکی دەشتەکی هات وتی: سڵاوت لێ بێ ئەی نێردراوی خوا بیستومە کە خوا دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ إِذ ظَّلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمْ جَآءُوكَ فَٱسْتَغْفَرُواْ ٱللَّهَ وَٱسْتَغْفَرَ لَهُمُ ٱلرَّسُولُ لَوَجَدُواْ ٱللَّهَ تَوَّابًا رَّحِيمًا﴾. ئەوەتە هاتووم داوای لێبوردنی تاوانەکانم دەکەم لە خوا و تۆ دەکەم بە تکاکار لای پەروەردگارم، پاشان ئەم دێڕە هۆنراوەیەی وت:

یا خیرَ من دُفِنَتْ بالقاعِ أعْظُمُهُ
فطابَ من طيبهنَّ القاعُ والأَكَمُ
نَفْسي الفداءُ لقبرٍ أنتَ ساكِنُهُ
فيه العفافُ وفيه الجودُ والكرمُ

پاشان عەربە دەشتەکییەکە ڕۆیشت چاوم چووە خەو لە خەومدا پێغەمبەرم (درودی خوای لێ بێت) بینی فەرمووی: ئەی عوتبا بگە بە عەرەبە دەشتەکییەکە مژدەی بدەرێ کە خوا لێی بوورا".

کـە دەفـەرمـوویـت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾ خوای بەرز سوێند بە نەفسی پیرۆزی خۆی دەخوات کە کە کەس نابێتە باوەڕدار هەتا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نەکاتە ناوبژیوان لە هەموو کاروبارێکدا هەرچی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) حوکمی دا هەقە و ئەبێ بە زاهیر و باتن ملکەچی بێت، لەبەر ئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا﴾، واتە: کاتێ تۆیان کردە قازی خۆیان لە دڵەوە بەرفەرمانیت دەکەن بێ ئەوەی لایان ناخۆش بێت هەرچۆنێك حوکمت دابن، لە زاهیر و باتن ملکەچی فەرمانەکانی دەکەن و خۆیان تەسلیم دەکەن بە تەواوەتی بێ بەرهەڵست و پاڵپێوەنان و بێ کێشەو گێرە وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "والذی نفسی بیده لا یؤمن أحدکم حتی یکون هواه تبعا لما جئت به". بەوەی گیانی منی بەدەستە کەستان باوەڕداری تەواو نابێت هەتا ئارەزووەکان بە شوێن ئەوەوە نەبن کە من پێی هاتووم.

بوخاری وتوویەتی: لە عەروەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: زوبێرو پیاوێك لە (شراج)دا لە (حەرە) کێشە کەوتە نێوانیان، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەی زوبێر ئاوی باخەکەت بدەو پاشان ئاوەکە بەرەڵڵا بکە بۆ دراوسێکەت، کابرای ئەنصاری وتی: ئەوە لەبەرئەوەیە کە کوڕی پورتە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) سەروچاوی سوور هەڵگەڕا، پاشان فەرمووی: ئەی زوبێر باخەکەت ئاو بدە، پاشان ئاوەکە بگرەرەوە هەتا ئەگەڕێتەوە ناو دیوارەکان، پاشان ئاوەکە بەرەڵڵا بکە بۆ دراوسێکەت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە حوکمە صەریحەکەیدا مافی خۆی دا بە زوبێر کاتێ ئەنصارییەکە مافەکەی پاراست، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئاماژەی بە فەرمانێ پێکردن لەوبارەوە کە بەرفراوانی تێدا بوو، زوبێر وتی: وابزانم ئەم ئایەتە دەربارەی ئەوە هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾.

باسی هۆیەکی دیکە کە زۆر غەریبە: ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: یونسی کوڕی عبدالاعلی بۆی گێڕاینەوە لە ئیبنو وەهەبەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی لەهیعەوە لە ئەبی ئەسوەدەوە وتوویەتی: دوو کێشەیەکیان لە نێوانیاندا

دروست بوو، هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کێشەکەی بۆ چارەسەرکردن، ئەوەی حوکمەکەی بەسەردا درا وتی: بمان نێرە بۆ لای عومەری کورشی خەتاب، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: بەڵێ، ئەوانیش ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای عومەر (ڕەزای خوای لێ بێت) پیاوەکە وتی: ئەی کوڕەکەی خەتتاب، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) حوکمی بۆ داوم بەسەر ئەمەدا، کەچی وتی: بمان نێرە بۆ لای عومەر کوڕی خەتاب، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ناردینی بۆ لای تۆ، عومەر وتی: ئایا وایە؟ وتی: بەڵێ، عومەر وتی: لێرەدا بوەستن هەتا دێمەوە بۆ لاتان ئەبمە قازیتان، پاشان عومەر هاتەوە بۆ لایان شمشێرەکەی هەڵکێشابوو لەملی ئەوەیانی دا کە وتبووی ڕەوانەی لای عومەرمان بکە کوشتی، ئەویتریان ڕای کردەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا بە خوا عومەر هاوەڵەکەمی کوشت، ئەگەر منیش ڕام نەکردایە منیشی دەکوشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: باوەڕم نەدەکرد عومەر بوێرێ پیاوێکی باوەڕدار بکوژێ، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ﴾.
بەو شێوەیە خوای گەورە کوشتنی ئەو پیاوەی بە ڕەوا دانا و عومەری بەری کرد، ئەمەش بۆماوەیەکی غەریب و مورسەلە، ئیبنو لەهیعەش لاوازە، ئیتر خوا دەزانێ.

﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُواْ مِن دِيَٰرِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْۖ وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُواْ مَا يُوعَظُونَ بِهِۦ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا ﴿٦٦﴾ وَإِذًا لَّأٓتَيْنَٰهُم مِّن لَّدُنَّآ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿٦٧﴾ وَلَهَدَيْنَٰهُمْ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّـۧنَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَآءِ وَالصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾ ذَٰلِكَ الْفَضْلُ مِنَ اللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِاللَّهِ عَلِيمًا ﴿٧٠﴾﴾

واتە: ئەگەر ئێمە بۆ ئەمانەمان نووسیبا کوشتاری خۆ بە خۆ بکەن، یان لە وڵات و دەرکەن و کەمیان نەبێ نەیاندەکرد، کەچی وەکو نەسیحەتیان دەکرا

کردبایان، بۆ ئەوان چاکی دەهێنا و باوەڕیشیان بە خودا پتەو تر دەبوو، ئەوسا ئێمەش لەلایەنی خۆمانەوە پاداشتێکی مەزنمان بەوان دەبەخشی، واشمان دەکرد کە لە ڕێگەی ڕاستی ئێمەش شارەزا بن، هەر کەسێکی بەرفەرمانی خودا و ئەم پێغەمبەرە بێ، دەبێتە هاوڕێی ئەوانەی خودا چاکەی لەگەڵ کردوون لە ریزی پێغەمبەران و خوداپەرستانی ڕاستی و شەهیدان و پیاوچاکەکان، چ هاوڕێیانێکی چاکیش بن ئەمانە! ئەم چاکەیە خودا دەربارەیان دەکا و خوایان بەسە کە بە کردەوەیان دەزانێ.

خوای گەورە هەواڵی داوە دەربارەی بەشی زۆری خەڵك کە ئەگەر فەرمانیان پێ بکرێت ئەو قەدەغەکراوانەی دەیکەن بیکەن، نەیان دەکرد، چونکە تەبعیان گەندەڵە و وادانراوە کە پێچەوانەی فەرمان کار بکەن، ئەوەش لە زانستی خوایە دەربارەی ئەوانەی بوون یان دەبن، لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ الایە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئەبی ئیسحاقی سەبعیەوە دەگێڕنەوە وتویەتی: کاتێ ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ هاتە خوارەوە پیاوێك وتی: ئەگەر فەرمانی پێ بکردینایە دەمان کرد، سوپاس بۆ ئەو خوایەی عافیەتی پێبەخشیوین، ئەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، ئەویش فەرمووی: "إن من أمتي لرجالا الإيمان أثبت في قلوبهم من الجبال الرواسي" لەناو نەتەوەکەمدا پیاوانێك هەن باوەڕیان لە دڵیاندا لە کێوە بەرزەکان چەسپاوترە.

ئیبنو ئەبی حاتیم دەگێڕێتەوە لە ئەعمەشەوە کە وتوویەتی: کاتێ ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ هاتە خوارەوە چەند کەسێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتیان: ئەگەر خوا ئەوەی بکردایە دەمان کرد، ئەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "لَلإيمان أثبت في قلوب أهله من الجبال الرواسي". باوەڕ لە دڵی خاوەن دا چەسپاوترە لە کێوی بڵند.

سوودی وتوویەتی: سابیتی کوڕی قەیسی شەماش و پیاوێکی جولەکە خۆیان بەسەریەکدا هەڵدەنا، جولەکەکە دەیوت: خوای گەورە خۆکوشتنی

لەسەر دانایین خۆمان کوشت، سابیتیش دەیوت: ئەگەر لەسەرمان بنووسرایە ﴿أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ خۆمان دەکوشت، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە.

ئیبنو ئەبی حاتیم لە عەبدوڵلای کوڕی زوبێرەوە ئەگێڕێتەوە وتوویەتی: کاتێ ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ أَوِ اخْرُجُوا مِن دِيَارِكُم مَّا فَعَلُوهُ إِلَّا قَلِيلٌ مِّنْهُمْ﴾ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەگەر بناردرایە خوارەوە ئیبنو ئومی عەبد لەوان دەبوو.

لە شورەیحی کوڕی عوبیدەوە هاتووە وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿وَلَوْ أَنَّا كَتَبْنَا عَلَيْهِمْ أَنِ اقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ﴾ الایە، ئاماژەی بۆ عەبدوڵلای کوڕی ڕەواحە کرد و فەرمووی: "ئەگەر خوا ئەوەی بنووسیایە ئەو پیاوە لەوانە دەبوو" واتە ئیبنو ڕەواحە.

لەبەر ئەوە خوا بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ أَنَّهُمْ فَعَلُوا مَا يُوعَظُونَ بِهِ﴾ واتە ئەگەر ئەوەیان بکردایە کە فەرمانیان پێ دەکرێ و وازیان لەوانە بهێنایە کە لێیان قەدەغە دەکرێ ﴿لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ﴾ خێر دەبوو بۆیان لەوەی پێچەوانەی فەرمانەکان کار بکەن و قەدەغەکراوەکان بکەن ﴿وَأَشَدَّ تَثْبِيتًا﴾، سوودی وتوویەتی: زۆرتر بە ڕاست دەگێڕا.

﴿وَإِذًا لَّآتَيْنَاهُم مِّن لَّدُنَّا﴾ واتە: لە لایەن ئێمەوە ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾ واتە: بەهەشت ﴿وَلَهَدَيْنَاهُمْ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿٦٨﴾﴾ واتە: لە دونیا و ئاخیرەتدا، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾ واتە: هەر کەس ئەوەی کرد کە خوای فەرمانی پێداوە بیکات وازی لەوانە هێنا کە خوا و پێغەمبەرەکەی کردنیان قەدەغە کردووە خوای بەرز و شکۆمەند لە خانەی کەرامەتدا جێنشینی دەکات و ئەیکاتە پیاوەری پێغەمبەران، پاشان یاوەری ئەوانەی کە لە پلەدا لە دوای پێغەمبەران دێن کە ئەوانیش ڕاستگۆیانن، پاشان شەهیدان و پیاوچاکان ئەوانەی نهێنییەکانیان چاکە و ئاشکرانیشیان هەر چاکە، پاشان ستایشیان دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا﴾.

بوخاری وتوویەتی: عەروە لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: گوێبیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووم ئەیفەرموو: "ما من نبی یَمْرَضُ إلا خُیِّر بین الدنیا والآخرة" واتە: پێغەمبەر نییە کە نەخۆش کەوتووە دراوەتە دەستی خۆی دونیا هەڵدەبژێری یان ڕۆژی دوایی. کاتێ گیانکێشانی نزیك بووەوە کۆکەیەکی توند گرتی و گوێم لێبوو دەیفەرموو: ﴿مَعَ ٱلَّذِینَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَیْهِم مِّنَ ٱلنَّبِیِّـۧنَ وَٱلصِّدِّیقِینَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِینَ﴾ لەگەڵ ئەوانەی تۆ نیعمەتەکانی خۆتت بەسەردا ڕشتوون لە پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدەکان و پیاوچاکان. ئەڵێ: زانیم خۆیان کردۆتە سەرپشك. موسلیم لە حەدیسی شوعبەوە لە سەعدی کوڕی ئیبراهیمەوە بەو شێوە هێناویەتی، ئەوەش مانای ئەو فەرمودەیەتی کە فەرموویەتی: "اللهم فی الرفیق الأعلی" سێ جار، پاشان گیانی دەرچوو، (علیه أفضل الصلاة والتسلیم).

## باسی هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە هاتووە وتوویەتی: پیاوێك لە ئەنصارەکان هات بۆ لای پێغەمبەر بە غەمباریەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: چییە ئەتبینم غەمباری؟ وتی: ئەی نێردراوی خوا شتێکە هاتوەتە بیرم فەرمووی: ئەو شتە چییە؟ وتی: ئێمە بەیانی و ئێوارە دێین و دەڕۆین بۆ لای تۆ سەیری ڕوخسارت دەکەین و لەگەڵتا دادەنیشین و سبەینێ لەگەڵ پێغەمبەرەکاندا بەرز دەبیتەوە، بەڵام ئێمە ناگەین بە تۆ، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، پاشان جوبرائیل ئەم ئایەتەی بۆ هێنایە خوارەوە ﴿وَمَن یُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِینَ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَیْهِم مِّنَ ٱلنَّبِیِّـۧنَ﴾. الایە، پێغەمبەر زەلامێکی نارد بۆ لای مژدەی بداتێ.

ئەبو بەکری کوڕی مەردەویە وتوویەتی: ئەسوەد لە عائیشەوە گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا تۆ خۆشەویستتری لام لە خۆم لە خێزان و کەسوکارم لە کوڕەکانم کە لە ماڵە بم بیری تۆم بکەوێتەوە خۆم بۆ ناگیرێ هەتا نەیەم و سەیرت نەکەم کاتێ بیری مردنی خۆم و مردنی تۆم دەکەوێتەوە

ئەزانم تۆ دەچیتە بەهەشتەوە و بەرز دەکرێتەوە لەگەڵ پێغەمبەراندا، جا کاتێ بچینە بەهەشتەوە ئەترسم نەت بینمەوە، پێغەمبەر هیچ وەڵامێکی نەدایەوە هەتا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێ: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَٰئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاءِ وَالصَّالِحِينَ ۚ وَحَسُنَ أُولَٰئِكَ رَفِيقًا ﴿٦٩﴾﴾.

ئیبنو مەردەویە دەڵێت: عامیری شەعبی لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر وتی: ئەی نێردراوی خوا من زۆر تۆم خۆش دەوێ هەتا کاتێ لە ماڵ دەبم تۆم دێتەوە یاد بە بار شانمەوە گران دەبێت، حەز دەکەم لەگەڵتا بم لە پلەیەکدا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هیچ وەڵامی نەدایەوە، خوای گەورە ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە.

لە سازەواری موسلیمدا چەسپاوە کە ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی وتوویەتی: من لە ماڵی پێغەمبەر بەشەو دەمامەوە خزمەتم دەکرد و ئاوی دەست نوێژ و پێویستیم بۆ ئامادە دەکرد، پێی وتم: داوای چی دەکەیت: وتم: ئەی نێردراوی خوا داوات لێ دەکەم لە بەهەشتدا لەگەڵتا بم، فەرمووی: "فاعنی علی نفسك بكثرة السجود" واتە: بە نوێژکردنی زۆر یارمەتیم بدە بۆ خۆت.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عەمری کوڕی موڕەی جوهەنی وتوویەتی: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی نێردراوی خوا شایەتیم داوە جگە لە خوای تاك و تەنها خوایەکی دیکە نییەو تۆش نێردراوی ئەو خوایەی، پێنج فەرزە نوێژم کردووە و زەکات ماڵم دەرکردووە و مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو بووم، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "هەر کەس لەسەر ئەوە بمرێ لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان دەبێت لە ڕۆژی دواییدا بە مەرجێ ئازاری دایك و باوکی نەدابێت".

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: سەهلی کوڕی موعازی کوڕی ئەنەس لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من قرأ ألف آية فی سبيل الله كتب يوم القيامة مع النبيين والصديقين والشهدا و والصالحين، وحسن أولئك رفيقا، إن شا و الله" هەر کەس

هەزار ئایەت لە ڕێگای خوادا بخوێنێ لە ڕۆژی دواییدا لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان و پیاوچاکان دەنووسرێت خوا هاوەڵانی بۆ ئەوانە بە چاك گیراوە خوا بیەوێ.

تیرمزی ئەگێڕێتەوە لە ئەبی سەعیدەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "التاجر الصدوق الأمين مع النبيين والصديقين والشهداء". واتە: بازرگانی ڕاستگۆی دەستپاك لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیدان دەبێت.

لەمانەش هەموو گەورەتر ئەو مژدەیە چەسپاوە لە سازەوارو مەسنەکاندا لە ڕێگای زۆرەوە لە کۆمەڵێ لە هاوەڵانی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پرسیاری لێ کرا دەربارەی پیاوێك کە کۆمەڵێکی خۆش بوێ پێیان نەگەیشتبێ، فەرموویەتی: "المرء مع من احب"، مرۆ لەگەڵ ئەوەدا دەبێ کە خۆشی دەوێ. ئەنەس دەڵێ: موسڵمانەکان بەهیچ ئەوەندە دڵخۆش نەبوون.

لە ریوایەتێکی ترەوە ئەنەس وتوویەتی: من پێغەمبەرم (دروودی خوای لێ بێت) خۆش دەوێ، هەروەها ئەبو بەکر و عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت). بە ئومێدی ئەوەم خوا لەگەڵ ئەواندا زیندووم بکاتەوە هەرچەندە وەك ئەوان بۆ خوا کارم نەکردووە.

ئیمام مالیکی کوڕی ئەنەس لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن أهل الجنة ليتراءون أهل الغرف من فوقهم، كما تتراءون الكوكب الدرى الغابر من الأفق من المشرق أو المغرب لِتَفَاضُلِ ما بينهم". بەهەشتییەکان سەیری ئەوانە دەکەن لە ژوورەکانی سەریانەوەن وەك چۆن ئێوە سەیری ئەستێرەیەکی دوور دەکەن لە ئاسۆی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە، بەڵام لە چاکیدا وەك یەکن. وتیان: ئەی نێردراوی خوا ئەوە شوێنی پێغەمبەرانە کەسی تر ناگاتە ئەو شوێنانە؟ فەرمووی: "بلى، والذى نفسى بيده، رجال آمنوا بالله وصدقوا المرسلين". بەڵێ بەوەی گیانی منی بەدەستە کۆمەڵێ پیاو ئەگەنە ئەو شوێنە کە باوەڕیان بە خوا هێناوە و نێرراوەکانی خوایان بەڕاست داناوە. (أخرجاه فى الصحيحين من حديث مالك ولفظه لمسلم).

ئیمام ئەحمەد لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن أهل الجنة ليتراءون في الجنة كما تراءون -أو ترون- الكوكب الدري الغارب في الأفق والطالع في تفاضل الدرجات". بەڕاستی ئەوانەی لە بەهەشتدان یەکتر دەبینن وەك چۆن ئێوە ئەستێرەی دوور ئەبینن کە لە ئاسۆ دەرکەوتووە لە چاکیدا وەکو یەکن، وتیان: ئەی نێردراوی خوا ئەوانە پێغەمبەرن؟ فەرمووی: "بلى، والذي نفسي بيده، وأقوام آمنوا بالله وصدقوا المرسلين". بەڵێ، بەوەی گیانی منی بەدەستە کۆمەڵێ پێوان باوەڕیان بە خوا هێناوە و نێرراوەکانیان بەڕاست داناوە".

فەرموودەڕەوان ئەبو قاسمی تەبەرانی لە کتێبی (المعجم الكبير)دا وتوویەتی: لە ئیبنو عومەرەوە هاتووە وتوویەتی: پیاوێك لە حەبەشەوە هات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پرسیاری لێ کرد دەربارەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پێی وت: پرسیار بکەو تێ بگە، وتی: ئەی نێردراوی خوا ئێوە فەزڵتان دراوە بەسەر ئێمەدا بە ویناو ڕەنگ و پێغەمبەرایەتی، پاشان وتی: رات چییە ئەگەر باوەڕم هێنا بەوەی تۆ باوەڕت پێ هێناوە و کارم پێ کرد ئایا من لەگەڵ تۆدا دەبم لەبەهەشتدا؟ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: بەڵێ، بەوەی گیانی منی بەدەستە ئەوە رەش سپی دەکاتەوە، بە ڕۆشنایی خۆی لە بەهەشتدا هەزار ساڵ ڕێگا، پاشان پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: هەر کەس وتی: (لا اله الا الله) لای خوا پەیمانی پێ دەدرێ وە هەر کەس وتی: (سبحان الله وبحمده) سەد هەزار چاکەی بۆ ئەنووسرێ پێی لەگەڵ بیست و چوار هەزاردا، پیاوێك وتی: چۆن ئێمە لەناو دەچین؟ دوای ئەوە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ڕۆژی قیامەت پیاو دێت بە کردەوەیەکەوە ئەگەر بخرێتە سەر کێوێك بۆی هەڵناگیرێ، یەکێ لە نیعمەتەکانی خوا راستی دەکاتەوە، خەریك دەبێ ئەوانە هەموو لەناو بچن ئەگەر خوا بەرەحمەتی خۆی داینەپۆشێ، وە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە: ﴿هَلْ أَتَىٰ عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ حِينٌ مِّنَ ٱلدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْـًٔا مَّذْكُورًا ﴿١﴾﴾ هەتا: ﴿نَعِيمًا وَمُلْكًا كَبِيرًا﴾ [الإنسان: ١ ـ ٢٠] کابرا ئەوەندە گریا هەتا گیانی لەدەست دا ئیبنو عومەر وتوویەتی: بە چاوی خۆم بینیم پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)

بەدەستەکانی شۆڕی کردەوە ناو گۆڕەکەی. (فيه غرابة ونكاره وسنده ضعيف).

لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَ ٱلْفَضْلُ مِنَ ٱللَّهِ﴾ واتە: لە لایەن خواوە بەرەحمەتی خۆی هەر ئەو کردونی بە ئەهلی ئەوە نەك کردەوەکانیان ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ عَلِيمًا﴾ واتە: خوا زانایە بەوانەی شایستەی ڕێ نیشان دان و سەرکەوتنە.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ خُذُوا۟ حِذْرَكُمْ فَٱنفِرُوا۟ ثُبَاتٍ أَوِ ٱنفِرُوا۟ جَمِيعًا
(٧١) وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ فَإِنْ أَصَـٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ قَالَ قَدْ أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَىَّ إِذْ
لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا (٧٢) وَلَئِنْ أَصَـٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ ٱللَّهِ لَيَقُولَنَّ كَأَن
لَّمْ تَكُنۢ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُۥ مَوَدَّةٌ يَـٰلَيْتَنِى كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا
(٧٣) فَلْيُقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ٱلَّذِينَ يَشْرُونَ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا
بِٱلْـَٔاخِرَةِ ۚ وَمَن يُقَـٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ يَغْلِبْ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ
أَجْرًا عَظِيمًا (٧٤)﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان: هەمیشە هۆشی خۆ و هەبێ ئامادەبن دەستە دەستە یان پێکەوە و بەتێکڕایی بچنە خەزا، هێندێکی تاوان دەناودان کە لە ئانقەست خۆوەودا دەداو ناوگاتێ، ئەگەر ئەوسا ئێوە تووشی چۆرتمێك بن، ئەڵێ: خودا منی بە چاکە خوێندەوە کە من لەگەڵیاندا نەبووم، ئەگەر ئێوە لە سایەی چاکەی خوداوە دەسکەوتێ باش و دەسکەوت وەك کەسێکی کە دەپێشدا هەر یەکتر و نەناسیبێ و دۆستایەتیتان نەبووبێ ئێژێ: خۆزی منیش لەگەڵیان کەوتبام، ئەوسا منیش لەو خێر و بێرە گەورەیە بەشدار دەبووم، با ئەوانەی بۆ قیامەتێ دەست لە دونیا هەڵدەگرن، بچنە خەزا لە ڕای خودا ئەوەش کە دەچێتە خەزا لە ڕێی خوادا، چ بکوژرێ و چ سەرکەوێ لەو دنیا پاداشتێکی گەورەی دەدەینێ.

خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەندە باوەڕدارەکانی کە ئاگایان لە خۆبێت بەرامبەر باوەڕداران ئەوەش ئەوە پێویست دەکات کە خۆیان بۆ ئامادە بکەن بە ژمارەی چەك و تفاقەوەن وە زۆرکردنی ژمارەیان بە نەفیری گشتی لە

ڕێگای خوادا ﴿ثُبَاتٍ﴾ واتە کۆمەڵ دوای کۆمەڵ، تیپ دوای تیپ و سریە دوای سریە.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە دەربارەی ﴿فَانفِرُواْ ثُبَاتٍ﴾ واتە: بە سریەی جیا جیا ﴿أَوِ انفِرُواْ جَمِيعًا﴾ واتە هەمووتان، بەو شێوەیە لە موجاهید و عەکریمە و سوودی و قەتادە و زەحاك و عەتای خوراسانی و موقاتیلی کوڕی حەیان و خوصەیفی جەزەرییەوە گێڕاوەتەوە.

﴿وَإِنَّ مِنكُمْ لَمَن لَّيُبَطِّئَنَّ﴾ موجاهید و چەند کەسی تر وتوویانە: ئەوە دەربارەی مونافیقەکان هاتۆتە خوارەوە، موقاتیلی کوڕی حەیان وتوویەتی: (لیبطئن) واتە دوائەکەون لە جیهاد لەوانەیە مەبەست ئەوەبێ کە خۆی دوادەخات و کەسانی تریش دوا دەخات لە جیهاد وەك عەبدوڵڵای کوڕی سەیلول دەیکرد، خۆی دوا دەخست و خەڵکیشی سارد دەکردەوە لە چوونە دەر.

ئەوەش قسەی ئیبنو جورەیج و ئیبنو جەریرە، لەبەرئەوە خوای گەورە هەواڵ دەدات کە مونافیقەکان دەیانوت: کاتێ دوابکەون لە جیهاد ﴿فَإِنْ أَصَٰبَتْكُم مُّصِيبَةٌ﴾ واتە: کوشتن و شەهیدبوون و زاڵبوونی دوژمن هیچ حیکمەتێکی خودایی تێدا نییە ﴿قَالَ قَدْ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيَّ إِذْ لَمْ أَكُن مَّعَهُمْ شَهِيدًا﴾ واتە: کاتێ ئامادەنەبووم لەگەڵیانا لەو جەنگەدا بە نیعمەتی خوای دادەنێ نازانێ چەند پاداشتی لەدەست چووە لە خۆڕاگرتن و شەهید بووندا کاتێ بکوژرایە.

﴿وَلَئِنْ أَصَٰبَكُمْ فَضْلٌ مِّنَ اللَّهِ﴾ واتە سەرکەوتن و پەی بردن و بەدەست هێنانی دەستکەوتی جەنگ ﴿لَيَقُولَنَّ كَأَن لَّمْ تَكُن بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُ مَوَدَّةٌ﴾ واتە: وەك ئەوە وایە لەسەر ئاینەکەتان نەبێ، بۆیە دەڵێ: ﴿يَٰلَيْتَنِي كُنتُ مَعَهُمْ فَأَفُوزَ فَوْزًا عَظِيمًا﴾ واتە: بەوەی بەشێکیان لە غەنیمەتە بۆ دانبایە کە ئەوە گەورەترین مەبەستێتی.

پاشان خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿فَلْيُقَٰتِلْ﴾ ئەو باوەڕدارەی چووە بۆ جەنگ ﴿فِي سَبِيلِ اللَّهِ الَّذِينَ يَشْرُونَ الْحَيَوٰةَ الدُّنْيَا بِالْآخِرَةِ﴾ واتە: دینەکەیان ئەفرۆشن بە شتێکی کەمی دونیا ئەوەش بە هۆی ئەوەوەیە باوەڕیان نییە، پاشان خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُقَٰتِلْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ فَيُقْتَلْ أَوْ

يَغۡلِبۡ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا﴾ واتە: هەموو ئەوانەی لە رێگای خوادا ئەجەنگێن بکوژرێن یان دوژمن سەرکەوێت بەسەریاندا وەك یەکە خوا هەر پاداشتی گەورەیان دەداتەوە وەك لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە فەرموویەتی: خودا کەفیلی ئەو موجاهیدەیە لە رێگای ئەودا غەزا دەکات کاتێ بیمرێنێ ئەیخاتە بەهەشتەوە یان دەیگێڕێتەوە بۆ ئەو شوێنەی لێی هاتۆتەدەر پاداشتی زۆری بۆ دائەنێ و دەستکەوتی (غەنیمەتی) پێدەبەخشێ.

﴿وَمَا لَكُمۡ لَا تُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱلطَّٰغُوتِ فَقَٰتِلُوٓاْ أَوۡلِيَآءَ ٱلشَّيۡطَٰنِۖ إِنَّ كَيۡدَ ٱلشَّيۡطَٰنِ كَانَ ضَعِيفًا ﴿٧٦﴾﴾

واتە: بۆچی ئێوە ناچنە غەزا لە ڕای خودا و لەبەر هێز لێ گیراوەکان، لەبەر پیاوان و ژنان و منداڵانی کە دەڵێن: ئەی پەروەرینمان: لەم شارەدا خەڵکەکەی ناهەقیکارن ڕزگاریان کەو لە لای خۆتەوە یار و یاوەرێکمان بۆ دیاری بکە، ئەوانەی خاوەن باوەڕن خەزا لە رێ خوادا دەکەن، ئەوانەش کە خوانەناسن لە ڕێگەی تاغوت شەڕ دەکەن، دەسا ئێوەش بچنە شەڕی ئەوانەی دۆستی شەیتانن، فێڵی شەیتان زەبون و بێ هێز و پێزە.

خوای گەورە بەندە باوەڕدارەکان هان دەدات بۆ جیهاد کردن لە ڕێگەی ئەوداو هەوڵدان بۆ ڕزگارکردنی هێز لێگیراوەکان لە مەککە لە پیاوان و ژنان و منداڵان کە بە زۆر دانراون لەناو مەککەدا، لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَآ أَخۡرِجۡنَا مِنۡ هَٰذِهِ ٱلۡقَرۡيَةِ﴾ واتە: مەککە وەك ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَكَأَيِّن مِّن قَرۡيَةٍ هِيَ أَشَدُّ قُوَّةٗ مِّن قَرۡيَتِكَ ٱلَّتِيٓ أَخۡرَجَتۡكَ﴾ [محمد: ١٣]، پاشان وەصفی دەکات، کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلظَّالِمِ أَهۡلُهَا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ وَلِيّٗا وَٱجۡعَل لَّنَا مِن لَّدُنكَ نَصِيرًا﴾، واتە: لە لایەن خۆتەوە پاڵپشت و یارمەتیدەرێکمان بۆ دابنێ.

بوخاری وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: من و دایکم لە هێزلێگیراوەکان بووین (المستضعفین).

لە ئیبنو ئەبی مەلیکەوە هاتووە کە ئیبنو عەباس ﴿إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ﴾ [النساء: ٩٨] خوێندەوە وتی: من و دایکم لەوانە بوو بن کە خوا بە بەهانەدار داینابوون.

پاشان خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ ۖ وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ يُقَـٰتِلُونَ فِى سَبِيلِ ٱلطَّـٰغُوتِ﴾ واتە: باوەڕدارەکان لە بەرفەمانی خوادا و بۆ ڕەزامەندی خودا دەجەنگن، بەڵام بێ باوەڕەکان بۆ بەرفەرمانی شەیتان دەجەنگن، پاشان خوای گەورە باوەڕدارەکان دەوروچێنێ لەسەر جەنگ دژی دوژمنەکانی کە دەفەرموێت: ﴿فَقَـٰتِلُوٓا۟ أَوْلِيَآءَ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۖ إِنَّ كَيْدَ ٱلشَّيْطَـٰنِ كَانَ ضَعِيفًا﴾.

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُوا۟ ٱلزَّكَوٰةَ فَلَمَّا
كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ
وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ۗ قُلْ مَتَـٰعُ ٱلدُّنْيَا
قَلِيلٌ وَٱلْـَٔاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧٧﴾ أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ
ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ ۗ وَإِن تُصِبْهُمْ حَسَنَةٌ يَقُولُوا۟ هَـٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ
وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَقُولُوا۟ هَـٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ ۚ قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ فَمَالِ هَـٰٓؤُلَآءِ
ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا ﴿٧٨﴾ مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ ٱللَّهِ ۖ وَمَآ أَصَابَكَ
مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ ۚ وَأَرْسَلْنَـٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولًا ۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ﴿٧٩﴾﴾

واتە: ئاخۆ ئەوانەت نەدیوە پێیان گوترا هەتا لە مەککەن شەڕ مەکەن، نوێژ بکەن و زەکات بدەن، کاتێ بیستیان خەزایان لەسەر نووسراو زانییان دەبێ بچنە شەڕ ئەوەندەیان لەو خەڵکەی کە دەچنە دژیان ترس لێ نیشت کە لە خوداش هەر ئەوەندە ترساون و بگرە پتریش، وە ترسان دەیانگووت: ئەی پەروەرینمان! بۆچی غەزات بۆ نووسیوین، چیی دەبوو تا ماوەیەکی تر دوات

خستباین؟ بڵێ: ژیانی دونیایە کەم و کورتە و بۆ ئەوانەی کە ترسیان لە خودا هەیە، ژیانی ئەولا باشترە و بەقەد داوی زراوی ناو دەنکە خورما کەس ناهەقی لێ ناکرێ. لەهەرکوێ بن تەنانەت ئەگەر لە قەڵای زۆر قایمیش خۆدەشانەوە مردن دەتاندۆزێتەوە، هەرگا چاکەیان دێتە رێ دەڵێن: ئەمە لە خواوەیە، ئەگەر تووشی ناخۆشیش بوون ئەڵێن: ئەمە لە تۆوە بوو، بڵێ: خۆشی و ناخۆشی هەر بە دەستی خوایە. ئەرێ ئەم مەردمانە چییانە؟ وەکو لە هیچ تێنەگەن وایە! تووشی هەر چاکەیەك ببی لە خواوەیە، نالەباریشت بێتەڕێ بزانە کە لە خۆت ڕایە، تۆمان کل کرد کە بەسەر ئەو مەردمەوە پێغەمبەر بی، هێندەت بەسە کە خودا ئاگات لێت هەیە.

باوەڕدارەکان لە سەرەتای ئیسلام لە مەککەدا بوون فەرمانیان پێ کرابوو کە نوێژ بکەن و زەکات بدەن، فەرمانیان پێ کرابوو یارمەتی هەژارەکانی خۆیان بدەن و فەرمانیان پێ کرابوو لێبوردە بن بەرامبەر هاوبەشدانەرەکان و خۆڕاگر بن تا ماوەیەك، بەڵام حەزیان دەکرد کە رێیان پێ بدرایە جەنگ بکەن لەگەڵیان بۆ ئەوەی ئاگری دڵیان دامرکێننەوە، بەڵام ئەو بارودۆخە ئەو کاتە گونجاو نەبوو لەبەر چەند هۆیەك: لەوانە: کەمی ژمارەیان بە گوێرەی زۆری دوژمنەکانیانەوە، هەر لەوانە: لەبەرئەوەی لە شارەکەیاندا بوون، کە شاری حەرامە و پیرۆزترین شوێنی سەرزەوییە، لەبەرئەوەی سەرەتا فەرمان بە جەنگ نەکرا بووە وەك وتراوە، لەبەرئەوەی فەرمانیان بە جیهاد پێنەکرابوو لە مەدینە نەبێ کاتێ بوە شوێنی جێگیر بوون و پاراستن و یارمەتیدان بۆیان لەگەڵ ئەوەشدا کاتێ فەرمانیان پێ کرا بەوەی بە ئاواتییەوە بوون هەندێکیان ترسان لێی و ترسان بەرەنگاری خەڵك ببنەوە بە ترسێکی زۆرەوە: ﴿وَقَالُواْ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ واتە: ئەگەر فەرزبوونی جیهادت دوابخستایە بەسەرمان بۆ ماوەیەکی تر، چونکە ئەوە خوێنڕشتن و منداڵ هەتیوو کردن و بێوەژنکردنی ژنانی تێدایە، ئەم ئایەتەش وەك ئەو ئایەتەی سورەتی موحەممەدە، کە دەفەرموێت: ﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَوْلَا نُزِّلَتْ سُورَةٌ فَإِذَآ أُنزِلَتْ سُورَةٌ مُّحْكَمَةٌ وَذُكِرَ فِيهَا ٱلْقِتَالُ﴾ [محمد: ٢٠].

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی:

عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف و چەند هاوەڵێکی هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتیان: ئەی نێردراوی خوا کە هاوبەشدانەر بووین لەوپەڕی غیرەت و خۆشییدا بووین، کاتێ موسڵمان بووین زەلیل بووین، فەرمووی: "إني أمرت بالعفو فلا تقاتلوا القوم". من ئێستا لە ماوەی لێبوردندام لەگەڵ ئەم قەومەتا مەجەنگن، کاتێ خوای گەورە گوێزایەوە بۆ مەدینە فەرمانی پێ کرا کە بجەنگن دژی بێ باوەڕەکان، خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ قِيلَ لَهُمْ كُفُّوٓا۟ أَيْدِيَكُمْ﴾ "رواه النسائي والحاكم وابن مردويه".

لە سوودییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: لە مەککە جگە لە نوێژ و زەکات هیچی تریان لەسەر فەرز نەبوو، داوایان لە خوا کرد غەزایان لەسەر فەرز بکات، جا کاتی غەزای لەسەر فەرز کردن ﴿فَلَمَّا كُتِبَ عَلَيْهِمُ ٱلْقِتَالُ إِذَا فَرِيقٌ مِّنْهُمْ يَخْشَوْنَ ٱلنَّاسَ كَخَشْيَةِ ٱللَّهِ أَوْ أَشَدَّ خَشْيَةً ۚ وَقَالُوا۟ رَبَّنَا لِمَ كَتَبْتَ عَلَيْنَا ٱلْقِتَالَ لَوْلَآ أَخَّرْتَنَآ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ﴾ ئەویش مردنە، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾.

موجاهید وتوویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی جولەکە هاتووەتە خوارەوە.

﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ وَٱلْءَاخِرَةُ خَيْرٌ لِّمَنِ ٱتَّقَىٰ﴾ واتە: ڕۆژی دوایی خێرترە لە دونیا بۆ لەخواترس ﴿وَلَا تُظْلَمُونَ فَتِيلًا﴾ واتە: لە کردەوەکانتان، بەڵکو بە تەواوترین شێوە پاداشتیان دەداتەوە، ئەوە خۆشییەکەی بۆیان لە دونیادا و ڕەغبەتە بۆ ئاخیرەت بۆیان، وە پاڵپێوەنەرە بۆیان بۆ جیهاد.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: حەممادی کوڕی زەید لە هیشامەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: حەسەن ئەم ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿قُلْ مَتَٰعُ ٱلدُّنْيَا قَلِيلٌ﴾ وتی: ڕەحمەتی خوا لەو بەندەیە بێت بەو پێیە هاوەڵی کردووە، دونیا سەرەتاو کۆتایی وەك پیاوێکە خەوی پیاکەوتبێ، لەخەویا چی پێخۆش بێ ببینێ، پاشانم بەئاگا بێتەوە.

﴿أَيْنَمَا تَكُونُوا۟ يُدْرِككُّمُ ٱلْمَوْتُ وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ واتە: هەر بەرەو مردن دەچن کەس لێی دەرناچێ وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا

فَانٍ﴾ [الرحمن: ٢٦]، وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ [آل عمران: ١٨٥]، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَمَا جَعَلْنَا لِبَشَرٍ مِّن قَبْلِكَ ٱلْخُلْدَ﴾ [الأنبياء: ٣٤] مەبەست ئەوەیە هەموو کەس بەرەو مردن دەڕوات، کەس لەو رزگاری نابێت، جیهادی کردبێ یان نەیکردبێ، هەرکەسە ئاکامێکی دیاری کراوی هەیە، وەك خالیدی کوڕی وەلید لەسەر جێگای مردندا وتی: چەندەها جەنگم بینیوە شوێنێك نییە لە جەستەم شوێنی برینێکی پێوە نەبێ، کەچی ئەوەتا لەسەر جێگاکەم دەمرم. چاوی ترسنۆکان نەچووەتە خەو.

فەرمایشی ﴿وَلَوْ كُنتُمْ فِى بُرُوجٍ مُّشَيَّدَةٍ﴾ واتە: لە شوێنێکی قاییمی دامەزراوی بەرزدا بێت، وتراوە ئەوە چەندە بورجە لە ئاسمان، سوودی وتوویەتی: ئەوە زەعیفە، ڕاستی ئەوەیە کە قاییم بێت، واتە: خۆپارادستن و خۆقاییم کردن لەناو بورجەکاندا سوودی نییە، مردن هەر دێت، وەك زوهەیری کوڕی ئەبی سەلما دەڵێت:

وَمَنْ هابَ أسبابَ المنايا يَنَلْنَهُ

ولو رامَ أسبابَ السماءِ بِسُلَّم

پاشان وتراوە: "المشَيَّدَة" واتە: دامەزراو وەك وتراوە: ﴿وَقَصْرٍ مَّشِيدٍ﴾ [الحج: ٤٥] تەلاری دامەزراو.

ئیبنو جەریر و ئیبنو ئەبی حاتەم بەسەرهاتێکی دوور و درێژ لە موجاهیدەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: لەناو نەتەوەکانی پێشوودا ئافرەتێك تووشی سکچوون دەبێ، فەرمان دەکا بە خزمەتکارەکەی ئاگری بۆ ئامادە بکات، ئەویش چووە دەر سەیری کرد پیاوێك لەبەر دەرگا وەستاوە، وتی: ژنەکە چی بوو؟ وتی: کچ، وتی: ئەو کەچە لەگەڵ سەد پیاودا زینا دەکات، پاشان خزمەتکارەکەی مارەی دەکات مردنەکەشی بە جاڵجاڵۆکە دەبێ، ئەڵێ: کابرا گەڕایەوە سکی کچەکەی هەڵدڕی و ڕای کرد وایزانی مردووە، دایکی زگی دووریەوە، ئەویش چاك بووەوە و گەورە بوو، جوانتر ئافرەتی شارەکە دەرچوو، ئەو خزمەتکارەش چوو بۆ گوێ دەریاو ماڵێکی زۆری بەدەستهێنا، پاشان گەڕایەوە بۆ شارەکەی و ویستی ژن بهێنێ، بەپیرەژنێکی وت: ئەمەوێ جوانترین ئافرەتی ئەم شارە بهێنم، پیرەژنەکە وتی: لە فڵانە ئافرەت جوانتر

نییە لەم شارەدا، وتی: بۆم داوا بکە، پیرەژنەکە چوو بۆ لای و ڕازی بوو، کە چوو بۆ لای و بینی زۆر سەری سوڕما و حەزی لێ کرد، ژنەکە پرسیاری لێ کرد کە ئیشی چییەو لە کوێوە هاتووە، ئەویش هەواڵی بارودۆخی خۆی پێدا هەتا ئەوەش کە لەگەڵ کچەکەدا کردبووی، ژنەکە وتی: من ئەو کچەم و شوێنی چەقۆکەی نیشان دا، بەو شێوەیە قسەی پیاوەکە هاتەدی، پیاوەکەش وتی: تۆ ئەگەر ئەو کچەیت دوو شتم پێ بڵێ: یەکەمیان تۆ زینات کردووە لەگەڵ سەد کەسدا، ژنەکە وتی: ئەوە بووە، بەڵام ژمارەکەی نازانم، پیاوەکە وتی: سەد پیاو بووە، دووەمیان: تۆ بە جاڵجاڵۆکە دەمری، هات تەلارێکی قایمی بەرزی بۆ گرت بۆ ئەوەی لەوە بیپارێزێ، ڕۆژێك بە یەکەوە بوون لەناو تەلارەکەدا سەیری کرد جاڵجاڵۆکەیەك بە سەقفی ژوورەکەیەوە نیشانی ژنەکەی دا، ژنەکە وتی: ئا ئەوەیە پێم دەڵێی خۆتی لێ بپارێزە، سوێند بە خوا ئەبێ من ئەو بکوژم، لە سەقفەکەیان کردەوە ژنەکە پەلاماری داو پەنجەی قاچی پێدا ناو کوشتی، نەختی لە زەهرەکەی دەرپەڕی و چووە نێوان نینۆکەکانی، پاش ماوەیەك شوێنەکەی ڕەش بوو، بەوە ئەجەلی هات و مرد.

لێرەدا باسی بەسەرهاتی ئەو کەسە دەکەین کە خاوەنی شاری (حەزەڕ) بوو، ناوی ساترون بوو، بابور فێڵی لێ کرد، چوار دەوری گرت لە شارەکەدا، ئەوەی لە شارەکەدا بوو کوژرا، دوای چواردەورگرتنی ماوەی دوو ساڵ، ئیبنو هیشام وتوویەتی: کیسرا سابوور (ذو الاکتاف) ساترون کوشت کە پاشای (حەزەڕ) بوو.

هەروەها ئیبنو هیشام وتوویەتی: ئەوەی خاوەنی شاری حەضەری کوشت سابوری کوڕی ئەردەشێری کوڕی بابك یەکەم پاشای بەنی ساسانییەکان بوو، پاشای هەموو تائیفەکانی زەلیل کرد و پاشایەتی گێڕایەوە بۆ کیسراکان، بەڵام سابور ذو الأکتاف دوای ئەوە بە ماوەیەکی دووردرێژ بووە - ئیتر خوا ئەزانێ - (ذکره السهيلي)، هات دوو ساڵ چوار دەوری گرت لەبەرئەوەی هێرشی کردبووە سەر وڵاتی سابور کاتی ئەو لە عێراق بووە، کچەکەی ساترون کە ناوی نەزیرە بوو لەسەرەوە سەری دەرهێناو سەیری سابوری کرد کە دیباجی لەبەردابوو، وە تاجێکی زێڕینی بەرزوبەر جەدو

یاقووت و لوئلوئی ڕازاوەی لەسەردا بوو بە دەسیسە کەسێکی نارد بۆ لای و پێی وت ئەگەر دەرگای قەڵاکەت بۆ بکەمەوە مارەم دەکەیت، ئەویش وتبووی: بەڵێ، کە ئێوارە هات، ساترون عارەقێکی زۆری خواردەوە تەواو سەرخۆش بوو، چونکە بە سەرخۆشی نەبوایە نەدەخەوت، کچەکە هات کلیلەکانی دەرگای قەڵاکەی لەژێر سەردا دەرهێنا لەگەڵ خزمەتکارێکی ناردی و دەرگاکەی کردەوە، وە وتراوە ئەو تەڵسمەی پێی وتن کە لە قەڵاکەدا نەبوو نەیدەهێشت دەرگای قەڵاکە بکرێتەوە تەڵسمەکەش ئەوەبوو کە ئەو دەرگایە ناکرێتەوە هەتا کۆترێکی ڕەش و سپی نەهێنن و قاچەکانی بە خوێنی حەیزی کچێکی چاوشین سوورنەکرێ، پاشان بەرەڵا بکرێ، کاتێ لەسەر شوراکە قەڵاکە بنیشێتەوە تەڵسمەکە نامێنێ و دەرگاکە دەکرێتەوە، ئەویش ئەوەی کرد، بەوشێوەیە سابور چووە ناو قەڵاکەوە و ساترونی کوشت و قەڵاکەی تاڵان کرد و رووخاندی، کچەی هێناو مارەی کرد و بردی لەگەڵ خۆی، شەوێك لەسەر جێگای خەوتن رادەکشێ هەر ئەمدیوو ئەودیو ئەکات بێ ئەوەی خەوی لێ بکەوێ، داوای مۆمێکی کرد ناو نوێنەکانی گەڕا گەڵایەکی ئاسی بینیەوە، سابور پێی وت: ئا ئەوە خەوی زڕاندووە، ئەی باوکت کە ئاوا خەوت بزڕایە چی لێ ئەکردی؟ دیباجی بۆ ڕائەخستم و حەریری لەبەر دەکرم و مێشکی دەرخوارد دەدام و عارەقی ئەدامێ، ئەبەری وتوویەتی: وتوویەتی: باوکم مێشك و کەرەی دەرخوارد دەدام و هەنگوینی هەنگی تازە و عارەقی صافی دەرخوارد دام! باسی ئەوەی کردووە کە لە سپێتییدا مۆخی قاچەکانی دیاربوو، سابوور دەڵێ: ئەوە پاداشتی باوکت بوو کە ئەوەی لەگەڵدا دەکردی؟ کەواتە بۆ من خراپتر دەبی! پاشان فەرمان دەدات کە پرچەکانی سەری ببەستنەوە بە کلکی ئەسپێکەوە، ئەسپەکە غار دەدات هەتا دەیکوژێ، دەربارەی ئەوە زۆر هۆنراوە وتراوە، لەوانە هۆنراوە بەناوبانگەکەی عەدی کوڕی زەیدی عیبادی.

﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٌ﴾ واتە: پیت و بەرەکەت و بەروبووم و منداڵ و شێوەکانیان، ئەوەش واتای قسەکەی ئیبنو عەباس و ئەبی عالیەو سوودییە.

﴿يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٌ﴾ واتە: گرانی و قات و قڕی و کەمبوونی بەروبوومی درەخت و دانەوێڵە، یا مردنی منداڵان، یان

بەروبوومی ئاژەڵ، یان جگە لەوانە، وەك ئەبو عالیە و سوودی دەڵێن.

﴿يَقُولُوا هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ﴾ واتە بە هۆی تۆوە بوو، وە بە هۆی ئەوەوە بوو کە شوێن تۆ کەوتووین و چووینە سەر ئاینەکەت وەك خوای گەورە دەربارەی نەتەوەی فیرعەون دەفەرموویێت: ﴿فَإِذَا جَآءَتْهُمُ ٱلْحَسَنَةُ قَالُوا۟ لَنَا هَٰذِهِۦ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا۟ بِمُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ﴾ [الأعراف: ١٣١]، هەروەها وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَعْبُدُ ٱللَّهَ عَلَىٰ حَرْفٍ﴾ [الحج: ١١] بەوشێوەیە ئەو دووڕووانەی بەڕواڵەت موسڵمان بووبوون ئەو قسانەیان دەکرد، لەبەرئەوە کاتێ تووشی ناخۆشییەك دەبوون دەیاندایە پاڵ ئەوەی کە شوێن پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) کەوتبوون.

سوودی وتوویەتی: ئەگەر تووشی خێرو چاکە بونایە. دەڵێ: خێر و چاکە پیت و بەرەکەت و زاوزێی ئاژەڵەکانیان و ماینەکانیان بووە، هەروەها چاکبوونی بارودۆخی ژیانیان و منداڵ بوونیان بووە ئەیانووت: ﴿هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِ ٱللَّهِ ۖ وَإِن تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ﴾ (السيئة) گرانی و قات و قڕی و زیان بووە، کە پێیان گەیشتووە، نەگبەتییەکەیان ئەدایە پاڵ موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) و ئەیانووت: ﴿هَٰذِهِۦ مِنْ عِندِكَ﴾ ئەیانووت: بەوازهێنانمان لە ئایینەکەمان و شوێنکەوتنمان بۆ موحەممەد ئەم بەڵایانەمان تووش بووە، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە: ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ ئەوانە هەموو بەقەزا و قەدەری خوایە، ئەوەش دەربارەی چاك و خراپ و باوەڕدار و بێباوەڕ بەدی دێت.

عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەوانە هەموو لە خواوەن، واتە چاکە و خراپە. حەسەنی بەصریش هەر ئەوەی وتووە.

خوای گەورە پاشان ئینکاری لەقسەی ئەوانەدا دەکات کە ئەو قسانەیان لێوە پەیدا دەبێت و لە شك و گوماندان و کەم تێگەیشتوو و کەم زانین و زۆر نەزان و ستەمکارن، دەفەرموێت: ﴿فَمَالِ هَٰٓؤُلَآءِ ٱلْقَوْمِ لَا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾.

فەرموودەیەکی (غەریب) پەیوەست بە فەرمایش ﴿قُلْ كُلٌّ مِّنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ باس کراوە.

ئەبوبەکری بەزار وتوویەتی: لە عەمری کوڕی شوعەیبەوە دەگێڕنەوە لە باوکییەوە لە باپیرییەوە کە وتوویەتی: لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دانیشتبووین، ئەبو بەکر و عومەر لەگەڵ دوو هۆز لە خەڵك هاتن، کە بەسەریەکدا دەیانقیڕاند، ئەبو بەکر لە نزیك پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) دانیشت، عومەریش لە نزیك ئەبوبەکرەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: بۆچی دەقیڕێنن بەسەریەکدا؟ پیاوێك وتی: ئەی نێردراوی خوا، ئەبو بەکر دەڵێت: چاکەکان لە خواوەیە و خراپەکانیش لە خۆمانەوەیە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: عومەر ئەی تۆ چیت وتووە؟ وتی: چاکە و خراپە لە خواوەیە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "نختلف فيختلف أهل السما و وإن يختلف أهل السما و يختلف أهل الأرض. فتحاكما إلى إسرافيل، فقضى بينهم أن الحسنات والسيئات من الله". پاشان رووی کردە ئەبو بەکر و عومەر و فەرمووی: "احفظا قضائى بينكما، لو أراد الله ألا يُعْصَى لم يخلق إبليس".

واتە: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) یەکەمجار جوبرائیل و میکائیل لەوبارەیەوە قسەیان کردووە، ئەی ئەبو بەکر میکائیل قسەکەی تۆی کرد، ئەی عومەر جوبرائیل قسەکەی تۆی کرد. فەرمووی: ئەگەر ئێمە تێك بچین لە نێوان یەکدا لەسەر شتێك ئەوە ئەهلی ئاسمانیش تێکدەچن کە ئەهلی ئاسمان تێکچوو ئەهلی زەویش تێکدەچێت، چوون بۆ لای ئیسرافیل، ئەویش وتی: چاکەکان و خراپەکان لە خواوەیە. پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) رووی کردە ئەبوبەکر و عومەر و فەرمووی: دادوەری من لە نێوانتاندا بپارێزن، خوا ئەگەر بیویستایە سەرپێچی لێ نەکرێ ئەوە شەیتانی دروست نەدەکرد.

شێخی ئیسلام تەقیەدین ئەبولعەباس ئیبن تەیمیە وتوویەتی: فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە بەرێك کەوتنی زانایانی فەرموودە.

پاشان خوا گەورە بەرامبەر نێردراوەکەی (دروودی خوای لێ بێت) دەدوێ، مەبەستیش رەگەزی مرۆڤە بۆ بەدەستهێنانی وەڵام: ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنْ حَسَنَةٍ فَمِنَ اللَّهِ﴾ واتە: لە فەزڵی خوا و رەحمەت و لوتفی خواوەیە ﴿وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٍ فَمِن نَّفْسِكَ﴾ واتە: وە لە خۆتەوەیە و بەهۆی کردەوەکانتەوەیە وەك خوای گەورە

فەرموویەتی: ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٖ فَبِمَا كَسَبَتۡ أَيۡدِيكُمۡ وَيَعۡفُواْ عَن كَثِيرٖ﴾ [الشورى: ٣٠].

سوودی و حەسەنی بەصری و ئیبنو جورەیج و ئیبنو زەید وتوویانە: ﴿فَمِن نَّفۡسِكَۚ﴾ واتە: بەهۆی تاوانەکانتەوەیە.

قەتادە وتوویەتی: ﴿فَمِن نَّفۡسِكَۚ﴾ واتە: ئەی ئادەمیزاد ئەو سزایە کە بە هۆی تاوانەکانتەوە، وتوویەتی: بۆیان باس کردووین کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا يصيب رجلا خَدْش عود، ولا عثرة قدم، ولا اختلاج عِرْق، إلا بذنب، وما يعفو الله أكثر". واتە: پیاو هەر رووشانێك بە دار، یان سەر نووچ دان، یان هەڵپلانی دەمارێکی تووش بوو بە هۆی تاوانەوەیە، خوایش لە زۆریان ئەبووری. ئەمەی قەتادە گێڕاویەتییەوە مورسەلە و بە مونەصیلیش گێڕاوەتەوە لە سازەواردا کە فەرموویەتی: "والذي نفسي بيده، لا يصيب المؤمن هَمٌّ ولا حَزَنٌ، ولا نَصَبٌ، حتى الشوكة يشاكها إلا كَفَّر الله عنه بها من خطاياه". واتە: بەوەی گیانی منی بەدەستە، باوەڕدار هەر غەم و پەژارە و ماندووبوونێکی تووش بوو هەتا دڕکێك بچێت بە قاچیدا ئەبێـە کەفارەت بۆ تاوانەکانی.

ئەبو صالح وتوویەتی: ﴿مَّآ أَصَابَكَ مِنۡ حَسَنَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ وَمَآ أَصَابَكَ مِن سَيِّئَةٖ فَمِن نَّفۡسِكَۚ﴾ واتە: بە تاوانەکانت کە من بۆم داناویت (رواه ابن جرير).

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە موتەڕفی کوڕی عەبدوڵڵاوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: چیتان دەوێ لە قەدەر؟ ئایا ئەو ئایەتەتان بەس نییە کە لە سورەتی (النساء)دایە ﴿وَإِن تُصِبۡهُمۡ حَسَنَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِ ٱللَّهِۖ وَإِن تُصِبۡهُمۡ سَيِّئَةٞ يَقُولُواْ هَٰذِهِۦ مِنۡ عِندِكَۚ﴾ واتە: لە خۆتەوە سوێند بە خوا نەدراونە دەست قەدەر فەرمانیان پێ کراوە بەرەو ئەوە بچن.

ئەوە قسەیەکی بەهێزە دەربارەی ڕەددانەوەی قەدەرییەکان و جەبرییەکان. وەك خوای گەورە دەفەرمووێ: ﴿وَأَرۡسَلۡنَٰكَ لِلنَّاسِ رَسُولٗاۚ﴾ واتە: شەریعەتەکانی خوایان پێ بگەیەنە لەگەڵ ئەوانەدا کە خوا پێی خۆشە و پێی ڕازییە، وە ئەوەی لای ناخۆشە و ڕقی لێیەتی: ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدٗا﴾ واتە: لەسەر ئەوەی خۆی ناردوویەتی، هەروەها شایەتە لە نێوان تۆداو لە نێوان ئەواندا، وە

زانایە بەوەی گەیاندووتە پێیان و بەوانەی ڕەدی دەکەنەوە لە هەق و ڕاستی بە عینادی و بێ باوەڕی.

﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ عَلَيْهِمْ حَفِيظًا (٨٠) وَيَقُولُونَ طَاعَةٌ فَإِذَا بَرَزُواْ مِنْ عِندِكَ بَيَّتَ طَآئِفَةٌ مِّنْهُمْ غَيْرَ ٱلَّذِى تَقُولُ وَٱللَّهُ يَكْتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ وَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا (٨١)﴾

واتە: هەرکەسێك بەرفەرمانی پێغەمبەرە دیارە بەرفەرمانی خوایە، هەرکەسیش خۆی لێ ببوێرێ ئێمە تۆمان نەناردووە لەسەریان ببیە چاودێر. لەناویاندا کەسانێك هەن ئەڵێن: ئێمە لە فەرمانی تۆ دەرناچین، بەڵام کە لێت دوور دەکەونەوە پێچەوانەی فەرمانی تۆ شەوانە راوێژ دەکەن، هەر خەیاڵێ کە لە شەودا بە دڵیاندا رادەبورێ خوا دەینووسێ، تۆش وازیان لێ بێنە و خۆت هەر بە خودا بسپێرە و کارسازت خودا بێ بەستە.

خوای گەورە دەربارەی بەندە و نێردراوی خۆی موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) هەواڵ دەدات کە هەر کەس بەرفەرمانی ئەوبێت ئەوە بەرفەرمانی خوایشە، وەهەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانی بکات ئەوە سەرپێچی فەرمانەکانی خوای کردووە، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە لە خۆیەوە قسە ناکات، بەڵکو لە خواوەیە وەحی بۆ دێت.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: ئەبی ساڵح لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من أطاعني فقد أطاع الله، ومن عصاني فقد عصى الله ومن أطاع الأمير فقد أطاعني، ومن عصى الأمير فقد عصاني". واتە: هەر کەس بەرفەرمانی من بێت ئەوە بەرفەرمانی خوایە وەهەرکەس سەرپێچی فەرمانەکانم بێت ئەوە سەرپێچی فەرکانەکانی خوای کردووە، وەهەرکەس بەرفەرمانی ئەمیرەکەی بێت، ئەوە بەرفەرمانی منیشە، وەهەرکەس سەرپێچی لە فەرمانەکانی ئەمیرەکەی بکات ئەوە سەرپێچی لە فەرمانەکانی من کردووە. (ئەم فەرموودەیە چەسپاوە لە هەردوو سازەواردا لە ئەعمەشەوە).

﴿وَمَن تَوَلَّىٰ فَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ عَلَيۡهِمۡ حَفِيظٗا﴾ واتە: تۆ تەنها گەیاندنت لەسەرەو هیچی تر، جا هەر کەس شوێنت کەوێت بەختەوەر و رزگار دەبێت و هەر کەس رووت لێ وەربگێڕێ ئەوە بەدبەخت و دۆڕاوو دەبێت، تۆ هیچت بەسەرەوە نییە وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "من يطع الله ورسوله فقد رشد، ومن يعص الله ورسوله فإنه لا يضر إلا نفسه" واتە: هەر کەس بەرفەرمانی خوا و نێرراوەکەی بوو ئەوە رێی راستی گرتووە، وە هەرکەسیش سەرپێچی فەرمانی خوا و نێرراوەکەی بوو جگە لە خۆی زیان بەکەسی تر ناگەیەنێت.

﴿وَيَقُولُونَ طَاعَةٞ﴾ خوای گەورە دەربارەی دووڕووەکان هەواڵ دەدات کەوا خۆیان دەردەخەن لەگەڵتانن و بەرفەرمانتانن ﴿فَإِذَا بَرَزُواْ مِنۡ عِندِكَ﴾ کاتێ لای تۆ چوونە دەرو دوورکەوتنەوە لێت ﴿بَيَّتَ طَآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ غَيۡرَ ٱلَّذِي تَقُولُ﴾ واتە: شەو بەردەوام ئەبن لە نێوان خۆیاندا لەسەر ئەوەی کە بۆ تۆیان دەرخستووە، خوای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ يَكۡتُبُ مَا يُبَيِّتُونَ﴾، واتە: ئەیزانێت و لەسەریان دەنووسێ لەلایەن ئەو فریشتانەوە کە خوا دایناون چاودێری بەندەکان بکەن، واتە لەم هەڕەشەیەدا ئەوەیە کە خوا هەواڵ دەدات بە ئەوانەی لە نێوان خۆیاندا دەیشارنەوە و ئەوەی بەشەو لەسەری رێك دەکەون بۆ بەپێچەوانەکردنی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) و سەرپێچی کردنی هەرچەندە واخۆیان دەرخستووە کە بەرفەرمانی ئەون و رێکن لەگەڵیا و خوا لەسەر ئەوانە سزایان دەدات وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَيَقُولُونَ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَبِٱلرَّسُولِ وَأَطَعۡنَا﴾ [النور: ٤٧].

فەرمایشتی: ﴿فَأَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ﴾ واتە: لێیان ببوورە و نەرم و نیانبە لەگەڵیاندا، بەوانە مەیانگرە و کاروباریان بۆ خەڵك دەرمەخە، هەروەها لێیان مەترسە ﴿وَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾ واتە: بۆ ئەو کەسانە بەسە کە خوا دۆست و سەرخەر و یارمەتیدەریان بێت.

﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلۡقُرۡءَانَۚ وَلَوۡ كَانَ مِنۡ عِندِ غَيۡرِ ٱللَّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ ٱخۡتِلَٰفٗا كَثِيرٗا ﴿٨٢﴾ وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ وَلَوۡ

رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ
وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُۥ لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٣﴾

واتە: ئاخۆ ئەمانە لە قورئان ورد نابنەوە و سەرنجی ڕانەكێشاون، ئەگەر قورئان كاری كەسێكی تر اویە غەیری خودا دیارە مەبەستی ناڕێك و دژ یەكتریان فرە تێدا پەیدا دەبوو، هەرگایەكی سەبارەت بە هێمنایەتی یان مەترسی دەنگ و باسێكیان پێدەگات سەربەخۆ لە لای هەموو كەس دەیكەنە قاو، گەر هەر لە لای پێغەمبەر و كاربەدەستەكانی خۆیان بیانگووتایە دەیانزانی ڕاستەقینەكەی كامەیەو ئەو دەنگوباسانە لە كوێوە سەریان هەڵداوە، ئەگەر چاكەو بەزەیی خواتان نەبوایە كەمتان نەبێ دەبوونە پەیڕەوی شەیتان.

خوای گەورە فەرمانیان پێ دەدا كە باش سەرنج بە قورئان بدەن و لێیان قەدەغە دەكات پشتی تێ بكەن و پشت بكەنە تێگەیشتن لە واتا بتەوەكانی زاراوە كاریگەرییەكانی و پێیان ڕادەگەیەنێ ئەو قورئانە نە جیاوازی تێدایە نە هەڵە و پەڵە و شتی دژبەیەكی تێدا نییە، چونكە چونكە لە لایەن دانایەكی ستایش كراوەوە نێردراوەتە خوارەوە كە هەقە و لە هەقەوەیە، لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ﴾، پاشان خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ ٱللَّهِ﴾ واتە ئەگەر بكرایە و هەڵبەسترایە وەك هاوبەشدانەرە نەزانەكان و دووڕووەكان لەناو دڵیاندا ئەوە جیاوازییەكی زۆریان تێدا بەدی دەكرد، بەڵام ئەم قورئانە سەلامەتە لەو جیاوازییانە، چونكە لەلایەن خواوەیە و خوای گەورە دەفەرموێت و هەواڵ دەربارەی ئەوانە دەدات كە ڕۆچوون بە زانستی داو دەفەرموێت: ﴿ءَامَنَّا بِهِۦ كُلٌّ مِّنْ عِندِ رَبِّنَا﴾ [آل عمران: ٧] واتە: بتەوە و لێكچووەكانی ڕاست و هەقن، لەبەرئەوە لێكچووەكانیان گێڕاوەتەوە بۆ بتەوەكان، ئیتر ڕێی ڕاستیان دۆزیوەتەوە، بەڵام ئەوانە چقڵ و چۆڵ لە دڵیاندا هەیە بتەوەكانیان گێڕاوەتەوە بۆ لێكچووەكان و سەریان لێشێواوە، لەبەرئەوە خوا مەدحی ئەوانە دەكات ڕۆچوون بە زانستی داو زەمی ئەوانە دەكات كە سەریان لێشێواوە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: عەمری كوڕی شوعەیب لە باوكییەوە لە باپیرییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: من و براكەم لە كۆڕێكدا دانیشتبووین مێگەلە

وشترێکم دەست بکەوتایە ئەوەندەم لا خۆش نەبوو، چونکە کۆمەڵێ لە مامۆستایانی هاوەڵانی پێغەمبەری تێدا بوو، لەسەر یەکێ لە دەرگاکان حەزمان نەکرد لە یەکیان دابڕین لە حوجرەکەدا دانیشتتین باسی ئایەتێکیان کرد جیاوازی کەوتە نێوانیان لەسەر هەتا دەنگیان بەرزبووەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بەتووڕەییەوە هاتە دەر و دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو خۆڵی تێگرتن و ئەیفەرموو: "مهلا یا قوم، بهذا أهلکت الأمم من قبلکم باختلافهم علی أنبیائهم، وضربهم الکتب بعضها ببعض، إن القرآن لم ینزل یکذب بعضه بعضا، بل یصدّق بعضه بعضا، فما عرفتم منه فاعملوا به، وما جهلتم منه فردوه إلی عالمِه" واتە: لەسەرخۆ بن ئەی قەوم بەوە نەتەوەکانی پێش ئێوە لەناوچوون کە لەگەڵ پێغەمبەرەکانیان جیاواز بوون و کتێبەکانیان دەدا بەیەکدا، ئەم قورئانە نەهاتۆتە خوارەوە هەندێکی بەدرۆ بخاتەوە بەڵکو هەندێکی هەندێکی بەراست دەگێڕێ هەرچیتان لێ زانی کاری پێ بکەن هەرچیتان لێ نەزانی بگێڕنەوە بۆ زانای خۆی.

هەروەها ئەحمەد وتویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەمرەوە هاتووە وتوویەتی: ڕۆژێك چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دانیشتبوین دوو کەس دەربارەی ئایەتێك تێکچوون، دەنگیان بەرز کردەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "إنما هلکت الأمم قبلکم باختلافهم فی الکتاب" (رواه مسلم والنسائی، من حدیث حماد بن زید)، واتە": نەتەوەکانی پێش ئێوە بە جیاوازییان دەربارەی کتێبەکەی خوا لەناوچوون.

کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا جَآءَهُمۡ أَمۡرٞ مِّنَ ٱلۡأَمۡنِ أَوِ ٱلۡخَوۡفِ أَذَاعُواْ بِهِۦۖ﴾ ئەوە ئینکاری کردنە لە لایەن خواوە دەربارەی کەسێك دەست پێشخەری بکات لە کاروبارێکدا پێش ئەوەی لێی بکۆڵێتەوە و هەواڵەکەی بڵاوبکاتەوە لەناو خەڵکدا جاری وا ئەبێ ڕاست نییە.

موسلیم لە پێشەکی سازەوارەکەیدا لە ئەبی هوڕەیرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "کفی بالمر و کذبا أن یُحدِّث بکل ما سمع" بەسە کەسێك بە درۆزن دەرچێ کاتێ هەرچی ببیستێ بڵاوی بکاتەوە.

وە لە موغیرەی کوڕی شوعبەیەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) "قیل و قال"ی قەدەغە کردبوو، واتە ئەو کەسەی زۆر دەربارەی قسەکردنی خەڵك دەدوێن بێ ئەوەی چەسپا بێت.

لە سونەنی ئەبی داوددا هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "بئس مَطِيَّة الرجل زَعَمُوا عليه". خراپترین شتێك پیاو لەسەری بڕوا ئەوەیە کە دەڵێن وادەڵێن.

لە سازەوارد‌ا هاتووە کە فەرموویەتی: "من حَدَّث بحديث وهو يرى أنه كذب فهو أحد الكاذبِيْن". هەر کەس باسی شتێك بکات و بزانێ درۆیە خۆشی یەکێکە لە درۆزنەکان. لێرەدا باسی حەدیسەکەی عومەری کوڕی خەتتاب دەکرێ کە بوخاری و موسلیم ڕێکن لەسەر ڕاستی کاتێ پێی دەگات کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ژنەکانی تەڵاق داوە، لەماڵەوە دێت بۆ مزگەوت دەبینێ خەڵك ئەوە دەڵێن، ئەویش ئارام ناگرێ ئەچێت بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لێی دەپرسێ ئایا تۆ ژنەکانت تەڵاق داوە؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (نەخێر)، عومەر وتی: بەدەنگی بەرز وتم (الله اكبر)، ئیتر بە درێژی حەدیسەکەی گێڕاوەتەوە و لای موسلیم هاتووە: عومەر وتوویەتی: لێم پرسی ئەوە ژنەکانت تەڵاق داوە؟ فەرمووی: (نەخێر) منیش لەبەر دەرگای مزگەوت بە دەنگی بەرز هاوارم کرد کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ژنەکانی تەڵاق نەداوە.

خوای گەورەش ئەم ئایەتی ناردە خوارەوە: ﴿وَإِذَا جَآءَهُمْ أَمْرٌ مِّنَ ٱلْأَمْنِ أَوِ ٱلْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِۦ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى ٱلرَّسُولِ وَإِلَىٰٓ أُوْلِى ٱلْأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ ٱلَّذِينَ يَسْتَنۢبِطُونَهُۥ مِنْهُمْ﴾ عومەر وتوویەتی: ئەوە من بووم ئەو فەرمانەم هەڵیەنجابوو.

﴿لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا﴾، عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: واتە باوەڕداران.

عەبدوڕەزاق لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە کە ﴿لَٱتَّبَعْتُمُ ٱلشَّيْطَٰنَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە: هەمووتان.

﴿فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ عَسَى ٱللَّهُ أَن

يَكُفَّ بَأْسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأْسًا وَأَشَدُّ تَنكِيلًا ﴿٨٤﴾ مَّن
يَشْفَعْ شَفَٰعَةً حَسَنَةً يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٌ مِّنْهَا ۖ وَمَن يَشْفَعْ شَفَٰعَةً سَيِّئَةً يَكُن
لَّهُۥ كِفْلٌ مِّنْهَا ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ مُّقِيتًا ﴿٨٥﴾ وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ
فَحَيُّوا۟ بِأَحْسَنَ مِنْهَآ أَوْ رُدُّوهَآ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَسِيبًا ﴿٨٦﴾
ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۚ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَا رَيْبَ فِيهِ ۗ وَمَنْ أَصْدَقُ
مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثًا ﴿٨٧﴾ ﴾

واتە: تۆ لەسەرتە لە رای خودا بچیتە غەزا و تۆ هەر ئەرکی خۆ و لەسەرە دنەو هانەی باوەڕدارەکانیش بدە، شایەت خودا لەبەدفەڕی و زەبر و زەنگی خوانەناسان بتپارێزێ، خودا لەوان بە گوڕتر و ئازادترە و لە بەڵا بەسەر هێنانیش لەوان بەدەست و برد ترە، هەرکێ بێتە تکاکار و تکای بۆ کاری چاکەبێ خۆشی بەشی تێدا هەیە هەرکەسێکیش تکا بۆ خراپە بکات، ئەویش بەشی لە خراپەکە پێدەگات، خودا لەسەر هەموو شتێ توانایە، هەرکەسێکی چاك و خۆشیتان لێدەکات ئێوە چاکتر چاك و خۆشی لەگەڵ بکەن، یان وەکو ئەو پەرسڤەکەی بدەنەوە، خوا بە هەموو شت رادەگا، جگە لە خودا هیچ شت بۆ پەرستن نابێ لە ڕۆژی هەستانەوەدا کە هاتنی بێگومانە لێکتر و کۆدەکاتەوە جا قسەی کێ لە قسەی خودا راست ترە.

خوای بەرز فەرمان دەکات بە بەندە و نێردراوەکەی موحەممەد (درووودی خوای لێ بێت) کە خۆی پەیوەندی بکات بە جەنگەوە، هەر کەس لێی دوابکەوێ ئەو هیچی بەسەریەوە نییە، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ﴾.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: ئەبی ئیسحاق وتوویەتی: لە بەڕای کوڕی عازیبم پرسی پیاوێك سەد دوژمن دەوری دەدەن ئەویش جەنگیان دژ دەکات ئایا ئەو پیاوە لەو پیاوانەیە خودا دەربارەیان فەرموویەتی: ﴿وَلَا تُلْقُوا۟ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾ [البقرة: ١٩٥] وتی: خوای بەرز بە پێغەمبەرەکەی فەرمووە: ﴿فَقَٰتِلْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفْسَكَ ۚ وَحَرِّضِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾.

ئیمام ئەحمەد لە سولەیمانی کوڕی داودەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبو ئیسحاق بە بەڕای وتووە: پیاوێك هەڵبکوتێتە سەر هاوبەشدانەرەکان لەوانەیە کە بەدەستی خۆی خۆی بخاتە تالوکەوە؟ وتی: نەخێر، خوای گەورە پێغەمبەرەکەی ناردووە و پێی فەرمووە: . ئەوە دەربارەی نەفەقەیە.

ئیبنو مەردەویە دەگێڕێتەوە لە بەڕائەوە کە وتوویەتی: کاتێ ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ﴿فَقَٰتِلۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ لَا تُكَلَّفُ إِلَّا نَفۡسَكَۚ وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾. بەهاوەڵەکانی فەرموو: پەروەردگارم فەرمانی پێکردوم بجەنگم ئێوەش بجەنگن. (حديث غريب).

﴿وَحَرِّضِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ﴾ بۆ جەنگ و ڕەغبەتیان پێ بدە و هەڵیان نێ وەك ڕۆژی بەدر پێی وتن لە کاتێکدا ریزەکانی ڕێك ئەخست: "قوموا إلى جنة عرضها السماوات والأرض".

لەوبارەیەوە فەرموودەی زۆر هاتووە بۆ هاندانی خەڵك لە سەر جەنگ، لەوانە ئەوەی بوخاری لە ئەبی هوڕیرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من آمن بالله ورسوله وأقام الصلاة، وآتى الزكاة، وصام رمضان، كان حقا على الله أن يدخله الجنة، هاجر فى سبيل الله أو جلس فى أرضه التى ولد فيها"، واتە: هەر کەس باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەبێ و نوێژ بکات و زەکات بدات و مانگی ڕەمەزان بە ڕۆژوو بێت لەسەر خوایە کە بیخاتە بەهەشتەوە وتیان: ئەی نێردراوی خوا مژدە بە خەڵك نەدەین؟ فەرمووی: لە بەهەشت سەد پلە هەیە خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی جیهاد دەکەن لە ڕێی خوادا لە نێوان هەردوو پلەیەکدا ئەوەندەی نێوان ئاسمان و زەویـیە، کاتێ داوا لە خوا دەکەن، داوای فیردەوسی لێ بکەن، چونکە لە ناوەڕاستی بەهەشتدایەو لەبەرزترین شوێنی بەهەشتدایە کە لای سەروویەوە عەرشی پەروەردگارە لەوێوە ڕووبارەکانی بەهەشت هەڵدەقوڵێ.

وە لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە هاتووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرمووە: "ئەی ئەبوسەعید هەر کەس ڕازی بێت بە خوا پەروەردگاری بێت و ئیسلام دینی بێت و موحەممەد پێغەمبەر بێت (دروودی خوای لێ بێت)

بەهەشتی بۆ پێویست دەبێت"، ئەڵێ: ئەبو سەعید پێی سەیر بوو، وتی: بۆم دووبارە بکەرەوە ئەی نێردراوی خوا! ئەویش بۆی دووبارە کردەوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "شتێکی تر هەیە خوا سەد پلە بەندەکەی پێ بەرز دەکاتەوە کە نێوان هەردوو پلە ئەوەندەی نێوان ئاسمان و زەوییە"، ئەویش وتی: ئەو شتە چییە ئەی نێردراوی خوا؟ فەرمووی: "جیهاد کردنە لە ڕێگەی خوادا" (رواه مسلم).

﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَكُفَّ بَأۡسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْۚ﴾ واتە بە پاڵنانت پێیوەیان بۆ جەنگ بەشێوەیەك هەموو بیروهۆشیان لەسەر جەنگەکە بێت دژی دوژمنان و دوورخستنەوەیان بێت لە خاکی ئیسلام و ئەهلەکەی.

﴿وَٱللَّهُ أَشَدُّ بَأۡسٗا وَأَشَدُّ تَنكِيلٗا﴾ واتە هەر خۆی توانای هەیە بەسەریاندا لە دونیا و لە ئاخیرەتدا وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ذَٰلِكَۖ وَلَوۡ يَشَآءُ ٱللَّهُ لَٱنتَصَرَ مِنۡهُمۡ وَلَٰكِن لِّيَبۡلُوَاْ بَعۡضَكُم بِبَعۡضٖۗ﴾ [محمد: ٤].

وە فەرمایشی ﴿مَّن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةً حَسَنَةٗ يَكُن لَّهُۥ نَصِيبٞ مِّنۡهَاۖ﴾ واتە: هەر کەس دەربارەی کارێك کۆشا خێری پێوە بوو ئەوە بەشی لەو خێرەدا دەبێت ﴿وَمَن يَشۡفَعۡ شَفَٰعَةٗ سَيِّئَةٗ يَكُن لَّهُۥ كِفۡلٞ مِّنۡهَاۗ﴾ واتە: تاوانی ئەو خراپەیە نەکەوێتە ئەستۆ بەپێی هەوڵ نیازەکەی وەك لە سازەوارردا چەسپاوە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "اشفعوا تؤجروا ويقضي الله على لسان نبيه ما شاء". واتە: تکا بۆ یەکتری بکەن پاداشتان دەست دەکەوێ خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە چی بوێت دای دەنێت.

موجاهیدی کوڕی جەبر وتوویەتی: ئاگادارە.

سەعیدی کوڕی جوبەیر و سوودی و ئیبنو زەید وتوویانە: بە توانایە.

ززەحاك وتوویەتی: ڕۆزیدەرە.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: پیاوێك لە عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحەی پرسی: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ مُّقِيتٗا﴾ مانای چییە؟ وتی: بۆ هەموو مرۆڤێك ئەوەندەی کردەوەکانی ئەیپارێزێ.

﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٖ فَحَيُّواْ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ﴾ واتە: ئەگەر

موسڵمانێك سڵاوی لێ کردن بە چاکترین شێوە وەڵامی بدەنەوە، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە، لەبەرئەوە بە زیادەوە وەڵامدانەوە پەسەندە، بەڵام وەك خۆی فەرزە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە سەلمانی فارسییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: (السلام علیكَ یا رسول الله) پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (وعلیك السلام ورحمه الله)، پاشان پیاوێکی تر هات وتی: (السلام علیك یا رسول الله ورحمة الله وبرکاته)، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: (وعلیك السلام ورحمة الله وبرکاته)، پاشان پیاوێکی تر هات وتی: (السلام علیك یا رسول الله ورحمة الله وبرکاته)، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (وعلیك)، پیاوەکە بە پێغەمبەری وت: ئەی نێردراوی خوا فڵان کەس و فڵان کەس هاتن سڵاویان لێ کردی بە زۆرتر وەڵامت دانەوە لەوەی وەڵامی منت دایەوە، فەرمووی: (تۆ هیچت بۆ ئێمە نەهێشتەوە، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا حُيِّيتُم بِتَحِيَّةٍ فَحَيُّوا۟ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ﴾، ئێمەش وەڵامی سڵاوەکەمان دایەوە).

لەم فەرموودەیەدا بەڵگەی ئەوە هەیە کە لە سەر ئەو شێوەیە زیادە لە سڵاودا نییە کە ئەویش (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته)، چونکە ئەگەر لەوە زیاتر مەشروع بوایە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە زیادەوە وەڵامی دەدایەوە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عیمرانی کوڕی حوصەینەوە هاتووە کە پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: (السلام علیکم یا رسول الله) پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وەڵامی دایەوە، پاشان کابرا دانیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: دە جار، پاشان پیاوێکی تر هات وتی: (السلام علیکم ورحمة الله یا رسول الله)، پێغەمبەریش وەڵامی سڵاوەکەی دایەوە، پاشان پیاوەکە دانیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (بیست جار)، پاشان پیاوێکی تر هات وتی: (السلام علیك ورحمة الله وبرکاته)، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وەڵامی سڵاوەکەی

دایەوە، پاشان دانیشت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: (سي)، (قال الترمذي حسن غريب من هذا الوجه).

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: هەر کەس لە خەڵکی خوا سڵاوی لێ کردن وەڵامی بدەرەوە ئەگەر مەجوسیش بوو، لەبەرئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی: ئێوە بە چاکتر وەڵامی بدەنەوە، یان وەك خۆی وەڵامی بدەنەوە.

قەتادە وتوویەتی: بە چاکتر لەوەی خۆی وەڵامی بدەنەوە، واتە بۆ موسڵمانەکان یان وەك خۆی بۆ ئەهلی ژیمە.

ئەوە چاوپیاخشاندنەوەی دەوێت وەك لە حەدیسەکەی پێشوودا باس کراوە کە مەبەست لێی ئەوەیە وەڵام بداتەوە بەچاکتر لەوەی سڵاوی لێ کردووە ئەگەر ئەوپەڕی ئەوەی دانراوە لە سڵاو گەیشت بە موسڵمان وەك خۆی وەڵامی دەدرێتەوە.

بەڵام ئەهلی ذیمە لە پێشەوە سڵاو ناکەن، بە زیادەشەوە وەڵام نادرێنەوە، بەڵکو بەو شێوەیە وەڵام دەدرێنەوە کە چەسپاوە لە هەردوو سازەواردا لە ئیبنو عومەرەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إذا سلم عليكم اليهود فإنما يقول أحدهم: السام عليك فقل: وعليك"، ئەگەر جولەکە سڵاوی لێ کردن لەوانەیە بڵێ (السام عليك) وشەی (سام) واتە مردن، ئێوەش بڵێن: (وعليك).

لە سازەواری موسلیمدا لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا تبدؤوا اليهود والنصارى بالسلام، وإذا لقيتموهم في طريق فاضطروهم إلى أضيقه" ئێوە لە پێشەوە سڵاو لە جولەکە و گاور مەکەن کاتێ لە ڕێگا پێیان گەیشتن، ناچاریان بکەن لە لاتەسکەوە بڕۆن.

سوفیانی سەوری لە پیاوێکەوە لە حەسەنی بەسرییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: سڵاو کردن ئارەزووە، بەڵام ڕەددانەوەی پێویستە.

ئەوەی ئەو وتوویەتی: قسەی زانایانە، چونکە وەڵامدانەوەی پێویستە لەسەر ئەو کەسانەی سڵاوت لێ دەکەن، ئەو کەسە تاوانبار دەبێ ئەگەر ئەوە

نەکات، چونکە پێچەوانەی فەرمانی خوایە، کە فەرموویەتی: ﴿فَحَيُّوا۟ بِأَحۡسَنَ مِنۡهَآ أَوۡ رُدُّوهَآۗ﴾ لەو فەرموودەیەدا کە ئەبو داود بەسەنەدی خۆی لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "والذي نفسي بيده، لا تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا، ولا تؤمنوا حتى تحابوا، أفلا أدلكم على شيء وإذا فعلتموه تحاببتم أفشوا السلام بينكم". بەوەی گیانی منی بەدەستە ناچنە بەهەشتەوە هەتا باوەڕنەهێنن، وە باوەڕناهێنن هەتا یەکترتان خۆش نەوێت، ئایا کارێکتان پێ نەڵێم کاتێ کردتان یەکترتان خۆش بوێ؟ لەناو خۆتاندا سڵاو لە یەکتری بکەن.

کە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ﴾ هەواڵ دانە بەوەی تاك و تەنهاو بێ هاوبەشە و ئەبێ هەموو دروستکراوەکانی ئەو بپەرستن، وە ئەمە سوێندی تێدایە بۆ فەرموودەی: ﴿لَيَجۡمَعَنَّكُمۡ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ لَا رَيۡبَ فِيهِۗ﴾ ئەو لامە بۆ قەسەم دانراوە کە دەفەرموێ: ﴿ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ﴾ هەواڵ و سوێند خواردنە کە سەرەتاو کۆتایی بوونەوەر لەسەر یەك شوێنی بەرز کۆدەکاتەوە هەر کەس بەپێی کردەوەی خۆی پاداشتی دەداتەوە.

کە دەفەرموێ: ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾ واتە: کەس لەو خوایە ڕاستگۆتر نییە لە قسەکانیداو لە هەواڵەکانیداو لە پەیمان و هەڕەشەکانیدا، چونکە جگە لەو خوایەکی تر نییە و لە ئەو زیاتر کەس پەروەردگار نییە.

﴿فَمَا لَكُمۡ فِي ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِئَتَيۡنِ وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ أَتُرِيدُونَ أَن
تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا ٨٨ وَدُّواْ لَوۡ
تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي
سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ
مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا ٨٩ إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ
أَوۡ جَآءُوكُمۡ حَصِرَتۡ صُدُورُهُمۡ أَن يُقَٰتِلُوكُمۡ أَوۡ يُقَٰتِلُواْ قَوۡمَهُمۡۚ وَلَوۡ شَآءَ
ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمۡ عَلَيۡكُمۡ فَلَقَٰتَلُوكُمۡۚ فَإِنِ ٱعۡتَزَلُوكُمۡ فَلَمۡ يُقَٰتِلُوكُمۡ وَأَلۡقَوۡاْ إِلَيۡكُمُ
ٱلسَّلَمَ فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا ٩٠ سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ

أَن يَأْمَنُوكُمْ وَيَأْمَنُوا۟ قَوْمَهُمْ كُلَّ مَا رُدُّوٓا۟ إِلَى ٱلْفِتْنَةِ أُرْكِسُوا۟ فِيهَا ۚ فَإِن لَّمْ
يَعْتَزِلُوكُمْ وَيُلْقُوٓا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ وَيَكُفُّوٓا۟ أَيْدِيَهُمْ فَخُذُوهُمْ وَٱقْتُلُوهُمْ حَيْثُ
ثَقِفْتُمُوهُمْ ۚ وَأُو۟لَٰٓئِكُمْ جَعَلْنَا لَكُمْ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿٩١﴾

واتە: ئێوە چیتان دەربارەی ئەو دووڕووانە، خۆتان کردووەتە دوو تاقم، لەبەر کاری کردویانە بەرەو ژووری کردوونەوە و بە خوانەناسی داناون! ئاخۆ ئێوە دەتانەوێ کەسێ خوا ڕێگەی لێ ون کا بیخەنەوە سەر ڕاستە ڕێ، هەرکەسێ خودا ڕێگەی لێ بگۆڕێ تۆ ناتوانی ڕێگایەکی بۆ پەیدا کەی، ئەو دووڕووانە ـ هەروەك خۆیان بێ دینن ـ گەرەکیانە ئێوەش لە دینەکەت وەرگێڕن، ئەوسا وەکو یەکتان لێ بێت، جا تا ئەوان لە ڕێی خودا خۆیان دەربەدەر نەکەن و لەگەڵتان نەیەن بۆ غەزا ئێوە دۆستایەتییان لەگەڵ مەکەن، ئەگەر ئەم کارەشیان نەکرد ئێوە لەهەرکوێ تووشیان بوون ڕێی هەڵاتنیان مەدەنێ و فەراقی ڕەشیان لێ ببڕن، لەگەڵ هیچ کامیش لەوانە دۆستایەتییتان هەر نەبێ و یار و یاوەر لە نێوانیاندا هەڵمەبژێرن، جگە لەوانەی کە پەیمانیان لەگەڵ کەسانێك دا هەیە، کە ئەوانیش بوونەتە هاوپەیمانی ئێوە، یان ئەوانەی لە ناچاری هاتوونە بەر داڵدەی ئێوە و لەو ناوەدا دوودڵ ماون کە بەگژ ئێوەدا بچن، یا تووشی خزم کوشتن بن، ئەگەر خودا مەیلی لێ با هێندەی دەسەڵات پێ دەدان کە بەگژتاندا بچنەوەو سەریش کەون، ئەگەر خۆیان لە ئێوە دوورخستەوەو بەگژتاندا نەهاتن و دەیانەوێ شەڕتان لەناودا نەمێنێ، خودا ڕێگەی پێنەداون کە ئێوە دەستیان بۆ بەرن، لەگەڵ گرۆیەکی تریشدا ئێوە ڕووبەڕوو دەبنەوە کە دەیانەوێ هەم لە ئێوە و هەم لە خزم و کەس و کاریان ئارخەیان بن، هەروەختێکی ئەوان لێیان بگێڕنەوە بێ سێ و دوو کردن دەچنە خزمەتیان، جا ئەوانەی لێتان نەتەکنەوە و دەست لەبەدفەڕی هەڵنەگرن لەهەرکوێ بەگیروهێنان بیانکوژن و مەهێڵن لە دەستت ڕاکەن، ئەوا ئێمە لەسەر ئەوان دەسەڵاتی تەواومان داوە بە ئێوە.

خوای گەورە ئینکاری لە باوەڕدارەکان دەکات لەبەر ئەوەی دەربارەی مونافیقەکان بوونە دوو کۆمەڵ، وە جیاوازی کەوتۆتە نێوانیانەوە بەهۆی ئەوەوە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە زەیدی کوڕی سابیتەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چوو بۆ ئوحود ئەوانەی لەگەڵیا ڕۆیشتبوون گەڕانەوە کە بووبوونە دوو کۆمەڵ، کۆمەڵێکیان دەیانوت: با جەنگیان دژ بکەین، وە کۆمەڵێکیان دەیانوت: ناجەنگین دژیان ئەوانە باوەڕداریش بوون، خوای گەورە ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾ی ناردە خوارەوە. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "إنها طَيِّبة، وإنها تنفى الخَبَث كما تنفى النار خبث الفضة". واتە: ئەوە زۆر خۆشە پیس پاك دەکاتەوە وەك کوورە پیسی زیوو ناهێڵێ". (أخرجاه فی الصحيحين، من حديث شعبة) .

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق دەربارەی جەنگی ئوحود دەگێڕێتەوە کە عەبدوڵلای کوڕی ئوبەی کوڕی سەلول بە سێ یەکی سوپاکەیەوە گەڕایەوە کە ژمارەیان سێ سەد کەس بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە حەوت سەد کەسەوە مایەوە.

عەوفی لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە ئەم ئایەتە دەربارەی کۆمەڵێك کە لە مەککەدا بوون هاتۆتە خوارەوە وا خۆیان دەردەخست موسڵمانن، بەڵام پشتی هاوبەشدارەکانیان گرتبوو. لە مەککە چوونەدەر بۆ ئیشی خۆیان ئەیانووت: ئەگەر گەیشتن بە هاوەڵانی موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) خراپەمان دەربارە ناکەن. باوەڕدارەکان کاتێ ئەو هەواڵەیان پێگەیشت کە لە مەککە هاتوونەتە دەر، کۆمەڵێکیان وتیان: سوار بن بچین بەرەو ڕووی ئەو ترسنۆکانە بیانکوژن، چونکە ئەوانە پشتی دوژمنەکانتانیان گرتووە، بەڵام کۆمەڵێکی تر لە باوەڕدارەکان ئەیانووت: (سبحان الله) ئایا کۆمەڵێك دەکوژن ئێوە چیی دەڵێن ئەوانیش ئەوە دەڵێت، لەبەرئەوەی کۆچیان نەکردووە و ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ نەهێشتووە ئەبێ خوێنیان حەڵاڵ بکەن و ماڵیان بەتاڵان ببەن؟ بەو شێوەیە باوەڕدارەکان بوونە دوو کۆمەڵ، پێغەمبەریشیان لەناودا بوو ڕێی لە هەردوو کۆمەڵەکە نەدەگرت، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿فَمَا لَكُمْ فِي الْمُنَافِقِينَ فِئَتَيْنِ﴾ (رواه ابن ابی حاتم).

زەیدی کوڕی ئەسلەم لە کوڕی موعازەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەوە دەربارەی قسەکانی تیرەی ئەوس و خەزرەج هاتۆتە خوارەوە کە دەربارەی

عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی سەلول ئەیانوت: کاتێ عوزری دەهێنایەوە بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لەسەر مینبەر دەربارەی کێشەی ئیفك (ئەمەش غەریبە)، وە غەیری ئەوەشیان وتووە.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَٱللَّهُ أَرۡكَسَهُم بِمَا كَسَبُوٓاْۚ﴾، واتە: گێڕانییەوە و خستنێ ناو هەڵەوە، ئیبنو عەباس وتوویەتی: ﴿أَرۡكَسَهُم﴾، واتە: خستنێ، قەتادە وتوویەتی: واتە لەناوبردن، وە سوودی وتوویەتی: واتە: گومڕای کردن: ﴿بِمَا كَسَبُوٓاْۚ﴾، بەهۆی سەرپێچی و ناکۆکییان لەگەڵ پێغەمبەر و شوێنکەوتووانیدا بە باتڵ: ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَهۡدُواْ مَنۡ أَضَلَّ ٱللَّهُۖ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا﴾ واتە: ڕێگا نییە بۆ هیدایەتدانیان و ڕزگارکاریان نییە بۆی.

وە فەرمایشی: ﴿وَدُّواْ لَوۡ تَكۡفُرُونَ كَمَا كَفَرُواْ فَتَكُونُونَ سَوَآءٗۖ﴾، واتە: ئەوانە ئاواتەخوازی ئەوەن کە ئێوەش گومڕا بن و یەکسان بن، ئەوەش لەبەرئەوەی زۆر ڕقیان لێتانەو دژایەتیشتان دەکەن، لەبەرئەوە خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿فَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ أَوۡلِيَآءَ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِۚ فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ واتە: کۆچیان نەکرد. عەوفی دەڵێت لە ئیبنو عەباسەوە. سوودی وتوویەتی: بێ باوەڕی خۆیان ئاشکرا کرد ﴿فَخُذُوهُمۡ وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡۖ وَلَا تَتَّخِذُواْ مِنۡهُمۡ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرًا﴾ واتە: نە دۆستایەتییان بکەن و نە یارمەتییان بدەن بۆ سەرکەوتن بە سەر دوژمنەکانیاندا هەتا بەو شێوەیە بن، پاشان خوا کۆمەڵێك لەوانە هەڵدەوێرێ دەفەرمووێ: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوۡمِۭ بَيۡنَكُمۡ وَبَيۡنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾ واتە: ئەوانەی پەنایان برد بۆ هۆزێك لە نێوان ئێوە و ئەواندا هودنە هەبێت یان پەیمانی زیمەیان لەگەڵیانا هەبوو، حوکمی ئەوانیش وەك حوکمی ئەوانی لێ بکەن، ئەوە قسەی سوودی و ئیبنو زەید و ئیبنو جەریرە.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە کە سوراقەی کوڕی مالیکی مەدلەجی بۆی گێڕاونەوە وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بەسەر هاوبەشدانەرەکانی بەدر و ئوحوددا سەرکەوت ئەوانەی دەوروپشتیان موسڵمان بوون، سوراقە وتوویەتی: پێمگەیشت ئەیەوێ خالیدی کوڕی وەلید بنێرێ بۆ سەر هۆزەکەم کە ناوی بەنی مەدلەج بوو، هاتم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێم وت: ئەتەوێت خالیدج بنێری بۆ سەر

هۆزەکەم؟ هاوەڵەکان وتیان: بێ دەنگ بە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: وازی لێ بهێنن بزانین چی دەوێت؟ وتی: پێمگەیشتووە کە ئەتەوێ سوپاکە بکەیتە سەر هۆزەکەم، من ئەمەوێ بچم بۆ لایان بانگیان بکەم بۆ سەر ئیسلام، ئەگەر قەومەکەت موسڵمان بوون سەلامەت دەبن و دێنە ناو ئیسلامەوە، ئەگەر موسڵمانیش نەبوون قەومەکەت با دڵیان ڕەق نەبێت بەرامبەریان، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەستی خالیدی گرت و پێی فەرموو: "لەگەڵ ئەمەدا بڕۆ چی دەوێت ئەوە بکە" خالید لەگەڵیانا ڕێککەوت کە یارمەتی بێ باوەڕەکان نەدەن دژی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، ئەگەر قوڕەیش موسڵمان بوون ئەوانیش لەگەڵیاندا موسڵمان بن، خـــــوای گـــــەورە ﴿وَدُّوا۟ لَوْ تَكْفُرُونَ كَمَا كَفَرُوا۟ فَتَكُونُونَ سَوَآءًۭ ۖ فَلَا تَتَّخِذُوا۟ مِنْهُمْ أَوْلِيَآءَ﴾. نادرە خوارەوە.

ئیبنو مەردەویە لە ڕێگای حەمادی کوڕی سەلەمەوە دەگێڕێتەوە کە وتوویەتی: خوای گەورە: ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ يَصِلُونَ إِلَىٰ قَوْمٍۭ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ﴾ی نادرە خوارەوە، ئەوانەی پێیان گەیشتبوو لەگەڵیاندا بوو لەسەر پەیمانی خۆیان.

لە سازەواری بوخاریدا دەربارەی بەسەرهاتی پەیمانی حودەیبیە کە هەر کەس ئەیەوێ لەگەڵ قوڕەیشدا پەیمان ببەستێ با پەیمان ببەستێ، وە هەر کەس دەیەوێ لەگەڵ پێغەمبەر و هاوەڵەکانیدا پەیمان ببەستێ با پەیمان ببەستێ.

لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئەو ئایەتە، ئایەتی: ﴿فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلْأَشْهُرُ ٱلْحُرُمُ فَٱقْتُلُوا۟ ٱلْمُشْرِكِينَ حَيْثُ وَجَدتُّمُوهُمْ﴾ [التوبة: ٥] سڕیویەتییەوە.

کە دەفەرموێت: ﴿أَوْ جَآءُوكُمْ حَصِرَتْ صُدُورُهُمْ﴾ ئەوانەش کۆمەڵێکی ترن لە هەڵاوێردراوەکان لە فەرمانی جەنگ کردن دژیان کە ئەوان کاتێ دەچوون بۆ جەنگ زۆریان لا ناخۆش بوو کە بجەنگن دژتان، ﴿أن يقاتلوكم أو يقاتلوا﴾ بەلاشیانەوە گرنگ نییە کە دژی قەومەکەیان بجەنگن لەگەڵ ئێوەدا، بەڵکو ئەوانە لەسەر ئێوەن دژی ئێوەن ﴿وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَسَلَّطَهُمْ عَلَيْكُمْ فَلَقَٰتَلُوكُمْ﴾، لە لوتفی خواوەیە کە ئەوانەی لێ دوورخستوونەتەوە ﴿فَإِنِ ٱعْتَزَلُوكُمْ فَلَمْ يُقَٰتِلُوكُمْ وَأَلْقَوْا۟ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَمَ﴾ واتە: سەلامەتی ﴿فَمَا جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ

عَلَيۡهِمۡ سَبِيلٗا﴾ واتە: بۆتان نییە بجەنگن دژیان مادام ئەوە حاڵیان بێت، وە ئەوانەش وەك ئەو كۆمەڵەیەن كە ڕۆژی بەدر لەبەنی هاشم دەرچوون لەگەڵ هاوبەشدانەرەكاندا و ئامادەی جەنگ بوون لەگەڵ ئەوەشدا لایان ناخۆش بوو وەك عەباس، لەبەرئەوە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) قەدەغەی كرد عەباس بكوژن و فەرمانی دا بە دیلی بیگرن.

﴿سَتَجِدُونَ ءَاخَرِينَ يُرِيدُونَ أَن يَأۡمَنُوكُمۡ وَيَأۡمَنُواْ قَوۡمَهُمۡ﴾ ئەوانە لە وێنای ڕواڵەتدا وەك ئەوانەی پێشوویانن، بەڵام نیەتی ئەوانە وەك نیەتی ئەوانی تر نییە، چونكە ئەوانە كۆمەڵێك مونافیق بوون واخۆیان دەردەخست بۆ پێغەمبەر و هاوەڵەكانی كە لەسەر ئیسلامن بۆ ئەوەی سەلامەت بن لەگەڵ ئەوەشدا لە ناوكەدا لەگەڵ ئەوانی تر بوون وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ إِلَىٰ شَيَٰطِينِهِمۡ قَالُوٓاْ إِنَّا مَعَكُمۡ﴾ [البقرة: ١٤].

وە لێرەدا فەرموویەتی: ﴿كُلَّ مَا رُدُّوٓاْ إِلَى ٱلۡفِتۡنَةِ أُرۡكِسُواْ فِيهَاۚ﴾، واتە: تووشی هاوبەش دانان بوون.

ئیبنو جەریر لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە كە ئەوە دەربارەی كۆمەڵێك لە خەڵكی مەككە هاتۆتە خوارەوە كاتێ ئەهاتن بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە ڕیایی سڵاویان لێ دەكرد، پاشان ئەگەڕانەوە بۆ ناو قورەیش دەستیان دەكردەوە بە بت پەرستی، مەبەستیشیان لەوە ئەوەبوو كە سەلامەت لێرەو لەوێ، لەبەرئەوە خوا فەرمانی داوە بە شەڕكردن دژیان ئەگەر لەوانە جیانەبنەوە و خۆیان چاك نەكەن، لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَإِن لَّمۡ يَعۡتَزِلُوكُمۡ وَيُلۡقُوٓاْ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَمَ﴾ هودنەو سوڵح ﴿وَيَكُفُّوٓاْ أَيۡدِيَهُمۡ﴾ واتە: لە شەڕ ﴿فَخُذُوهُمۡ﴾ بە دیلیی ﴿وَٱقۡتُلُوهُمۡ حَيۡثُ ثَقِفۡتُمُوهُمۡۚ﴾ واتە لەهەركوێ پێیان گەیشتن ﴿وَأُوْلَٰٓئِكُمۡ جَعَلۡنَا لَكُمۡ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٗا مُّبِينٗا﴾ واتە: بە ڕوون و ئاشكرا.

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤۡمِنٍ أَن يَقۡتُلَ مُؤۡمِنًا إِلَّا خَطَـٔٗاۚ وَمَن قَتَلَ مُؤۡمِنًا خَطَـٔٗا فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ مُّؤۡمِنَةٖ وَدِيَةٞ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْۚ فَإِن كَانَ مِن قَوۡمٍ عَدُوّٖ لَّكُمۡ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَتَحۡرِيرُ رَقَبَةٖ

مُّؤْمِنَةٍ وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَٰقٌ فَدِيَةٌ
مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦ وَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ
شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ تَوْبَةً مِّنَ ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿٩٢﴾
وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ خَٰلِدًا فِيهَا
وَغَضِبَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ وَلَعَنَهُۥ وَأَعَدَّ لَهُۥ عَذَابًا عَظِيمًا ﴿٩٣﴾﴾

واتە: هیچ باوەڕداریێ بۆی نییە باوەڕدارێکی تر بکوژێ، جا مەگین بە هەڵە چوویێ، هەرکەسێکیش باوەڕدارەو باوەڕداری بە هەڵە بە دەست کوژراوە، دەبێ لەبری ئەو کوشتنە کۆیلەیەکی خاوەن باوەڕ ئازاد بکات و لە خوێنباییش بدات بە کەس و کارەکەی، جا مەگین پیاوەتی بکەن و پێی ببەخشن، ئەگەر کوشتە باوەڕدارە و سەر بە هۆزی دوژمنتانە، ئەوەی بەدەستی کوژراوە لەسەریەتی کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات و لە خوێنبایی وازبهێنێ ئەگەر کوشتە لە هۆزێکی خوانەناسە و لەگەڵ ئێوەدا سوێندخۆرن دەبێ خوێنباییەکەی بدرێ و بەندەیەکی باوەڕداریش ئازاد بکات، ئەوە کەسەی ئەو کارەی لەدەس قەومیوە و ناتوانێ بەندە ئازاد بکات لەسەریەتی دوو مانگی ڕەبەق لەسەریەك بە ڕۆژوو بێ، هەتا خودا پەشیمانی لێ قبوڵ دەکات، خودا زانای لەکارزانە، هەرکەسێکیش هەر لە ئەنقەست خاوەن باوەڕێك بکوژێ، لەبری ئەوە هەتا هەتایە هەر لەناو جەهەننم دایەو خودا لێی بەرکدا چووە و وەبەرنەحلەتی خستووە و ئازاردانێکی دژواری بۆ داناوە.

خوای گەورە دەفەرموێت بۆ باوەڕدار نییە بەشێوەیەك لە شێوەکانی برای باوەڕداری خۆی بکوژێ، وەك چەسپاوە لە هەردوو سازەواردا لە ئیبنو مەسعودەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا يحل دم امرئ مسلم يشهد أن لا إله إلا الله، وأني رسول الله إلا بإحدى ثلاث: النفس بالنفس، والثيب الزاني، والتارك لدينه المفارق للجماعة". واتە: خوێنی هیچ کەسێکی موسڵمان ڕەوا نییە بڕژێنێ کە وتبێتی: "لا اله الا الله ومحمد رسول الله" بە سێ شت نەبێ: ئەگەر کەسێکی بەناهەق کوشتبێ یان

بەسالاچوویەك زینای کردبێ یان کەسێك وازی لە ئایینەکەی هێنابێ و لە کۆمەڵی موسڵمانان جیابووبێتەوە.

پاشان ئەگەر شتێك لەو سیانە روویدا بۆ کەس نییە لە تاکەکانی کۆمەڵ ئەو کەسە بکوژێت، بەڵکو ئەبێ پێشەوای موسڵمانان یان جێگرەکەی ئەو کارە بکەن.

کە دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا خَطَـًٔا﴾ وتوویانە ئەو هەڵاوێردانی دابڕاوە وەك شاعیرێك دەڵێت:

من البيض لم تَظْعَنْ بعيدًا ولم تَطَأْ

علـى الأرض إلا رَيْـطَ بُـرْد مُـرَحَّـل

بۆ ئەوە شاهیدی زۆر هەیە.

دەربارەی هاتنە خوارەوەی ئەوە، جیاوازی زۆر هەیە، موجاهید و چەند کەسی تر وتوویانە: دەربارەی عەیاشی کوڕی ئەبی ڕەبیعەی برای دایکی ئەبوجەهل هاتۆتە خوارەوە. ئەویش لەبەرئەوەی پیاوێکی کوشتبوو لەسەر ئەوەی موسڵمان بوو بوو بە سزادان لەگەڵ براکەیدا، ئەویش حاریسی کوڕی یەزیدی غامیدی بوو، عەیاش لە دڵی خۆیدا وای دانابوو ئەو پیاوە بکوژێ، بەڵام ئەو پیاوە موسڵمان دەبێت و کۆچ دەکات بۆ مەدینە بێ ئەوەی عەیاش ئاگاداری بێت، ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە عەیاش کابرا دەبینێ ئەزانێ لەسەر ئایینە کۆنەکەیەتی پەلاماری دەداو دەیکوژێ، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە.

وە عەبدوڕەحمانی کوڕی زەید وتوویەتی: دەربارەی ئەبی دەردا هاتۆتە خوارەوە، چونکە پیاوێکی کوشتبوو لەوکاتەدا شایەتومانی هێنابوو، بەڵام ئەم هەر کوشتبووی، ئەوەی بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) باس کرد و وتی: بۆ خۆپاراستن شایەتومانی هێنا، پێغەمبەریش (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئایا تۆ دڵیت هەڵدڕی بوو؟

ئەم بەسەرهاتە لە سازەواردا هاتووە دەربارەی کەسێکی ترە.

﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَـًٔا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهْلِهِۦٓ﴾

ئەوە دوو شتی پێویستن دەربارەی کوشتنی هەڵە: یەکەم: کەفارەتی ئەوەیە کە ئەو تاوانە گەورەیەی ئەنجام داوە با بە هەڵەش بێت لە مەرجەکانی ئەوەیە کە ئازادکردنی کۆیلەیەکی باوەڕدارە، بێ باوەڕ دروست نییە.

ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەباس و شەعبی و ئیبراهیمی نەخەعی و حەسەنی بەسرییەوە دەگێڕێتەوە وتوویانە: بەندەی تەمەن کەمیش دروست نییە هەتا بالّغ نەبێ.

لە ڕێگەی عەبدولڕەزاقەوە لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئازادکردنی کۆیلەی باوەڕدر منداڵ ناگرێتەوە.

بەڵام ئیبنو جەریر ئەوەی هەڵبژاردوە کە ئەگەر لە دایك و باوکی موسڵمان بێت دروستە ئەگینا نا.

بەڵام ئەوەی جەماوەری لەسەرە ئەوەیە هەر موسڵمان بێت دروستە بۆ کەفارەت، گەورە بێت یان بچووك.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عەبدوڵلای کوڕی عەبدوڵلاوە هاتووە لە پیاوێکی ئەنسارییەوە: کە کەنیزەکێکی ڕەشی هێناوە و وتوویەتی: ئەی نێردراوی خوا من ئازادکردنی بەندەیەکی کۆیلەم لەسەرە، ئەگەر بزانی ئەم باوەڕدارە ئەوە ئازادی دەکەم، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە کۆیلەکەی فەرموو: شایەتی دەدەیت کە جگە لە خوا خوایەکی تر نییە؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: شایەتی دەدەیت کە من نێردراوی خوام؟ وتی: بەڵێ، فەرمووی: باوەڕت بە زیندووبوونەوەی دوای مردن هەیە؟ وتی: بەڵێ، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئازادی بکە. (ئەوە ئیسنادێکی ڕاستە، نەزانینی ناوی سەحابە زیانی نییە).

لە کتێبی (الموطأ) دا هاتووە لە موعاویەی کوڕی حەکەمەوە وتوویەتی: کاتێ ئەو کەنیزەکە ڕەشەی هێنا، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: خوا لە کوێیە؟ ئەویش وتی: لە ئاسمان، فەرمووی: من کێم؟ وتی: نێردراوی خوا، فەرمووی: ئازادی بکە ئەوە باوەڕدارە.

﴿وَدِيَةٌ مُّسَلَّمَةٌ إِلَىٰٓ أَهۡلِهِۦٓ﴾، ئەوەش واجبی دووەمە لە نێوان بکوژ و

کەسوکاری کوژراوەکەدا بریتییەکە، لەبەرئەوەی ئەوەیان لەدەست چووە، ئەو خوێنباییەش بە چەند پێنجیەك پێویستە وەك ئیمام ئەحمەدو ئەهلی سونەن لە حەدیسی حەبابی کوڕی ئەرتەوە لە زەیدی کوڕی جوبەیرەوە لە خەشفی کوڕی مالیکەوە لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر خوێنبایی کوشتنی هەڵەی بە بیست (بنت محاض) و بریست (بنی محاض) کە نێر و (بنت لبون) و بیست (جەذعە) و بیست (حقة)ی دانا.

وە وتراوە: ئەو خوێنباییەیە لەسەر کەسوکاری بکوژەکە نەك لە ماڵی خۆی.

شافیعی وتوویەتی: نازانم کەسێك پێچەوانەی ئەوەبێ کە پێغەمبەر خوێنبایی لەسەر کەسوکاری بکوژ داناوە. ئەوەی شافیعی ئاماژەی پێکردووە لە چەند فەرموودەیەکدا چەسپاوە، لەوانە ئەوەی چەسپاوە لەهەردوو سازەواردا لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە وتوویەتی: دوو ژنی بەنی هوزەیل شەڕیان دەبێت، یەکێکیان بەردێك ئەگرێتە ئەویتریان و دەیکوژێ، منداڵێکیشی لە زگدا دەبێت، کێشەکەیان بردە لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)، ئەویش داینا کە خوێنبایی کۆرپەکە بەندەیەکی تەمەن بچووك یان کەنیزەکێك و خوێنبایی ژنەکە لەسەر کەسوکاری بکوژەکە دانا، ئەوەش ئەوە پێویست دەکات کە حوکمی قەستی هەڵە حوکمی پەتییە دەربارەی پێویست بوونی خوێنبایی، بەڵام ئەو خوێنباییە پێویستە سێ یەك سێ یەك بێت.

﴿إِلَّآ أَن يَصَّدَّقُواْ﴾ واتە خوێنبایی تێیدا پێویستە کە بدرێ بەکەسوکاری مەگەر لێی ببورن ئەوکاتە پێویست نییە.

لە سازەواری بوخاریدا هاتووە لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) خالیدی کوڕی وەلیدی نارده سەر بەنی خوزەیمە، ئەویش بانگی کردن بۆ سەر ئیسلام، بەڵام بە چاکی نەیاندەزانی بڵێن (اسلمنا) واتە موسڵمان بووین، بەڵکو ئەیانوت: (صبأنا، صبأنا)، خالید دەستی کردووە بە کوشتنیان، ئەوە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دەستی هەڵبڕی و فەرمووی: "اللهم إني أبرأ إليك مما صنع خالد". خوایە من داوای ئەوەت

لێدەکەم بەریم بکەی لەوەی خالید کردوویەتی. پاشان عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) نارد خوێنبایی کوژراوەکانی داو هەرچیماڵێکیان زیانی پێگەیشتبوو بۆی بژاردن.

ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێوەردەگیرێ کە هەڵەی پێشەوا، یان جێگرەکەی لەسەر خانەی دارایيە.

وە فەرموویەتی: ﴿فَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ عَدُوٍّ لَّكُمْ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾، واتە ئەگەر کوژراوەکە باوەڕدار بوو، بەڵام کەسوکاری بێباوەڕبوون و دژی ئیسلام ئەجەنگان خوێنباییان پێنادرێ، بەڵام لەسەر بکوژەکە پێویستە کۆیلەیەکی باوەڕدار ئازاد بکات و بەس.

﴿وَإِن كَانَ مِن قَوْمٍ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُم مِّيثَاقٌ﴾ واتە: ئەگەر کوژراوەکە کیسوکاری ئەهلی زیممە بوو، یان هودنە هەبوو لە نێواندا خوێنبایی کوژراوەکەیان بۆ هەیە، جا ئەگەر کوژراوەکە باوەڕدار بوو خوێنباییەکەی ئەبێ بە تەواوی بێت. بەوشێوەیەش ئەگەر بێباوەڕ بوو لای کۆمەڵێك لە زانایان.

وە وتراوە نیوەی خوێنبایی موسڵمانێك دەبێ، وە وتراوە: سێیەکی وەك لە کتێبی (الاحکام) دا بە درێژی باسکراوە، وە لەسەر بکوژ پێوستە کۆیلەکی باوەڕدار ئازاد بکات.

﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ شَهْرَيْنِ مُتَتَابِعَيْنِ﴾ واتە بەسەریەکەوە هەتا کۆتایی دوو مانگەکە بە ڕۆژوو بێت، ئەگەر ڕۆژێکی نێوان خست بەبێ بەهانە لە نەخۆشی و بێ نوێژی و زەیستانی ئەبێ لە سەرەوە دەست پێ بکاتەوە. وە زانایان دەربارەی سەفەرکردن جیاوازییان هەیە کە ئایا ڕۆژووەکەی دەبرێ یان نا لە سەر دوو قەول.

﴿توبة من الله وكان الله عليما حكيما﴾ واتە: ئەوە تۆبە کردنی بکوژە بە هەڵە کاتێ نەتوانێ بەندەیەك ئازاد بکات دوو مانگ لەسەریەك بەڕۆژوو بێت.

وە زانایان جیاوازییان هەیە لەسەر ئەوەی ئەگەر نەتوانێ بەڕۆژوو بێت، ئایا پێویستە لەسەری خواردنی شەست هەژار بدات وەك کەفارەتی (ظیهار)،

ئەویش لەسەر دوو قەولە: یەکەمیان: بەڵێ وەك دەق هەیە لە کەفارەتی (ظیهار) دا، بەڵام لێرەدا باس نەکراوە، چونکە ئەم شوێنی هەڕەشە و ترساندنە گونجاو نییە باسی خواردن دان بە هەژاران بکرێ، چونکە ئاسانکاری و ڕێپێدانی تێدایە.

قەولی دووەم: ناگۆڕرێت بە خواردن دان، چونکە ئەگەر خواردن دان پێویست بوایە ڕوونکردنەوەکەی دوانەدەخست لە کاتی پێویست ﴿تَوۡبَةً مِّنَ ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ لە پێشەوە چەند جار ڕاڤە کراوە.

پاشان کاتی خوای گەورە حوکمی کوشتنی هەڵەی ڕوونکردەوە دەست دەکات بە ڕوونکردنەوەی حوکمی کوشتنی قەستیی و دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقۡتُلۡ مُؤۡمِنٗا مُّتَعَمِّدٗا﴾ ئەوە هەڕەشەیەکی زۆر توندە و ئەکیدە دەربارەی ئەوانەی ئەو تاوانە گەورەیە ئەنجام دەدەن کە هاوشانی هاوبەش دانانە بۆ خوا، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ لَا يَدۡعُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ وَلَا يَقۡتُلُونَ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾ [الفرقان: ٦٨]، وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿قُلۡ تَعَالَوۡاْ أَتۡلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمۡ عَلَيۡكُمۡۖ أَلَّا تُشۡرِكُواْ بِهِۦ شَيۡـٔٗاۖ﴾ [الأنعام: ١٥١]. ئایەت و حەدیس دەربارەی حەرامکردنی کوشتن زۆر زۆرە.

لەوانە ئەوەیە کە لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە لە ئیبنو مەسعودەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "أول ما يقضي بين الناس يوم القيامة في الدماء" واتە: یەکەم لێپرسینەوە لە نێوان خەڵکدا ڕۆژی قیامەت لە سەر خوێنەکان دەبێت.

لە فەرموودەیەکی تردا کە لە عوبادەی کوڕی صامیتەوە گێڕاوەتەوە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لزوال الدنيا اهون عند الله من قتل رجل مسلم" واتە: لەناوچوونی دونیا لای خوا سووکترە لە کوشتنی موسڵمانێك.

وە لە فەرموودەیەکی تردا هاتووە: "من أعان على قتل مسلم ولو بشطر كلمة، جاء يوم القيامة مكتوب بين عينيه: آيس من رحمة الله" واتە هەر کەس یارمەتی بدات لەسەر کوشتنی موسڵمانێك بە نیوە وشەیەکیش بێت

کاتی ڕۆژی قیامەت لەناوچەوانی نووسراوە هیوابڕاو لە ڕەحمەتی خوا.

ئیبنو عەباس ڕای وابووە کە تۆبە بۆ کەسێك نییە باوەڕدارێك بکوژێت.

بوخاری دەڵێت: لە ئیبنو جوبەیرەوە دەگێڕێنەوە وتوویەتی: ئەهلی کوفە لەسەر ئەوە جیاوازی کەوتە نێوانیانەوە، چووم بۆ لای ئیبنو عەباس پرسیارم لێ کرد، وتی: ئەم ئایەتە دەربارەی هاتۆتە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾ هەر کەس باوەڕدارێك بە قەستی بکوژێ پاداشتەکەی دۆزەخە، وتوویەتی: ئەمە دوا ئایەتیشە هاتۆتە خوارەوە هیچیش نەسخی نەکردووەتەوە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: دەربارەی: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا فَجَزَآؤُهُۥ جَهَنَّمُ﴾ لە ئیبنو عەباسم پرسی، وتی: پیاوێك ئیسلام و شەریعەتەکەی ناسی، پاشان باوەڕدارێکی بە قەستی کوشت پاداشتەکەی دۆزەخە و تۆبەکردنی بۆ نییە، ئەڵێ: ئەوەم بۆ موجاهید باس کرد، وتی: کەسێك نەبێ کە پەشیمان بێتەوە.

ئیبنو حەمید دەگێڕێتەوە لە سالمی کوڕی جوعدەوە وتوویەتی: لای ئیبنو عەباس بووین دوای ئەوەی چاوەکانی نابینا بوون، پیاوێك هات بۆ لای بانگی کرد ئەی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس ڕات چییە بەرامبەر پیاوێك بە قەستی باوەڕدارێکی کوشتبێ؟ وتی: پاداشتەکەی دۆزەخە بۆ هەمیشە تێیدا دەمێنێتەوە و خوا لێی توڕەیە و نەفرینی لێ دەکات و سزایەکی گەورەشی بۆ ئامادەکردووە، وتی: ئەی ئەگەر تۆبەی کرد و کردەوەی چاکی کرد و پاشان هیدایەت درا؟ ئیبنو عەباس وتی: دایکی لەناوچووبایە لە کوێوە تۆبەو هیدایەتی بۆ دەبێ؟ بەوەی گیانی منی بەدەستە گوێم لە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بووە دەیفەرموو: "ثكلته أمه، قاتل مؤمن متعمدا، جا و يوم القيامة آخذه بيمينه أو بشماله، تشخب أوداجه دمًا فی قُبُل عرش الرحمن، يلزم قاتله بشماله بيده الأخرى، يقول: سل هذا فيم قتلني" واتە: دایکی شیوەنی بۆ بکردایە بە قەستی باوەڕدارێکی کوشتووە بەدەستی ڕاستی یان چەپی دەیگرێ کە ڕوخساری خوێنی لێ دەتکێ لە بەردەم عەرشدا بکوژەکە دەگرێ بە دەستی چەپی و بەدەستەکەی تری سەری دەگرێ و دەڵێ: ئەی

پەروەردەگار لەمە بپرسە بۆچی منی کوشت، "وأيم الذى نفس عبد الله بيده! لقد أنزلت هذه الآية، فما نسختها من آية حتى قبض نبيكم (درودی خوای لێ بێت)، وما نزل بعدها من برهان". وە وتوویەتی: بەو خوایەی گیانی عەبدوڵڵای بەدەستە ئەو ئایەتە کە هاتۆتە خوارەوە هیچی ئایەتێکی تر نەیسڕیوەتەوە هەتا خوا گیانی پێغەمبەرەکەتانی کێشا، دوای ئەوەش بورهان نەهاتۆتە خوارەوە.

وە ئەو پێشینانەی بۆ ئەوە چوون کە تۆبە بۆ بکوژی باوەڕدار نییە زەیدی کوڕی سابیت و ئەبوهورەیرە و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و ئەبو سەلەمەی کوڕی عەبدوڕەحمان و عوبەیدی کوڕی عومەیر و حەسەن و قەتادە و زەحاکی کوڕی موزاحیم، وەك ئیبنو ئەبی حاتەم نەقڵی کردووە.

لەو بارەوە فەرموودە زۆر هاتووە لەوانە: ئەبو بەکری کوڕی مەردەویە دەگێڕێتەوە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "يجى و المقتول متعلقا بقاتله يوم القيامة، آخذًا رأسه بيده الأخرى فيقول: يا رب، سل هذا فيم قتلني؟" قال: "فيقول: قتلته لتكون العزة لك. فيقول: فإنها لي". قال: "ويجى و آخر متعلقا بقاتله فيقول: رب، سل هذا فيم قتلني؟" قال: "فيقول قتلته لتكون العزة لفلان". قال: "فإنها ليست له بؤ بإثمه". قال: "فيهوى فى النار سبعين خريفا". واتە: ڕۆژی قیامەت کوژراو دێت خۆی هەڵواسیوە بە بکوژەکەیەوە سەریشی بە دەستەکەی تری گرتووە، ئەڵێ: پەروەردگار لەمە بپرسە بۆچی منی کوشت؟ کابرا دەڵێ بۆیە کوشتومە بۆ ئەوەی عیزەت بۆ تۆ بێ ئەفەرموێ: هەر بۆ منە، فەرموویەتی: یەکێکی تر دێنن، خۆی هەڵواسیوە بە بکوژەکەیدا و ئەڵێ: پەروەردگار لەمە بپرسە بۆچی منی کوشت؟ ئەویش دەڵێ: بۆ ئەوەی عیزەت بۆ فلان بێت، دەفەرموێ: ئەوە بۆی نییە پەشیمان بێتەوە لە تاوانەکانی، ئەفەرموێ: هەڵیدەدەنە ناو ئاگرەوە، کە حەفتا پایز قووڵە.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: ئەبی ئیدریس وتوویەتی: گوێبیستی موعاویە بووم (ڕەزای خوای لێ بێت) دەیوت: گوێبیستی پێغەمبەر

(دروودی خوای لێ بێت) بووم دەیفەرموو: "كل ذنب عسى الله أن يغفره إلا الرجل يموت كافرا، أو الرجل يقتل مؤمنا متعمدا". واتە: هەموو تاوانێك ڕەنگە خوا لە خاوەنی خۆش بێت جگە لە تاوانی پیاوێك کە بەبێ باوەڕی بمرێ یان باوەڕدارێك بە قەستی بکوژێ.

پاشان ئیبنو مەردەویە وتوویەتی: نافیع لە ئیبنو عومەرەوە گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من قتل مؤمنا متعمدا فقد كفر بالله عز وجل". (هذا حديث منكر) واتە هەر کەس باوەڕدارێك بکوژێ بە قەستی ئەوە بێ باوەڕی بە خوای بەرزی شکۆمەند کردووە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عوقبەی کوڕی مالیکی لەیسیەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) سریەیەکی ڕەوانەکرد هێرشیان بردە سەر کۆمەڵێك پیاوێك لەگەڵ کۆمەڵەکەدا بوو پیاوێك لە سریەکە شمشێری هەڵکێشاوە و شوێنی کەوت کابرا هاواری کرد: من موسڵمانم، گوێی نەدا بەوەی وتی، شمشێرێکی لێدا و کوشتی، باسەکە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، پێغەمبەریش (دروودی خوای لێ بێت) قسەیەکی توندوتیژی دەربارە کرد، ئەوە گەیشتەوە بە بکوژەکە، کاتێ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتاری دەدا لەوکاتەدا بکوژەکە وتی: سوێند بە خوا ئەوەی ئەو کابرایە وتی بۆ ئەوەبوو خۆی لە کوشتن بپارێزێ، ئەڵێ: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ڕووی لێ وەرگێڕا و لەو کەسانەش کە لە پێشیەوە بوون و دەستی کردەوە بە وتارەکەی، پاشان کابرا دووبارە وتییەوە ئەی نێردراوی خوا ئەوەی ئەو کابرایە وتی بۆ ئەوەبوو خۆی بپاریجزێ لەو کوشتن، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ڕووی لێ وەرگێڕاو لەوانەی لە پێشیەوە بوون و لەسەر وتارەکەی بەردەوام بوو. کابرا خۆی پێنەگیراو بۆ جاری سێیەم وتوویەوە سوێند بە خوا ئەی نێردراوی خوا ئەوەی بۆیە وت هەتا خۆی لە کوشتن پێ بپارێزێ، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بەڕوویەکی گرژەوە ڕووی تێ کرد و سێ جار فەرمووی: "إن الله أبى على من قتل مؤمناً" (رواه النسائي من حديث سليمان بن المغيرة). واتە: خودا ناڕازییە لەو کەسەی باوەڕدارێك بکوژێت.

ئەوەی جەماوەری پێشینانی ئەم نەتەوەیە لەسەر ئەوەیە کە بکوژ

تۆبەکردنی بۆ هەیە لە نێوان خۆی و خوادا ئەگەر تۆبەی کرد و گەڕایەوە بۆ لای خوا و ملکەچ بوو کردەوەی چاکی کرد خوای گەورە خراپەکانی دەگۆڕێ بە چاکە بۆی و بریتی کوژراو دەداتەوە لەسەر ستەملێکرانی و ڕازی دەکات، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَٰهًا آخَرَ﴾ إلى قوله ﴿إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا﴾ [الفرقان: ٦٨ ـ ٧٠]. ئەو هەواڵە دروست نییە نەسخ کردنەوەی و لەسەر هاوبەشدانەرەکان دابنرێ و دانانی ئەم ئایەتە لەسەر باوەڕدار پێچەوانەی ڕواڵەتەو دانانی پێویستی بە بەڵگە هەیە ـ ئیتر خوا دەزانێ ـ.

وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَاءُ﴾، ئەمەش گشتییە دەربارەی هەموو تاوانەکان جگە لە هاوبەش دانان.

هەروەها خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ يَا عِبَادِيَ الَّذِينَ أَسْرَفُوا عَلَىٰ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا مِن رَّحْمَةِ اللَّهِ﴾ [الزمر: ٥٣]، ئەم ئایەتەش گشتییە دەربارەی تاوانەکان لە کوفر و شیرك و شك و نیفاق و کوشتن و فسوقی و غەیری ئەوانیش.

لە هەردوو سازەواردا هەواڵێکی ئیسرائیلی چەسپاوە دەربارەی ئەو کەسەی سەد کەسی کوشتبوو پاشان پرسیاری کرد لە زانایەك ئایا تۆبەم بۆ هەیە؟ وتی: چی ئەبێتە بەربەست لە نێوان تۆ و تۆبەکردندا؟ پاشان ناردی بۆ شارێك کە خوای تێدا ببەسترێ، ئەویش بەرەو ئەو شوێنە ڕۆیشت لە ڕێگادا مرد، فریشتەی ڕەحمەت گیانی کێشا وەك چەند جار باسمان کردووە، ئەگەر ئەوە لەناو بەنی ئیسرائیلیدا بێت ئەم نەتەوە لە پێشترە تۆبەی لێوەربگیرێ، چونکە خوای گەورە باری قورس و گرانی لەسەر ئێمە لابردووە کە لەسەر نەتەوەکانی تر بووە.

بەڵام ئایەتە پیرۆزەکە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَقْتُلْ مُؤْمِنًا مُّتَعَمِّدًا﴾ ئەبوهورەیرەو کۆمەڵێك لە پێشینان و دەربارەی وتوویانە: ئەوە سزاکەیەتی ئەگەر خوا سزای بدات.

فەرمودە بە موتەواتیری هاتووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)

فەرموویەتی: "أنه یخرج من النار من کان فی قلبه أدنی ذرة من إیمان". بەراستی لە ئاگر دەردەهێنرێ هەر کەس لە مسقاڵە زەڕەیەك بەرەو خوار باوەڕ لە دڵیدا بێت. بەڵام حەدیسەکەی موعاویە کە پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "کل ذنب عسی الله أن یغفره إلا الرجل یموت کافرا، أو الرجل یقتل مؤمنا متعمدا". (عسی) بۆ ئومێد و ڕەجایە ئەگەر تەرەجی نەما لە هەردوو وێناکەدا ئەوە نەرێ ناکات کە ئەوە ڕوویدات لە یەکێکیاندا کە ئەویش کوشتنە بەپێی ئەوانەی باسمان کرد، بەڵام ئەوەی بە کافری بمرێ دەق هاتووە کە خوا هەرگیز لێی نابوورێ، بەڵام داواکەی کوژراو و لە بکوژ لە ڕۆژی قیامەت ئەوە حەقێکە لە حەقەکانی ئادەمیزادەکان، ئەو حەقانە بە تۆبە لا ناچن، بەڵکو ئەبێ ئەو حەقەیان بدرێتەوە جیاوازی نییە لە نێوان کوژراو و شت لێ دزراوو و شت لێ داگیرکراو و تاوان تێگیراوو و هەموو مافەکانی ئادەمیزدا بۆ ڕاستی تۆبەکە، ئەگەر ئەوە نەکرا ئەبێ ڕۆژی قیامەت داواکە بکرێ، بەڵام ئەوە پێویست ناکات کە داواکردنەکە ڕوو بدات و سزاکەشی بدرێ، چونکە جاری وا ئەبێت بکوژ کردەوەی چاکی هەبێت و بدرێت بە کوژراو، یان هەندێکی بدرێتێ، پاشان پاداشتی زیادەی دەمێنێتەوە پێی دەچێتە بەهەشت، یان خوای گەورە قەرەبووی کوژراو دەکاتەوە بە فەزڵی خۆی لە کۆشکەکانی بەهەشت و خۆشییەکانی و پلەی بەرز دەکاتەوە لە بەهەشتدا.

پاشان بۆ بکوژی قەستیی چەند حوکم هەیە لە دونیادا و چەند حوکم هەیە لە ڕۆژی دواییدا، لەدونیادا، دەسەڵاتی سەرپەرشتیکاری کوژراوەکەی بەسەردا زاڵ دەکات، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا﴾ [الإسراء: ٣٣] پاشان ئەوان ئارەزووی خۆیانە کە بیکوژنەوە یان لێی ببورن، یان خوێنبایی قورسی بسەنن، وەك لە کتێبەکانی (الاحکام)دا بڕیاری لەسەر دراوە. زانایان جیاوازییان هەیە لەسەر ئەوەی کە ئەبێ بەندەش ئازاد بکات یان نا، یان دوو مانگ لەسەریەك بە ڕۆژوو بێت، یان خواردنی شەست هەژار بدات، لەسەر یەکێ لە دوو قەول، وەك لە کەفارەتی هەڵەدا باس کرا، یان لەسەر دوو قەول، شافیعی و هاوەڵەکانی و کۆمەڵێك لە

زانایان ئەڵێن: بەڵێ لەسەری پێویستە، چونکە ئەگەر کەفارەتی هەڵەی لەسەر پێویست بێت بۆ قەست لە پێش ترە لەسەر پێویست بێت، بەڵام ئیمام ئەحمەدو چەند زانایەکی تر دەڵێن: کوشتنی قەستی گەورەترە لەوەی بریتی بدرێت، لەبەرئەوە بریتی تێدا نییە.

ئەوانەی بۆ پێویست بوونی کەفارەت چوون، لەسەر کوشتنی قەستی، بەڵگەیان ئەوەیە کە ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوەو دەڵێت: لە وائیلی کوڕی ئەسقەعەوە دەگێڕ،ەوە وتوویەتی: چەند کەسێك لە بەنو سەلیم هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتیان: هاوەڵێکمان پیاوێکی کوشتووە، فەرمووی: (با بەندەیەك ئازاد بکات، هەر ئەندامێکی ئەکەوێتە بریتی ئەندامێکی کوژراوەکە و لە ئاگر پێی رزگار دەبێت'.

وە ئەحمەد وتوویەتی: لە غەریفی دەیلەمییەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: چووین بۆ لای واسیلەی کوڕی ئەسقەع پێمان وت: فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەرەوە کە خۆت لە پێغەمبەرت بیستبێ، ئەویش وتی: دەربارەی هاوەڵێکمان چووین بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کە پیاوێکی کوشتبوو، فەرمووی: 'بەندەیەکی بۆ ئازاد بکەن هەتا خوا بە هەر ئەندامێکی ئەندامێکی لە ئاگر رزگار بکات'.

هەروەها لە ئەبی داودەوە بە زاراوەیەکی تر هاتووە کە وتوویەتی: چووین بۆ لای واسیلەی کوڕی ئەسقەع پێمان وت: فەرموودەیەکمان بۆ بگێڕەرەوە زیادو کەمی نەبێ، ئەویش تووڕەبوو وتی: هەر کەس لە ئێوە قورئان دەخوێنێ و موسحەفەکەی لەماڵەوە هەڵواسیوە زیادو کەمی دەکات، وتمان ئێمە مەبەستمان فەرموودەیەك بوو لە پێغەمبەرت بیستبێ، وتی: چووین بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەربارەی هاوەڵێکمان ئاگری لەسەر پێویست بوو بە هۆی پیاوکوشتنەوە، فەرمووی: 'اعتقوا عنه یعتق الله بکل عضو منه عضواً منه من النار' بەندەیەکی لە جیاتی ئازاد بکەن بۆ ئەوەی بەهەر ئەندامێکی ئەندامێکی لە ئاگر رزگار بکات.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ

ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ
فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا
﴿٩٤﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەنە باوەڕان! ئێوە کاتێ بۆ غەزا بەڕێدا دەڕۆن هەموو شتێك لێکدەنەوە، نەکەن لەبەر ژیانی دونیا، بەوەی کە فەرمانبەری خۆی دەربڕیوە، بڵێن تۆ خاوەن باوەڕ نیت، ئێوە ئەگەر ماڵی دنیاتان دەوێت، دەستکەوتی زۆر لای خودایە، ئێوەش بەرێ هەروابوون و باوەڕتان بە خوا نەبوو، خودا ئێوەی بە بەزەیی خۆی خویێ،دەوە، سا بە وردی لە کاری خۆ خوردبنەوە، خودا لەهەر کارێ دەیکەن ئاگادارە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: عەکریمە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پیاوێك لە بەنی سەلیم بە لای چەند کەسێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر دا تێپەڕی کە مەڕی دەلەوەڕاند، سڵاویان لێدەکات، وتیان: ئەوە بۆیە سڵاومان لێدەکات کە خۆی بپارێزێ لێمان، بۆی هەڵدەسن و دەیکوژن و مەڕەکانی دەهێنن بۆ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، خوا ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرمووێت:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ
أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ
ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ
فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا
﴿٩٤﴾

بوخاری لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا﴾ وتوویەتی: پیاوێك لای مەڕەکانی دەبێ، کۆمەڵێك لە موسڵمانەکان پێی دەگەن، ئەویش دەڵێ: (السلام علیکم)، بەڵام ئەوان دەیکوژن و مەڕەکانی دەبەن، خوای گەورە دەربارەی ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە ﴿وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا﴾.

ئیبنو عەباس وتوویەتی: شتی دونیایی ئەو چەند سەر مەڕە بوو کە بریان.

سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: موسڵمانەکان پیاوێك دەبینن بە لای ڕانەمەڕێکی خۆیەوە بوو کە دەیلەوەڕاند پێیان دەڵێ: (السلام علیکم) ئەوانە هەر دەیکوژن، خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا﴾.

ئیبنو جەریر و ئیبنو ئەبی حاتەم لە ڕێگای سوفیانی کوڕی عویەینەوە دەگێڕنەوە کە برایەکی کۆڕچ دەکات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کە بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ڕابگەیەنێ کە باوکی هۆزەکەی موسڵمان بوون، سریەیەکی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی دەگەن شەو زۆر تاریك دەبێ، پێیان دەڵێ من موسڵمانم، لێی قبوڵ ناکەن و دەیکوژن، باوکی وتوویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەزار دیناری پێدام و خوێنباییەکی تریش و ڕەوانەی کردم، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟﴾.

بەڵام بەسەرهاتەکەی مولحەمی کوڕی جەسامە، ئیمام ئەحمەد بەڕەحمەتی خوا بکەوێت وتوویەتی: لە قەعقاعی کوڕی عەبدوڵلای کوڕی ئەبی حدودەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ناردینی بۆ (ئیضم) لەگەڵ چەند موسڵمانێکدا، ئەبو قەتادە و حاریسی کوڕی ڕەبعییان تێدا بوو، لەگەڵ مولحەمی کوڕی جوسامەی کوڕی قەیس ڕۆیشتین هەتا گەیشتینە ناو (ئیضم)ەوە، عامیری کوڕی ئەزبەتی ئەشجەعی بە سواری حوشترێکەوە لە لاماندا تێپەڕی و سڵاوی لێ کردین، ئێمەش وازمان لێ هێنا، بەڵام مولحیمی کوڕی جوسامە هەڵی کوتایە سەری و کوشتی لەبەر شتێك کە لە نێوانیاندا ڕووی دابوو، وشتر و کەلوپەلەکانی برد، کاتێ هاتینەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەواڵەکەمان پێ ڕاگەیاند، ئەم ئایەتەش دەربارەمان هاتە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُوا۟﴾ تادەگاتە فەرمایشتی: ﴿خَبِيرًا﴾. ئەحمەد بە تەنهایی هێناویەتی.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) مولحیمی کوڕی جوسامەی لەگەڵ سریەیەکدا رەوانە کرد، لە رێگادا دەگەن بە عامیری کوڕی ئەضبهت بەسڵاوی ئیسلام سڵاویان لێدەکات، لە نێوانیاندا کۆنە ڕقێکی سەردەمی نەفامی هەبوو، مولحیم تیرێکی بۆ هاویشت و کوشتی، هەواڵەکە گەیشت بە پێغەمبەر، عویەینە و ئەقرەع هەڵیاندیە لەسەری، ئەقرەع وتی: ئەمڕۆ با نهێنی بێ و سبەینێ ببەخشە، عویەینە وتی: نە، سوێند بە خوا هەتا ژنەکانیان تامی مردنی نەچەژن وەك ژنەکانی ئێمە چەژتویانە نابێ وازی لێ بهێنی، مولحیم هات دوو بوردی لەبەردا بوو، دانیشت لەبەردەم پێغەمبەر دا (دروودی خوای لێ بێت)، بۆ ئەوەی داوای لێبوردنی بۆ بکات، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "خوا لێت خۆ نەبێ"، مولحیم هەڵسا بە کراسەکەی فرمێسکەکانی دەسڕی، هەفتەی بەسەردا نەهاتەوە مرد و ناشتیان، بەڵام زەوی فڕێیدا دەرەوە، هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەیان بۆ گێڕایەوە، فەرمووی: زەوی لەناوخۆیدا لە هاوەڵەکەی ئێوەی خراپتر جێ کردۆتەوە، بەڵام ئەوە خوا دەیەوێ ئامۆژگاریتان بکات هەتا عیبرەت وەربگرن، پاشان لە نێوان دوو بەرد دا لاشەکەیان فڕێ داو بە بەرد دایانپۆشی، خوا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنۡ أَلۡقَىٰٓ إِلَيۡكُمُ ٱلسَّلَٰمَ لَسۡتَ مُؤۡمِنٗا تَبۡتَغُونَ عَرَضَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٞۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبۡلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيۡكُمۡ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾.

بوخاری وتوویەتی: سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) سریەیەکی رەوانەکرد، میقدادی کوڕی ئەسوەدی تێدا بوو، کاتێ گەیشتنە هۆزەکە سەیریان کرد بڵاوەیان پێ کردبوو، تەنها پیاوێك لەوێ مابوو کە ماڵێکی زۆری هەبوو، کە چاوی بە موسڵمانەکان کەوت میقداد هەڵی کوتایە سەری و کوشتی، پیاوێك لە هاوەڵەکانی پێی وت: ئایا پیاوێکت کوشت کە وتی: (لا اله الا الله)؟ سوێند بە خوا بۆ پێغەمبەری دەگێڕمەوە، کاتێ گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتیان: پیاوێك وتی: (لا اله الا الله) کەچی میقداد

کوشتی، فەرمووی: میقدادم بۆ بانگ بکەن، کە میقداد هات، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی فەرموو: ئایا کەسێکت کوشتووە وتوویەتی: (لا اله الا الله)؟ ئەی سبەینێ چی دەکەیت بە (لا اله الا الله) وتوویە، خوا ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا ضَرَبْتُمْ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ فَتَبَيَّنُواْ وَلَا تَقُولُواْ لِمَنْ أَلْقَىٰٓ إِلَيْكُمُ ٱلسَّلَـٰمَ لَسْتَ مُؤْمِنًا تَبْتَغُونَ عَرَضَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ ۚ كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾.ی ناردە خوارەوە. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە میقدادی فەرموو: "پیاوەکە موسڵمان بووە باوەڕەکەی شاردبۆوە لە بێ باوەڕەکان کاتێ باوەڕەکەی ئاشکرا کرد تۆ کوشتت، وەك چۆن لە مەککە باوەڕەکەت دەشاردەوە".

﴿فَعِندَ ٱللَّهِ مَغَانِمُ كَثِيرَةٌ﴾ واتە: چاکترە لەوەی حەزتان پێ دەکرد لە ژیانی دونیادا کە پاڵی پێوەنان پیاوێکی وەك ئەوە بکوژیت کە سڵاوی لێ کردی و باوەڕەکەی خۆی ئاشکرا کرد بۆت، بەڵام غافڵ بووی لێی و تۆمەتبارتان کرد بەوەی درۆ دەکات بۆ خۆپاراستن بوو بۆ ئەوەی شتی دونیاییتان دەست بکەوێت، ئەوەی رۆزی حەڵاڵ لای خوایە چاکترە بۆتان لەو ماڵە.

﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ واتە ئێوەش لەوە و پێش ئەوە حاڵتان بوو وەك چۆن ئەو باوەڕەکەی شاردبووەوە لە هۆزەکەی، وەك لە فەرموودەکەی پێشەوە باسکرا و وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَٱذْكُرُوٓاْ إِذْ أَنتُمْ قَلِيلٌ مُّسْتَضْعَفُونَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ [الأنفال: ٢٦].

ئیبنو جورەیج وتوویەتی: لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە دەگێڕنەوە دەربارەی ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ﴾ وتوویەتی: ئێوەش لەوەوپێش دەشاردەوە وەك ئەو شوانە باوەڕەکەی شاردبوویەوە.

وە سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: ﴿كَذَٰلِكَ كُنتُم مِّن قَبْلُ﴾ باوەڕتان نەهێنابوو ﴿فَمَنَّ ٱللَّهُ عَلَيْكُمْ﴾ خوا لێتان بورا.

ئوسامە سوێندی خوارد کەسێك ناکوژێ بڵێت: (لا اله الا الله) دوای ئەو پیاوەو ئەوەی لە پێغەمبەرەوە پێگەیشت دەربارەی ﴿فَتَبَيَّنُوٓاْ﴾ تەئکیدە بۆ ئەوەی پێشوو ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ سەعیدی کوڕی جوبەیر وتوویەتی: ئەوە هەڕەشەیە.

﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ ۚ فَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ عَلَى الْقَاعِدِينَ دَرَجَةً ۚ وَكُلًّا وَعَدَ اللَّهُ الْحُسْنَىٰ ۚ وَفَضَّلَ اللَّهُ الْمُجَاهِدِينَ عَلَى الْقَاعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا (٩٥) دَرَجَاتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً ۚ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (٩٦)﴾

واتە: ئەو بڕوادارانەی کە هەر لە ماڵی خۆیان دەمێنن ـ جیا لەوانەی نوقستانن ـ لەگەڵ ئەوانەی دەچنە جەنگ لە ڕای خودا و ماڵ و گیانیان لە ڕێی ئەودا بەخت دەکەن وەکو یەك نین خودا غەزاکارانی بەرامبەر بە خانەنشینان ـ بە پلەیەك ـ سەرخستووە، خوا بەڵێنی بە هەموو لایەکیان داوە کە چاکەیان لەگەڵ دەکات، بەڵام ئەوەی لە مەیدانی غەزادا بن لە چاو خانەنشینەکان پاداشتێکی هەرە مەزنیان دەداتێ، پلەو پایەیەکی زۆر ـ لە لای خواوە ـ هاوڕێ لەگەڵ لێخۆشبوون و میهرەبانی، خوا بەخشندەو میهرەبانە.

بوخاری وتوویەتی: لە بەڕاوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: کاتێ ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ هاتە خوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) زەیدی بانگك کرد نووسی، ئیبنو ئومی مەکتوم هات سکاڵای لە نابینایی خۆی کرد، خوای گەورە ﴿غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾.ی نارده خوارەوە.

بوخاری وتوویەتی: سەهلی کوڕی سەعدی ساعیدی وتوویەتی: مەروانی کوڕی حەکەمم بینی لە مزگەوت، چووم بۆ لای و لە تەنیشتییەوە دانیشتم پێی ڕاگەیاندین کە زەیدی کوڕی سابیت پێی ڕاگەیاندووە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ﴿لَّا يَسْتَوِي الْقَاعِدُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ وَالْمُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ﴾ی بۆ خوێندمەوە نووسیم، ئیبنو ئومی مەکتوم هات ئەوکاتەی بۆی دەخوێندمەوە، وتی: سوێند بە خوا ئەگەر بمتوانیایە جیهادم بکردایە دەمکرد، لەبەر ئەوەی کوێر بوو خوای گەورە وەحی بۆ پێغەمبەر نارد ڕانی لەسەر ڕانم بوو ئەوەندە قورسایی چووە سەر ڕانم ترسام ڕانم بشکێ، پاشان هۆشی هاتەوە خوای گەورە ﴿غَيْرُ أُولِي الضَّرَرِ﴾ی ناردبوە خوارەوە. (تفرد بە البخاری دون مسلم).

ئیمام ئەحمەد لە ڕوویەکی ترەوە لە لە زەیدەوە دەگێڕێتەوە کەو توویەتی:

من لە تەنیشتی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) دانیشتبووم کاتێ وەحی بۆ هات ئاگای لە خۆی نەما، ڕانی خستە سەر ڕانم، کاتێ لە هۆش خۆی چوو، زەید وتوویەتی: سوێند بە خوا شتێکم نەبینیوە قورستر بێت لە ڕانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، پاشان هۆشی هاتەوە خۆی فەرموی: ئەی زەید بنووسە، منیش شتانێ:م هێنا فەرمووی بنووسە: ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ هەتا ﴿أَجْرًا عَظِيمًا﴾، منیش لەسەر شانەکە نووسیم، ئیبنو ئومی مەکتوم کە پیاوێکی نابینا بوو کاتێ چاکێتی جیهادکارانی بیست هەڵسا وتی: ئەی نێردراوی خوا ئەی ئەو کەسانەی توانای جیهادیان نییە و کەسانێك کوێرن چی بکەن؟ زەید وتوویەتی: قسەکەی تەواونەکردبوو پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بێ هۆشیی گرتییەوە ڕانی کەوتەوە سەر ڕانم وەك جاری یەکەم هەستم بە قورسایی ڕانی کرد، پاشان هۆشی هاتەوە فەرمووی: بیخوێنەرەوە منیش ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ فِى سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾م بۆ خوێندەوە، فەرمووی: ﴿غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ﴾، زەید وتی: ئەوەشم خستە سەری، سوێند بە خوا وەك ئێستا سەیر ئەو شکاوە بکەم لە شانەکەدا بوو وایە کاتێ ئەوە خستە سەر.

ئیبنو ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوە کە ئیبنو عەباس دەربارەی ﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ وَٱلْمُجَٰهِدُونَ﴾ وتوویەتی: ئەوانەی چوون بۆ بەدر و ئەوانەی نەچوون.

﴿لَّا يَسْتَوِى ٱلْقَٰعِدُونَ مِنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوە ڕەهایە کاتێ بەخێرایی ﴿غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ﴾ هاتە خوارەوە ئەوەبو دەرگایەك بۆ ئەوانەی بەهانەی ڕەوایان هەیە بۆ نەکردنی جیهاد لە نابیناو شەل و نەخۆش و دەربارەی ئەوەی یەکسانن لەگەڵ جیهادکاراندا لە ڕێگەی خوادا بە ماڵ و گیانیان. پاشان خوای بەرز هەواڵی داوە بە چاکێتی جیهادکاران بەسەر دانیشتووەکانەوە.

ئیبنو عەباس دەربارەی ﴿غَيْرُ أُو۟لِى ٱلضَّرَرِ﴾ وتوویەتی پێویستە بەو شێوەیە بن وەك چەسپاوە لە سازەواری بوخاریدا لە ڕێگەی زوهەیری کوڕی موعاویەوە لە حومەیدەوە لە ئەنەسەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن بالمدينة أقوام ما سرتم من مسيرة ولا قطعتم من واد إلا

وهم معكم منه، قالوا: وهم بالمدينة يا رسول الله؟ قال: نعم، حبسهم العذر" واته: لەناو مەدینە دا کۆمەڵێك هەیە بۆ هەر شوێنێك ڕۆیشتن یان شوێنێکتان بڕی بێت لەگەڵتان بوون، وتیان: لە مەدینەش بوون ئەی نێردراوی خوا؟ فەرمووی: بەڵێ، بەهانەیەك بەندی کردوون بۆیە نەهاتوون لەگەڵتان.

کە دەفەرموونت: ﴿وَكُلًّا وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلْحُسْنَىٰ﴾ هەموو لایەك لە خوا پەیمانی پێداون بیانخاتە بەهەشتەوەو پاداشتێکی زۆریان بداتەوە، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی جیهاد فەرزی عەین نییە، بەڵکو فەرزی کیفایەیە، خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَفَضَّلَ ٱللَّهُ ٱلْمُجَٰهِدِينَ عَلَى ٱلْقَٰعِدِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾، پاشان خوای پاك و بێگەرد هەواڵ دەدات کە ئەوانەی بە پلە و پایە بەرز کردووەتەوە لە ژوورەکانی بەهەشتدا و لە تاوانەکانیان خۆش بووە و بەزەیی و بەرەکاتی خوایان بەسەردا ڕژاوە، لەبەرئەوە دەفەرمووێت: ﴿دَرَجَٰتٍ مِّنْهُ وَمَغْفِرَةً وَرَحْمَةً وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿٩٦﴾﴾.

لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "إن في الجنة مائة درجة أعدها الله للمجاهدين في سبيله، ما بين كل درجتين كما بين السما و الارض" واتە: لەبەهەشتدا سەد هەیە خوا ئامادەی کردووە بۆ ئەوانەی لە ڕێگای ئەودا جیهاد دەکەن، نێوان هەردوو پلەیان وەك نێوان ئاسمان و زەوی وایە.

ئەعمەش لە عەمری کوڕی موڕەوە دەگێڕێتەوە لە ئەبی عوبێدەوە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من رمى بسهم فله أجره درجة" فقال رجل: يا رسول وما الدرجة؟ فقال: "أما انها ليست يعتبه امك، مابين الدرجتين مائة عام" واتە: هەر کەس تیرێکی هاویشتبێ لەڕێگای خوادا پاداشتەکەی پلەیەکە، پیاوێك وتی: ئەی نێردراوی خوا پلە چییە؟ فەرمووی: وەك ئەو پەیژەیە نییە دایکتن بەسەریدا سەردەکەوێ، بەڵکو نێوان هەردوو پلەی سەد ساڵ ڕێگایە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ قَالُوا۟ فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا۟ كُنَّا

مُسْتَضْعَفِينَ فِي ٱلْأَرْضِ قَالُوٓاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَٰٓئِكَ
مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَسَآءَتْ مَصِيرًا (٩٧) إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ
وَٱلْوِلْدَٰنِ لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا (٩٨) فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن
يَعْفُوَ عَنْهُمْ وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا (٩٩) وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي
ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ
يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا (١٠٠)﴾

واتە: ئەو کەسانەی هەر لە جێی خۆیان مانەوە و ئەو غەدرەیان لە خۆیان کرد کاتێ فریشتەی گیانکێشان پێیان دەڵێ: ئێوە لە چ بارێکدا بوون؟ دەڵێن: ئێمە لە زەمیندا هێز و وزە لێگیراو بووین، پێیان دەڵێن: مەگەر سەرزەوینی خودا فراوان نەبوو تا لە زێدی خۆ کۆچ بکەن و بڕۆنە جێگایەکی تر؟ ئەمانە دۆزەخ دەبێتە جێگایان و دواڕۆژی خراپیان هەیە، جا مەگین ئەمێر دوو ژن و زارۆکانە هێز لێگیراوانەی هیچ دەرەتانیان نەبووبێ و شارەزای ڕێگەش نەبووبن هیچ دوور نییە خوا ئەمانە ببەخشێ، خودا چاوپۆشی لەلایە و بەخشندەیە، هەرکەسێك لە ڕێگای خودا لە ماڵی خۆی هەڵوەدا بێ لەم زەمینە گەلێ شوێنی حەوانەوە و فەرحانێ بۆ پەیدا دەبێ، هەرکەسێکیش لە زێدی خۆی دەربکەوێ لە ڕێگای خودا و پێغەمبەری خودادا دەربەدەر بووبێ و لە ئاوارەییدا بمرێ خودا بۆ خۆی دەستەبەری پاداشتیەتی و خوا لە گوناهانی دەبورێ و دلۆڤانە.

بوخاری وتوویەتی: عەبدوڵڵای کوڕی یەزیدی موقریێ بۆی گێڕاینەوە کە حەیوە و کەسێکی تر وتوویانە: موحەممەدی کوڕی عەبدوڕەحمان ئەبو ئەسوەد وتوویەتی: ئەهلی مەدینە کۆمەڵێکیان نارد و منیشی تێدا نووسرابووم، گەیشتم بە عەکریمە مەولای ئیبنو عەباس پێم ڕاگەیاند، بە توندی لێی قەدەغە کردم و وتی: ئیبنو عەباس پێی ڕاگەیاندووم کە خەڵکێك لە موسڵمانان لەگەڵ هاوبەشدانەرەکانن ژمارەیان زۆر دەکەن لە سەردەمی پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) تیرێکی وێڵ دێ بەر کەسێکیان دەکەوێ و

دەیکوژێ، یان لە ملی دەدرێ دەکوژرێ، خوای گەورە ئەم ئایەتە دەنێرێتە خوارەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ (رواه الليث عن أبي الأسود).

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: عەکریمە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: کۆمەڵێك لە ئەهلی مەککە موسڵمان دەبن، بەڵام موسڵمان بوونەکەیان دەشارنەوە، ڕۆژی بەدر هاوبەشدانەرەکان ئەوانیش لەگەڵ خۆیان دەبەن، هەندێکیان ئەکوژرێن، موسڵمانەکان دەڵێن: ئەو هاوەڵانەمان موسڵمان بوون بەزۆرهێنابوونیان، داوای لێبوردنیان بۆ بکەن ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ هاتە خوارەوە، عەکریمە وتوویەتی: ئەو ئایەتەی نووسی بۆ ئەو موسڵمانانەی کە لە مەککەدا مابوون پێی ڕاگەیاندن ئیتر لەمەولا بەهانەیان نییە، عەکریمە وتوویەتی: ئەو ئایەتە دەربارەی کۆمەڵێك لە لاوی قورەیش هاتە خوارەوە کە موسڵمان بوون و لە مەککە مابوونەوە، لەوانە عەلی کوڕی ئومەیەی کوڕی خەلەف و ئەبو قەیسی کوڕی وەلیدی کوڕی موغیرە و ئەبوعاصی کوڕی مونەبیهی کوڕی حەجاج و حارسی کوڕی زەمعە.

ززەحاك وتوویەتی: دەربارەی کۆمەڵێ لە مونافیقەکان هاتۆتە خوارەوە کە لە مەککە خۆیان دواخست لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، بەڵام لەگەڵ هاوبەشدانەرەکان ڕۆژی بەدر هاوبەشییان کرد و هەندێکیان لێ کوژرا.

بەڵام ئەم ئایەتە پیرۆزە گشتییە و هەموو ئەوانە دەگرێتەوە کە لەناو هاوبەشدانەرەکاندا مابوونەوە لەگەڵ ئەوەی توانیوێتی کۆچ بکات، لەبەرئەوەی توانای بانگەوازکردنی نییە بۆ ئایینەکەی ستەمی لە خۆی کردووە و کارێکی حەرامی کردووە بەرای هەموو زانایان، وە بە دەقی ئەم ئایەتە کە خوا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ ظَالِمِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ واتە بە کۆچنەکردنەکەیان ﴿قَالُواْ فِيمَ كُنتُمۡ﴾ واتە بۆچی مانەوە لێرەداو کۆچتان نەکردووە ﴿قَالُواْ كُنَّا مُسۡتَضۡعَفِينَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ واتە ناتوانین لەم شارە دەربچین و بە زەویدا بچین ﴿قَالُوٓاْ أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةٗ﴾ الآية.

ئەبو داوود وتوویەتی: لە سەمورەی کوڕی جوندوبەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من جامع المشرك وسكن معه

فانه مثله" هەر کەس لەگەڵ هاوبەشدانەردا کۆبێتەوەو لەگەڵیانا جێگیر بێت ئەو کەسە وەك ئەوان وایە.

سوودی وتوویەتی: کاتێ عەباس و عەقیل و نەوفل بە دیل گیران، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە عەباسی وت: "بریتی خۆت و برازاکەت بدە"، وتی: ئەی نێردراوی خوا ئێمە بەرەو ڕوانگەکەی تۆ نوێژێکمان نەکردووە و شایەتومانەکەی تۆمان نەهێناوە، فەرمووی: با عەباس ئێوە دژایەتییتان کردووە دژایەتی دەکرێن، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە ﴿أَلَمۡ تَكُنۡ أَرۡضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً﴾ (رواه ابن أبی حاتم).

کە دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ﴾ هەتا کۆتایی ئایەتەکە ئەوە بەهانەی خوایە بۆ ئەو کەسانە دەربارەی کۆچ نەکردن، لەبەرئەوەی ناتوانن لەدەس هاوبەشدانەرەکان خۆیان رزگار بکەن، ئەگەر تواناشیان هەبوایە ڕێگایان نەدەزانی، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةً﴾ موجاهید و عەکریمە و سوودی وتوویانە: واتە ڕێگا.

کە دەفەرمووێت: ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعۡفُوَ عَنۡهُمۡۚ﴾ واتە خوا لێیان ببورێ، لەبەرئەوە کۆچیان نەکردووە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا﴾.

بوخاری وتوویەتی: لە ئەبی هوڕەیرەوە هاتووە وتوویەتی: لە کاتێکدا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نوێژی خەوتنانی دەکرد لەو کاتەدا کە دەفەرمووێ: "سمع الله لمن حمده" پێش ئەوەی بچێتە کڕنووشەوە ئەیوت: خوایە بە عەیاشی کوڕی ڕەبیعە و سەلەمەی کوڕی هیشام و وەلیدی کوڕی وەلید بێ دەسەڵاتەکان لە باوەڕدارەکان ڕزگار بکە، خوایە توندوتیژیت لەسەر موزەر زیاد بکە وەك گرانییەکەی یوسفیان بەسەردا بهێنە.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئەبی هوڕەیرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دوای ئەوەی سڵاوی نوێژەکەی دایەوە دەستەکانی بەرز کردەوە لە کاتێکدا بەرەو قیبلە بوو فەرمووی: خوایە وەلیدی کوڕی وەلید و عەیاشی کوڕی ڕەبیعە و سەلەمەی کوڕی هیشام و بێ دەسەڵاتە موسڵمانەکان ڕزگار بکە، ئەوانەی توانای فێڵ و تەڵەکە و ڕێگا نازانن هەتا خۆیان ڕزگار بکەن لەدەست بێ باوەڕەکان.

عەبدوڕەزاق وتوویەتی: گوێبیستی ئیبنو عەباس بووم ئەیوت: من و دایکم لە بێ دەسەڵاتە ژن و پیاوەکان بووین.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾، ئەوە پاڵنانە بۆ کۆچ کردن و ڕەغبەتە بۆ جیابوونەوە لە هاوبەش دانەرەکان، بەڕاستی باوەڕدار بۆ هەر شوێنێ بڕوات شوێنی باش بەدەست دەهێنێت کە خۆری تێدا قایم بکات.

ئیبنو عەباس وتوویەتی (مراغم) گوێزانەوەیە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر، کە دەفەرمووێت (واسعە) واتە بژێوی.

قەتادە وتوویەتی: ﴿يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾ واتە: لە گومڕاییەوە بۆ هیدایەت و لە کەمدەسییەوە بۆ دەوڵەمەندی.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ واتە هەر کەس بە نیازی کۆچکردن لە ماڵەکەی دەرچوو لە ڕێگادا مرد ئەو پاداشتەی دەست دەکەوێ کە بۆ کۆچکەرێك دەنووسرێت. وەك لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە لە عومەری کوڕی خەتابەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (إنما الأعمال بالنيات، وإنما لكل إمرئ ما نوى، فمن كانت هجرته إلى الله ورسوله، فهجرته إلى الله ورسوله، ومن كانت هجرته لدنيا يصيبها، أو امرأة يتزوجها، فهجرته إلى ما هاجر إليه) بەڕاستی کردەوەکان بەپێی نیازەکانن هەر کەس بە نیازی چی بوو ئەوەی بۆ دەبێ هەر کەس کۆچکردنەی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی بێت ئەو کۆچەی بۆ خوا و پێغەمبەرەکەی دەبێ، هەر کەس بۆ شتێکی دنیایی کۆچ بکات کە بەدەستی بهێنێ یان ژنێك کە مارەی بکات ئەوە کۆچ کردنەکەی بۆ ئەوە دەبێ کە کۆچی بۆ کردووە. ئەوەش گشتییە دەربارەی کۆچکردن و دەربارەی هەموو کردەوەکان، هەر لەوە فەرموودەیەکی چەسپاو هەیە لە هەردوو سازەواردا دەربارەی پیاوێك کە نەوەد و نۆ کەسی کوشتووە، پاشان بە کوشتنی عابدێك سەد نەفسی تەواو کردووە، پاشان لە زانایەکی پرسیوە کە ئایا تۆبە کردنی بۆ هەیە؟ ئەویش دەڵێت چی ڕێگە لە تۆبە کردنت دەگرێ؟ پاشان ڕێی نیشان دەدات بچێت بۆ شارێکی تر کە

خواپەرستی تێدا بکات، کاتێ ئەڕوات لە شارەکەی خۆیەوە کۆچ دەکات بۆ شارەکەی تر لە ڕێگا دەمرێ، فریشتەی ڕەحمەت و عەزاب دەبێتە دەمەقاڵێیان لەسەری، ئەوەیان دەڵێ بە تۆبەکاری هاتووە ئەویتریان دەڵێ هێشتا نەگەیشتووە، فەرمانیان پێدەکرێ نێوان دوو شارەکە پێوانە بکەن لە کامیانەوە نزیك بوو ئەو، لەوەیانە، خوا فەرمان دەکات کە ئەو لایە نزیك بێتەوە لەوەی تریان و ئەوەی تریان دوورکەوێتەوە لەوەی تریان، سەیریان کرد نزیکترە لەو زەمینەی کۆچی بۆ کردووە بەیەك بست، ئیتر فریشتەی ڕەحمەت گیانی کێشا، لە ریوایەتێکدا هاتووە کاتێ کەوتە گیانەڵڵا سنگی نزیك کردەوە لەو خاکەوە کە کۆچی بۆ کردووە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەتیکەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: گوێبیستی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بووم دەیفەرموو: "من خرج من بيته مجاهدا فى سبيل الله، ثم قال: ـ وأين المجاهدون فى سبيل الله ـ فخر عن دابته فمات فقد وقع أجره على الله أو لدغته دابة فمات فقد وقع أجره على الله أو مات حتف أنفه فقد وقع أجره على الله". واتە: هەر کەس لە ماڵ دەرچێ بۆ جیهاد کردن لە ڕێگەی خوادا لە وڵاخەکەی بکەوێتە خوارەوە یان شتێك پێوەی بدات یان خۆی بمرێ پاداشتەکەی ئەکەوێتە سەر خوا.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: هیشامی کوڕی عەروە لە باوکیەوە گێڕاویەتییەوە کە زوبێری کوڕی عەوام وتوویەتی: خالیدی کوڕی حیزام کۆچی کرد بۆ حەبەشە، مارێك لە ڕێگا پێوەی داو کوشتی، خوا ئەم ئایەتەی دەربارە ناردە خوارەوە کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، زوبێر وتوویەتی: من ئەمزانی دێت چاوەڕوانیم دەکرد لە خاکی حەبەشە، هیچ شتێ ئەوەندەی دڵتەنگ نەکردووم کاتێ هەواڵی مردنەکەیم پێ گەیشت، چونکە کەم کەس لە قوڕەیش کە کۆچی دەکرد کەسێکی هەر لەگەڵدا بوو لە خزم و نزیکانی. بەڵام من کەسم لەگەڵ نەبوو لە هۆزی بەنی ئەسەد کوڕی عەبدولعیزا بە ئومێدی کەسی تر نەبووم جگە لەو. ئەم بۆماوەیە غەریبە، چونکە ئەو بەسەرهاتە کاتێ بووە موسڵمانان هێشتا لە مەککەدا بوون، هاتنە

خوارەوەی ئایەتەکەش لە مەدینەدا بووە، لەوانەیە مەبەستی ئەوە بووبێ کە هاتنەخوارەوەی ئەو ئایەتە حوکمەکەی گشتییە ئەگەر بە هۆی ئەویشەوە نەهاتبێتە خوارەوە.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: عەکریمە لە ئیبنو عەباسەوە گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: چەمرەی کوڕی جوندوب کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، لە ڕێگا مرد پێش ئەوەی بگاتە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، ئیتر ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ فَقَدۡ وَقَعَ أَجۡرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا﴾.

هەروەها سەعیدی کوڕی جوبەیر لە ئەبی چەمرەی کوڕی عەیصی زورقییەوە دەگێڕێتەوە کە لە مەککە بوو چاوی تووش بوو بوو کاتێ ئایەتی: ﴿إِلَّا ٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلۡوِلۡدَٰنِ لَا يَسۡتَطِيعُونَ حِيلَةٗ﴾ هاتە خوارەوە وتی: من دەوڵەمەندم، خاوەنی حیلەم، خۆی ئامادەکرد بچێت بۆ مەدینە بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، لە تەنعیم مرد، ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿وَمَن يَخۡرُجۡ مِنۢ بَيۡتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ ثُمَّ يُدۡرِكۡهُ ٱلۡمَوۡتُ﴾.

تەبەرانی وتوویەتی: لە ئەبو مالیکەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: گوێبیستی پێغەمبەر بووم دەیفەرموو: "إن الله قال: مَن انْتَدب خارِجًا فِي سَبِيلِ غازيا ابْتِغَاءَ وَجْهي، وَتَصْدِيقَ وَعْدِي، وَإِيمَانًا بِرُسُلي، فهُو فى ضمان على اللّهِ إمَّا أَنْ يَتَوَفَّاهُ بالْجَيْشِ فَيُدْخِلَهُ الْجَنَّةَ، وَإِمَّا أَنْ يرجع فِي ضَمَانِ اللَّهِ، وَإِنْ طَالب عبدا فنغصه حَتَّى يَرُدَّه إِلَى أَهْلِهِ مَعَ مَا نَالَ مِنْ أَجْرٍ أو غَنِيمَةٍ، ونال من فضل الله ومات أو قتل او رفصته فرسه أو بعيره او لدغته هامة او مات على فراشة بأي حتف شا و الله فهو شهيد". واتە: خوای گەورە فەرموویەتی: هەر کەس لە ڕێگای مندا چوو بۆ غەزا و بە ڕاستگێڕانی پەیمانەکەم و باوەڕبوون بە نێرراوەکەم ئەوە ئاگادارێتی یان لەناو سوپاکەدا دەیمرێنێ یا خوازیاری بەندەیەك بێت کە ژیانی لێ تاڵ کردبوو، هەتا دەیگێڕێتەوە بۆ ناو کەسوکاری لەگەڵ بەدەستهێنانی پاداشت یان غەنیمەت یا فەزڵی خوای بەدەست هێنا و مرد یا کوژرا یان ئەسپەکەی جووتەی لێ دا یان وشترەکەی یان شتێك پێوەی دا یان لەسەر جێگاکەی مرد بەهەر شێوەیەك خوا بیەوێت ئەوە شەهیدە.

فەرموودەڕەوا ئەبو یەعلا وتوویەتی: لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من خرج حاجا فمات، كتب له أجر الحاج إلى يوم القيامة، ومن خرج معتمرا فمات، كتب له أجر المعتمر إلى يوم القيامة، ومن خرج غازيا في سبيل الله فمات، كتب له أجر الغازي إلى يوم القيامة"، (وهذا حديث غريب من هذا الوجه) واتە: هەر کەس بە نیازی حەج کردن لە ماڵ دەرچوو مرد پاداشتی حەجی بۆ ئەنووسرێ هەتا ڕۆژی قیامەت و هەر کەس بەنیازی عەمرە لە ماڵ دەرچوو و مرد پاداشتی عومرەی بۆ دەنووسرێ هەتا ڕۆژی قیامەت و هەر کەس بەنیازی غەزاکردنەوە لە ماڵ دەرچوو و مرد پاداشتی غەزاکاری بۆ دەنووسرێ هەتا ڕۆژی قیامەت.

﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾﴾

واتە: ئەگەر چوونە سەفەر و ترسان لەوە کە خوانەناسەکان تووشی تەشقەڵەتان بکەن، هیچ گوناهێکتان ناگاتێ لە نوێژەکانتان کورت بکەنەوە، بەڕاستی خوانەناسەکان بە ئاشکرا دوژمنتانن.

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ واتە: ڕۆیشتن بە وڵاتاندا وەك خوای گەورە فەموویەتی: ﴿عَلِمَ أَن سَيَكُونُ مِنكُم مَّرْضَىٰ ۙ وَءَاخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي ٱلْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِن فَضْلِ ٱللَّهِ ۙ﴾... [المزمل: ٢٠].

کە دەفەرموێت: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ واتە: کورتیان بکەنەوە یان لە چەندێتیدا وەك ئەوەی چوار ڕکاتییەکان بکەن بە دوو ڕکات وەك جەماوەر لەم ئایەتە گەیشتوون. وەکو کردوویانەتە بەڵگە لەسەر کورتکردنەوەی نوێژ لە سەفەردا لەگەڵ ئەوەی جیاوازییان هەیە لەسەری، هەیانە وتوویانە: ئەبێ هەر سەفەرەکە سەفەری خواپەرستی بێت لە جیهاد و حەج و عومرە و خواستنی زانستی یان دیدەنی و گەلێ شتی تر.

وەك گێڕاوەتەوە لە ئیبنو عومەرەوە بەپێی ڕواڵەتی: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ ۚ﴾ هەیانە وتوویەتی: مەرج نییە سەفەرەکە بۆ خواپەرستی بێت،

بەڵکو ئەبێ ڕەوا بێت بەپێی ئایەتی: ﴿فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِى مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ﴾ [المائدة: ٣]. وەك چۆن گۆشتی مردارەوەبووی ڕەوا کردووە کاتی ناچاری بەمەرجێ سەفەرەکەی بۆ سەرپێچی نەبێت، ئەوەش قەولی شافیعی و ئەحمەدو غەیری ئەوانە لە پێشەواکان.

ئەبوبەکری کوڕی شەیبە وتوویەتی: ئەعمەش لە ئیبراهیمەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پیاوێك هات وتی: ئەی نێردراوی خوا من پیاوێکی بازرگانم لە نێوان دەریاکاندا هاتوچۆ دەکەم، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمانی پێدا دوو ڕکات دوو ڕکات نوێژ بکات (ئەمەش مورسەلە).

وە هەیە دەڵێت: ئەوە بەسە سەفەرەکە ڕەها بێت ڕەوا بێت یان ناڕەوا هەتا بۆ ڕێگابڕین و ترس بڵاوکردنەوەش بێت، لەبەرئەوەی سەفەرە بەرەهایی ڕێی کورت کردنەوە هەیە، ئەوەش قسەی ئەبی حەنیفە و سەوری و داودە لە بە گشتێتی ئایەتەکە، بەڵام جەماوەر پێچەوانەی ئەوانن.

بەڵام فەرمایشی خوای بەرز کە دەفەرموێت: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ ئەبێ ئەمە دەرباشی بەشی زۆری دەرچوونەکان بێت کاتی هاتنەخوارەوەی ئایەتەکە، چونکە سەرەتای ئیسلام دوای کۆچکردن بەشی زۆری سەفەرەکانیان مەترسیدار بوو، بەڵکو بۆ غەزای گشتی نەبوایە هەڵنەدەسان، یان لە سریەیەکی تایبەت نەبوایە، بەشی زۆر کاتەکان جەنگی دژی ئیسلام ئەهەلەکەی بووە. دەقەکە ئەگەر لەبەشی زۆر دەرچوو تێگەیشتن نییە لێی، وەك فەرمایشی خوای گەورە: ﴿وَلَا تُكْرِهُوا۟ فَتَيَـٰتِكُمْ عَلَى ٱلْبِغَآءِ إِنْ أَرَدْنَ تَحَصُّنًا﴾ [النور: ٣٣] ﴿وَرَبَـٰٓئِبُكُمُ ٱلَّـٰتِى فِى حُجُورِكُم مِّن نِّسَآئِكُمُ﴾ [النساء: ٢٣].

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە یەعلای کوڕی ئومەیەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پرسیارم کرد لە عومەری کوڕی خەتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) پێم وت: ئایەتی: ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾، بەڵام ئێستا خەڵك لە ئاسایشدایە بۆچی نوێژ کورت بکەنەوە؟ عومەر پێی وتم: من وەك لام سەیر بوو پرسیم لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەربارەی ئەوە، فەرمووی: "صدقة تصدق الله بها عليكم فاقبلوا صدقته" (رواه مسلم) واتە: ئەوە صەدەقە کە خوا پێی داون ئێوەش صەدەقەکەی وەربگرن.

ئەبوبەکری کوڕی شەیبە وتوویەتی: لە ئەبی حەنزەلەی حەزاوە هاتووە وتوویەتی: دەربارەی نوێژی سەفەر لە ئیبنو عومەرم پرسی وتی: دوو ڕکاتە. وتم ئەم ئایەتە لەکوێ کە دەفەرموێت: ﴿إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ﴾ ئێمە لە ئاسایشدایم، فەرمووی: سوننەتی پێغەمبەرە (دروودی خوای لێ بێت).

ئیبنو مەردەویە وتوویەتی: لە ئەبی وەداکەوە هاتووە وتوویەتی: دەربارەی دوو ڕکات نوێژکردن لە سەفەردا لە ئیبنو عومەرم پرسی، وتی: ئەوە رووخسەتێکە لە ئاسمانەوە هاتووەتە خوارەوە، ئەگەر حەز دەکەیت رەدی بکەرەوە.

ئەبوبەکری کوڕی شەیبە وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا لە نێوان مەککە و مەدینەدا دوو ڕکات نوێژمان دەکرد لە کاتێکدا لە ئاسایشدا بووین.

لە موحەممەدی کوڕی سیرینەوە هاتووە کە ئیبنو عەباس وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە مەدینەوە چوو بۆ مەککە، لە خوا نەبێت لە کەس نەدەترسا، بەڵام دوو ڕکات نوێژی کرد.

بوخاری وتوویەتی: یەحیای کوڕی ئیسحاق بۆی گێڕاینەوە وتی: گوێبیستی ئەنەس بووم دەیووت: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) لە مەدینەوە چووین بۆ مەککە، دوو ڕکات، دوو ڕکات نوێژی دەکرد، هەتا گەڕاینەوە مەدینە، ئەڵێ: وتم: لە مەککە هیچ مانەوە؟ وتی: دە ڕۆژ تیایدا ماینەوە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە حاریسی کوڕی وەهبی خوزاعییەوە هاتووە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) نوێژی نیوەڕۆ و عەسرم کرد لە مونا، خەڵکێکی زۆری لێ بوو، ئاسایشیش بوون، دوو ڕکات دوو ڕکات.

بوخاری لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا دوو ڕکات نوێژمان دەکرد، پاشان لەگەڵ ئەبو بەکر و عومەر و پاشان لەگەڵ عوسمان لەسەرەتای خەلافەکەیەوە، پاشان بە تەواوەتی نوێژەکانی دەکرد.

هەر بوخاری وتوویەتی: لە عەبدوڕەحمانی کوڕی یەزیدەوە دەگێڕنەوە

وتوویەتی: عوسمانی کوڕی عەففان (ڕەزای خوای لێ بێت) لە مونا چوار ڕکات نوێژی بۆ کردین، دەربارەی ئەوە بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودمان وت (إنا لله وإنا إليه راجعون)، پاشان وتی: من خۆم لەگەڵ پێغەمبەردا بووم لە مونا دوو ڕکات نوێژی بۆ کردین، پاشان لەگەڵ ئەبو بەکر بوین هەر دوو ركات نوێژی بۆ کردین، وە لەگەڵ عومەری کوڕی خەتتابدا دوو ڕکاتمان کرد، خۆزگە لەو چوار ركاتە دوو ڕکاتی وەرگیراوم بە نسیب بوایە.

ئەو فەرموودانە بەڵگەن لەسەر ئەوەی بوونی ترس مەرج نییە بۆ کورتکردنەوەی نوێژ، لەبەرئەوە زانایان وتوویانە: مەبەست لە کورتکردنەوەی نوێژ لێرەدا کورتکردنەوەی چۆنێتییە، نەك چەندێتی، ئەوەش قسەی موجاهید و زەحاك و سوودییە. پشتیان بەستووە بەوەی ئیمام مالیك لە ساڵحی کوڕی کەیسانەوە لە عەروەی کوڕی زوبێرەوە دەگێڕێتەوە کە عائیشە وتوویەتی: نوێژ دوو ڕکات دوو ڕکات فەرز کرا لە سەفەر و ناوشاردا، پاشان نوێژی سەفەر وەك خۆی مایەوە، بەڵام نوێژی ناوئاوەدانی زیاد کرا.

زانایان وتوویانە: کە ئەسڵی نوێژ لە سەفەردا دوو ڕکات بوویێ چۆن مەبەست لە کورتکردنەوە لێرەدا کورتکردنەوەی چەندێتییە، چونکە هەرچی ئەسڵ بێت دەربارەی ناوترێ ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ سەریحترە لەوە کە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، ئەوەیە کە ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: نوێژی سەفەر دوو ڕکاتە و نوێژی چێشتەنگاو (الضحی) دوو ڕکاتەوە نوێژی فەجر دوو ڕکاتە و نوێژی هەینی دوو ڕکاتە ئەمانە بە تەواوین بێ ئەوەی کورت کرابنەوە لەسەر زمانی پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت).

ئیبنو عەباس وتوویەتی: خوا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەتان موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) نوێژی فەرزکردووە لە ئاوەدانیدا چوار ڕکات و لە سەفەردا دوو ڕکات، لە کاتی مەترسییدا یەك ڕکات.

وەك ئەوە چەسپاوە لە ئیبنو عەباسەوە پێچەوانەی ئەوە نییە کە لە عائیشە گێڕاوەتەوە، کە ئەو هەواڵی داوە، بنەمای نوێژی دوو ڕکات بووە، بەڵام نوێژی ئاوەدانی لێی زیاد کرا، جا کاتێ ئەوە جێگیر بوو ڕاستە بوترێت:

بەراستی نوێژی فەرزی ئاوەدانی چوار ركاتە وەك ئیبنو عەباس وتوویەتی، بەڵام حەدیسەکەی ئیبنو عەباس و عائیشە رێکن لەسەر ئەوەی نوێژ لە سەفەردا دوو ڕكاتە و تەواویشەو کورتکراوە نییە وەك لە حەدیسەکەی ئیبنو عومەردا هاتووە.

ئەگەر بەو شێوەیە بێت مەبەستی خوای گەورە لە فەرمایشی: ﴿فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ کورتکردنەوەی چۆنێتییە وەك نوێژی کاتی مەترسیی، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿إِنۡ خِفۡتُمۡ أَن يَفۡتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْۚ﴾.

لەبەرئەوە دوای ئەوە فەرموویەتی: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمۡ فَأَقَمۡتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ لێرەدا مەبەست لە کورتکردنەوەی نوێژی روونکردووەتەوە و باسی شێوە و چۆنیەتییەکەی کردووە، لەبەرئەوە کاتێ بوخاری (کتاب الصلاه) نووسی سەرەتاکەی بەم ئایەتە دەست پێکرد، کە دەفەرمووێ: ﴿وَإِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ إلـى قـولـه: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا﴾. بەو شێوەیە جوەیبر لە ززەحاکەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَإِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنۡ خِفۡتُمۡ﴾ وتوویەتی: ئەوە کاتی جەنگ پیاو بەسواری ولاغەکەیەوە دوو ڕكات دەکات رووی بۆ هەر شوێنێك بێت.

ئەسبات لە سوودییەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَإِذَا ضَرَبۡتُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ إِنۡ خِفۡتُمۡ﴾ وتوویەتی: کاتێ لە سەفەردا دوو ڕكات نوێژ دەکەیت ئەوە کورتکردنەوەی تەواوە دروست نییە جگە لەوە کە ترسی ئەوانەی هەبێت کە لە نوێژەکەی بکەن کورتی بکەنەوە لێرەدا کورتکردنەوە یەك ڕكاتە.

ئیبنو ئەبی نەجیح وتوویەتی: موجاهید دەربارەی: ﴿فَلَيۡسَ عَلَيۡكُمۡ جُنَاحٌ أَن تَقۡصُرُواْ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ وتوویەتی: ڕۆژێك پێغەمبەرو (درودی خوای لێ بێت) هاوەڵەکانی لە عەسەفان دەبن، هاوبەشدانەرەکانیش لە خەجتان بەرامبەر یەك دەوەستن، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) چوار ڕكات نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردن بە رکوعی ئەوان و سوجدەیان و بەپێوە وەستانیان بەیەکەوە، هاوبەشدانەرەکان وا هات بە دڵیاندا کە هێرش بکەنە سەر کەلوپەلەکانیان.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: خالیدی کوڕی ئوسەید بە عەبدوڵلای کوڕی عومەری وت: ئێمە لە کتێبەکەی خوادا دەبینین کورتکردنەوەی نوێژ کاتی مەترسییە، بەڵام نابینین کە موسافیر ئەبێ نوێژ کورت بکاتەوە، عەبدوڵلا وتی: ئێمە بینیومانە کە پێغەمبەرەکەمان ئەو کارەی کردووە ئێمەش لەسەری دەڕۆین. لێرەدا ترسی ناو ناوە بە کورتکراوە و ئایەتەکەشی لەسەر ئەوە داناوە نەك لەسەر کورتکردنەوەی نوێژی موسافیر.

لەوەش سەریحتر ئەوەیە کە ئیبنو جەریر گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: سوعبە لە سەماکی حەنەفیەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: دەربارەی نوێژی سەفەر لە ئیبنو عومەرم پرسی، وتی: دوو ڕکاتی تەواوە بێ کورتکردنەوە، بەڵکو کورتکردنەوە لە نوێژی مەترسییدایە. وتم: نوێژی کاتی مەترسیی چییە؟ وتی: ئەوەیە ئیمام بە کۆمەڵێك یەك ڕکات دەکات، پاشان کۆمەڵێکی دیکە دێنە جێی ئەوان و کۆمەڵێکی دیکە دێنە جێی کۆمەڵێکی دیکە، یەك رکات نوێژیان بۆ دەکات، ئەو کاتە ئیمام دوو رکات و هەر کۆمەڵەیەکیش یەك رکات دەکەن.

﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ الصَّلَوٰةَ فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ وَلْيَأْخُذُوٓاْ أَسْلِحَتَهُمْ فَإِذَا سَجَدُواْ فَلْيَكُونُواْ مِن وَرَآئِكُمْ وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ لَمْ يُصَلُّواْ فَلْيُصَلُّواْ مَعَكَ وَلْيَأْخُذُواْ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ وَدَّ الَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ وَأَمْتِعَتِكُمْ فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَاحِدَةً وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓاْ أَسْلِحَتَكُمْ وَخُذُواْ حِذْرَكُمْ إِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا ﴿١٠٢﴾﴾

واتە: ئەگەر تۆش لەسەفەردا لەگەڵیان بووی بۆخۆت نوێژت بۆ دابەستن با هەندێکیان بەچەکەوە نوێژ لە دوای تۆوە دابەستن، ئەگەر لە سوژدە بوونەوە بچنە دواوە و لە پشتەوە بتپارێزن ئەمجار ئەوانەی لە نوێژدا بەشدارنەبوون بێنە پێش و نوێژ لەگەڵ تۆدا دابەستن و لەسەر هۆش بن لە چەکەکان و لە خۆیان، خوانەناسان بە ئارەزوون ئێوە ئاگاتان لە چەك و ئەسبابتان ببڕێ و لە

پڕ پەلامارتان بدەن، ئەگەر باران تووشی سەغڵەتیتان دەکات یان نەخۆشیی ئەگەر چەکەکانتان دانێن هیچ گوناهێکتان ناگاتێ، بەڵام هەردەبێ هۆشیار بن، دیارە خودا بۆ ئەوانەی دێن دوژمنن ئازاردانێ ئابڕوبەرەی سازکردووە.

نوێژی ترس جۆرەکانی زۆرن: چونکە جاری وانەبێ دوژمن لای قیبلەوەیە و جاری وا ئەبێ لای قیبلەوە نییە، نوێژیش جاری وایە چوار ڕکاتیە، وە جاری وایە سێ ڕکاتیە وەك نوێژی شێوان، وە جاری وایە دوو ڕکاتیە وەك نوێژی بەیانی و سەفەر، پاشان جاری وایە بە کۆمەڵە و جاری وایە کاتی پێکدادانە توانای کۆمەڵیان نابێ، بەڵکو بەتاك نوێژ دەکەن بەرەو قیبلە، یان بەرەو لایەکی تر بە پیادەیی، یان بە سواری، وە بۆیان هەیە بەرێوە بڕۆن لەو بارودۆخەدا، وە لەکاتی نوێژەکەدا لە دووژمن دەدەن.

لەناو زانایاندا هەیە وتوویەتی: لەو بارودۆخەدا یەك ڕکات دەکرێ بەپێی حەدیسەکەی ئیبنو عەباس کە لە پێشەوە باسکراوە ئەحمەدی کوری حەنبەل ئەوەی وتووە.

مونذری لە کتێبی (الحواش)دا وتوویەتی: عەتا و جابیر و حەسەن و موجاهید و حەکەم و قەتادە و حەحمان ئەوەیان وتووە، وەتاوس و زەحاك بۆ ئەوە چوون.

ئەبو عاصمی عەبادی لە موحەممەدی کوڕی نەصر میروەزی ئەگێڕیتەوە: کە رای وابووە نوێژکردنی بەیانی بەیەك رکات کاتی مەترسیی، وە ئیبنو حەزمیش بۆ ئەوە چووە. وە ئیسحاقی کوڕی ڕاهویە وتوویەتی: کانتی شەڕە شمشێر یەك رکات دروستە و بە ئاماژە بێت ئەگەر نەشتوانی یەك سوجدە بەسە، چونکە یادی خوایە.

چەند زانایەکی دیکە وتوویانە: یەك (الله اکبر) بەسە، لەوانەیە مەبەستی یەك رکات بێ وەك ئیمام ئەحمەدو هاوەڵەکانی وتوویانە. جابیری کوڕی عەبدوڵڵا و عەبدوڵڵای کوڕی عومەر و غەیری ئەویش لە سەحابە و سوودی ئەوەیان وتووە.

لە زانایان هەیە کە بەرەو وایان داناوە نوێژەکە دوابخرێ کاتێ جەنگ و پیادادان وەك پێغەمبەر لە جەنگی (الاحزاب)دا نوێژی نیوەڕۆو عەسری

دواخست دوای خۆرئاوابوون کردبێ، پاشان نوێژی ئێوارەی کرد، پاشان خەوتنان وەك دوای ئەوە وتی: ڕۆژی بەنی قورەیزە کاتێ سوپاکەی ئامادەکرد: کەستان نوێژی عەسر نەکات لە بەنی قورەیزە نەبێ لە ڕێگادا کاتی نوێژی عەسر هات هەندێکیان وتیان: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) داوای لێ کردوین پەلە بکەین نەیویستووە نوێژەکانمان لە کاتی خۆی دوای بخەین، هەندێکیان لە ڕێگادا لە کاتی خۆیدا نوێژەکەیان کرد و هەندێکیان دوایان خست لە بەنی قورەیزە دوای خۆرئاوابوون نوێژەکە یان کرد. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لۆمەی هیچ لایەکیان نەکرد، بەڵام ئەوانەی کاتی نوێژەکە نوێژیان کرد نزیکتر بوو لە ڕاستییەوە، هەرچەندە ئەوانیتر بەهانەیان هەبوو، بەڵام جەماوەر وتوویانە: ئەوانە هەموو سڕاوەتەوە بە نوێژی ترس کە هێشتا نەهاتبووە خوارەوە، کاتێ هاتە خوارەوە دواخستنی نوێژ سڕرایەوە.

بوخاری لە سازەوارەکەیدا وتوویەتی: ئەوزاعی وتوویەتی: کاتێ سەرکەوتن هاتە پێشەوە نەیانتوانی نوێژەکەیان بکەن، هەریەکەیان بە ئاماژە لە دڵی خۆیدا نوێژەکەی دەکات ئەگەر توانای ئاماژەشیان نەبوو نوێژەکەیان دوا دەخەن هەتا شەڕ کۆتایی دێت، یان هێمن دەبنەوە، دوو ڕکات نوێژ دەکەن، ئەگەر نەیانتوانی یەك ڕکات دەکەن و دوو سوجدە دەبەن، ئەگەر نەیانتوانی (الله) بریتی ناکەوێ نوێژەکەیان دوادەخەن بۆ کاتی ئارام بوونەوە. مەکحولیش ئەوەی وتووە.

ئەنەسی کوڕی مالیك وتوویەتی: ئامادەی جەنگ بووم کاتێ چواردەوری قەڵای نوستەریان دا کاتێ نوێژی بەیانی شەڕ گەرم بوو کەس نەیتوانی نوێژ بکات، ئێمەش نوێژمان نەکرد هەتا خۆر بەرز بووەوە، ئێمە لەگەڵ ئەبو موسادا بووین قەڵاکەمان گرت، ئەنەس وتوویەتی: ئەو نوێژەم ئەوەندەی هەموو دونیاو هەرچی تێدا بوو لا ناخۆش بوو.

هەرکەس پاڵ بدات بەوەوە بۆی هەیە کە کردەوەکەی ئەبو موساو هاوەڵەکانی ڕۆژی گرتنی توستەر بکاتە بەڵگە، چونکە ئەوە بەناوبانگ ئەبێت بەزۆری، بەڵام ئەوە لە خەلافەتی عومەردا بووە (ڕەزای خوای لێ بێت) نەقڵ نەکراوە کە ئینکاری لەو کارەیان کردبێ یان یەکێ لە سەحابەکان ـ ئیتر خوا دەزانێ ـ.

نوێژی ترسیش لە جەنگی خەندەقدا دانراوە، چونکە جەنگی (ذات الرقاع) پێش جەنگی خەندەق بووە، بەقسەی جەماوەری زانایانی سیرەو مەغازی ئەو کەسەی دانی ناوە بەوەدا موحەممەدی کوڕی ئیسحاق و موساو کوڕی عەقەبەو واقیدی و موحەممەدی کوڕی سەعدو خەلیفە خەیات و گەلێ کەسی تر.

بوخاری و غەیری ئەویش وتوویانە: جەنگی (ذات الرقاع) دوای جەنگی خەندەق بووە، بەپێی حەدیسەکەی ئەبی موساو ئەوەی لە پێشەوە دەربارەی خەندەق باسکرا ـ ئیتر خوا دەزانی ـ.

ئەوەی کە زۆر سەیرە کە موزەنی و ئەبو یوسفی قازی و ئیبراهیمی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عولەیە بۆ ئەوە چوون کە نوێژی ترس سڕراوەتەوە بەوەی کە لە جەنگی خەندەقدا نوێژەکەی دواخست (دروودی خوای لێ بێت)، ئەویش زۆر غەریبە.

چەند فەرموودەی چەسپاو هەیە کە باسی نوێژی ترس دەکات دوای جەنگی خەندەق، بەڵام دواخستنی نوێژەکەی دانراوە لەسەر ئەوەی کە مەکحول و ئەوزاعی وتوویانە کە بەهێزترە و نزیکترە لە ڕاستییەوە، کە خوای بەرز دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە کاتێ بویتە ئیمامیان و نوێژی ترست بۆ کردن ئەم حاڵەتە ئەوەی یەکەم نییە، چونکە ئەو نوێژەی بۆ یەك ڕکات کورت کردەوە وەك حەدیسەکە بەڵگەیە لەسەری کە دەفەرموێت: "بەتاکی و بە پیادەیی و بە سواری و ڕووە و قیبلە و غەیری قیبلەش، پاشان باسی شێوەی نوێژی کۆمەڵ و بوونە ئیمام بە یەك ئیمام. چەند چاکە ئەو کەسانەی ئەوەیان کردۆتە لەسەر پێویستی نوێژی کۆمەڵ بەم ئایەتە پیرۆزە کە خوا لە چەند کردەوەی تر خۆش بووە لە پێناوی نوێژی جەماعەتدا. ئەگەر واجب نەبوایە ئەوە نەدەبوو، بەڵام ئەوانەی ئەم ئایەتەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر نەسخ بوونەوەی نوێژی ترس دوای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە فەرمایشی ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ﴾ دوای نەمانی ئەو ئامادەبوونەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کردنە بەڵگەیەکی لاوازە وەك ئەوانەی وتوویانە زەکات دوای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نادرێ بەپێی ئایەتی: ﴿خُذْ مِنْ

﴿أَمْوَٰلِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَوٰتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ﴾ [التوبة: ١٠٣] ڕەد دەدرێتەوە، وتوویانە: ئێمە دوای پێغەمبەر زەکات بە کەس نادەین، بەڵکو ئێمە خۆمان زەکاتی خۆمان دەردەکەین بۆ ئەوانەی خۆمان رامان لێی بێت و نایدەین بە کەسێك نەبێت کە نزاکەی نەبێتە هۆی ئارامی بۆمان، لەگەڵ ئەوەشدا هاوەڵانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بەرەنگاریان دەوەستانەوە، ڕێی ئەوەیان لێگرتن ئەوە بکەنە بەڵگەو ناچاریان کردن زەکات بدەن و شەڕیان کرد لەگەڵ ئەوانەدا کە زەکاتیان نەئەدا.

با باسی هۆی هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە پیرۆزە بکەین یەکەمجار پێش ئەوەی باسی سیفەتەکەی بکەین.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە عەلییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: کۆمەڵێك لە بەنی نەجار پرسیار لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کرد، وتیان: ئەی نێردراوی خوا، ئێمە دەچین بۆ بازرگانی چۆن نوێژ بکەین؟ خوای گەورەش ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ پاشان وەحی پچڕا، دوای ئەوە بە ساڵێك پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) غەزای کرد و نوێژی نیوەڕۆی کرد، هاوبەشدانەرەکان وتیان: موحەممەد و هاوەڵەکانی پشتیان تێکردوون بۆچی هێرش ناکەنە سەریان؟ یەکێکیان وتی: دوای ئەوە نوێژێکی تریشیان دەبێت، وتوویەتی: خوای گەورە لە نێوان ئەو دوو نوێژەدا ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ بەو شێوەیە نوێژی ترس هاتە خوارەوە. ئەوە سیاقێکی زۆر غەریبە، بەڵام بۆ هەندێکیان چەند شایەت هەیە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی عەیاشەوە گێڕاویانەتەوە وتوویەتی: لە عەسەفان لەگەڵ پێغەمبەردا بووین، ڕوومان کردە هاوبەشدانەرەکان کە خالیدی کوڕی وەلید سەرکردەیان بوو، ئەوان لە نێوان ئێمەو قیبلەدا بوون، پێغەمبەر نوێژی نیوەڕۆی بۆ کردین، هاوبەشدانەرەکان ئەوانە لەسەر شێوەیەکن ئەگەر هێرشیان بکەینە سەر باشە، پاشان وتیان: دوای ئەوە نوێژێکی تر دێت لە خۆیان و منداڵەکانیان خۆشتر دەوێت، وتوویەتی: جوبرائیل ئەم ئایەتانەی لە نێوان نوێژی نیوەڕۆ و عەسردا هێنایە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا كُنتَ

﴿فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ ئەڵێ: نوێژی عەسر هات، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمانی پێ کردین چەکەکانمان هەڵگرین، وتوویەتی: بە دوو ڕیز لە دوایەوە وەستاین، وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چوە ڕکوع ئێمەش چووینە ڕکوع، پاشان سەری بەرزکردەوە هەموومان سەرمان بەرزکردەوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لەگەڵ ئەو ڕیزەی لە دوایەوە بوون سوجدەیان برد لەگەڵ پێغەمبەردا، ڕیزەکەی دواتر بەپێوە وەستان پاسەوانییان دەکرد کاتێ سوجدەیان بردو هەڵسانەوە ڕیزەکەی دواوە دانیشتن سوجدەیان برد لە جێگای خۆیاندا ئەوانە چوونە جێی ئەوانی پێشەوە ئەوانی پێشەوە هاتنە دواوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چووە ڕکوعەوە هەموو چووینە ڕکووعەوە، پاشان سەری بەرزکردەوە هەموو سەرمان بەرزکردەوە، پاشان پێغەمبەر لەگەڵ ئەو ڕیزەدا کە لە دوایەوە بوون چوونە سوجدە ئەوانی تریش بە پێوە وەستان و پاسەوانییان دەکرد کاتێ دانیشتن ئەوانی تر سوجدەیان برد، پاشان سڵاوی دایەوە و هەڵسا لێبووەوە، وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دوو جار بەو شێوەیە نوێژی کردووە، جارێك لە عەسەفان جارێکیش لە خاکی بەنی سولەیمدا.

لەوانە ئەوەی بوخاری ئەگێڕێتەوە وتوویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە دەگێڕنەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەڵساو خەڵکەکەش هەڵسان لەگەڵیا، (الله اکبر)ی کرد و ئەوانیش (الله اکبر)یان کرد لەگەڵیا، پاشان چووە ڕکوع، کۆمەڵێکیان لەگەڵیا چوونە ڕکوعەوە، پاشان چووە سوجدە ئەوانیش لەگەڵیا چوونە سوجدە، پاشان هەڵسا بۆ ڕکاتی دووەم، پاشان ئەوانەی سوجدەیان بردبوو پاسەوانی براکانیان کرد، کۆمەڵەکەی تر هاتن ڕکوعیان بردو سوجدەیان برد لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت)، خەڵك هەموو لە نوێژدا بوون، بەڵام هەندێکیان پاسەوانی هەندێکیان دەکرد.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: کە سلیمانی کوڕی قەیسی یەشکری لە جابیری پرسی کورتکردنەوەی نوێژ کام ڕۆژ هاتە خوارەوە؟ یان چ ڕۆژێك بووە؟ جابیر وتوویەتی: ڕۆیشتن بۆ ئەوەی دەس بەسەر کاروانەکەی قورەیش دا

بگرین کە لە شامەوە هاتبوونەوە، هەتا گەیشتینە نەخلە، یەکێك هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: ئەی موحەممەد لێم دەترسی؟ فەرمووی: نەء، کابرا وتی: ئەی کێ ڕێم لێ دەگرێ کە نەتکوژم؟ فەرمووی: خوا ئەمپارێزێ لێت، وتوویەتی: شمشێرەکەی هەڵکێشا و هەڕەشەی لێ کرد، پاشان بانگەوازی کرد بۆ بارکردن و چەکەکەی هەڵگرت، پاشان بانگدرا بۆ نوێژ، پێغەمبەر نوێژی بە کۆمەڵێك کرد و کۆمەڵەکەی تر پاسەوانییان دەکرد، دوو ڕکاتی بە وانە کرد کە لە دوایەوە بوون، پاشان ئەوانەی دوای ئەو پشتاوپشت هاتنە دواوە چوونە ریزی هاوەڵەکانیان، پاشان ئەوانی تر هاتن دوو رکات نوێژی پێ کردن ئەوانیتریش پاسەوانیان بوون، پاشان سڵاوی دایەوە، بەو شێوەیە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) چوار رکات نوێژی پێ کردن و هەر ریزەش دوو رکات. ئەو کاتە خوا کورتکردنەوەی نوێژی ناردە خوارەوەو فەرمانی دا بە باوەڕدارەکان چەك هەڵگرن.

ئیمام ئەحمەد دەگێڕێتەوەو وتوویەتی: سلیمانی کوڕی قەیسی یەشکری لە جابیری کوڕی عەبدوڵلاوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر دەجەنگی لەگەڵ جەنگاوەرەکانی چەصفەدا، پیاوێك کە ناوی غەورەسی کوڕی حارس بوو هات هەتا بە شمشێرەکەیەوە لەسەر سەری پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وەستا وتی: ئێستا کێ ڕێم لێ دەگرێ بۆ ئەوەی نەتکوژم؟ فەرمووی: خوا، شمشێرەکەی لەدەستی دەکەوێتە خوارەوە، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) شمشێرەکەی هەڵدەگرێتەوە و دەفەرمووێت: ئەی کێ ڕێ لە من دەگرێ کە نەتکوژم، کابرا وتی: باشترین شمێربەر بە، فەرمووی: شایەتی دەدەیت کە خوا تاك و تەنهایە و من نێردراوی ئەوم، وتی: نەخێر، بەڵام پەیمانت دەدەمێ هەرگیز دژی تۆ شەڕ ناکەم و لەگەڵ ئەو کۆمەڵەش نابم دژی تۆ دەجەنگن، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ڕێی دا ڕۆیشت، ئەویش چووەوە بۆ ناو قەومەکەی وتی: لای چاکترین کەسەوە هاتومەوە، کاتێ کاتی نوێژ هات پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نوێژی ترسی کرد، خەڵکەکە کران بە دوو بەشەوە، کۆمەڵێکیان بەرامبەر دوژمن راوەستان و کۆمەڵێکیان لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) نوێژیان کرد، بەو کۆمەڵەی لەگەڵیا بوون دوو

ڕکاتی کرد و ڕۆیشتن چوونە چوێنی ئەوانەی بەرامبەر دوژمن وەستابوون، پاشان ئەوانەی بەرامبەر دوژمن ڕاوەستابوون هاتن لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) دوو ڕکات نوێژیان کرد، بەو پێیە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) خۆی چوار ڕکاتی کرد و کۆمەڵەکانیش هەریەکەیان دوو ڕکات.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: یەزیدی فەقیر وتوویەتی: لە جابیرم پرسی کە ئایا نوێژ کورت بکەمەوە بۆ دوو ڕکات لە سەفەردا؟ وتی: دوو ڕکات لەسەفەردا نوێژی تەواوە، بەڵام کورتکردنەوە بۆ یەك ڕکاتە لە کاتی شەڕ و پێکدادانداا، لەکاتێکدا لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت) بوین لە جەنگێکدا، کاتێ قامەت کرا بۆ نوێژ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەڵسا کۆمەڵێکی ڕیز و کۆمەڵێکی تری وەستان بەرامبەر دوژمن، یەکجار چوونە ڕکوعەوەو دووجار چوونە سوجدەوە، پاشان ئەوانەی لە دواوە بوون هاتنە شوێنی ئەوان و لە دوای پێغەمبەرەوە (دروودی خوای لێ بێت) وەستان یەکجار چوونە ڕکوعەوە و دووجار چوونە سوجدەوە، پاشان پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دانیشت و سڵاوی دایەوە ئەوانەی لە دوایەوە بوون سڵاویان دایەوە، بەو پێیە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دوو ڕکاتی کرد و خەڵکەکەش یەك ڕکات، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ الآية.

بەڵام فەرمانکردن بە هەڵگرتنی چەك لە نوێژی ترسدا لای کۆمەڵێ لە زانیان لەسەر پێویستبوون دانراوە بەپێی ڕواڵەتی ئایەتەکە. یەکێ لە دوو قەولەکەی شافیعیە. ئەم فەرمایشەی خوا بەڵگەیە لەسەر کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ ۖ وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ﴾ بەشێوەیەك لە ئامادەباشیدا بن کاتێ پێویستیان بە هەڵگرتنی چەك هەبوو، کردتان بە خۆتانەوە بەبێ ئەرك و گرانی ﴿إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلْكَـٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾.

﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَـٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ ۚ فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَـٰبًا مَّوْقُوتًا ﴿١٠٣﴾ وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ

يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٠٤﴾

واتە: هەرگا لە نوێژبوونەوە، بەپێوەو بە دانیشتن و کە لەسەر لایەك ڕادەکشێن یادی خودات لەبیر نەچێ لەوەختی خاترجەمیشدا کە هیچ ترسێتان نەماوە بە ئاسایی نوێژەکانی خۆتان بکەن نوێژ لەسەر خاوەن باوەڕ نووسراێکە وەختی بۆ دیاری کراوە. لەدانەپەی دوژمنان هیچی سستی مەکەن ئەگەر ئێوە لەوان تووشی ئازار دەبن ئەوانیش هەروەکو ئێوە ئازار دەبینن ئێوە ئومێد و خودایە ئەوان ئەمەشیان نییە خودا زانای لەکارزانە.

خـوای گـەورە فـەرمـان دەدات بـە یـادکـردنـی زۆر دوای نـوێـژ تـرس هەرچەندە دوای شتی تریش دانراوە و ڕەغبەتی پێ دراوە، بەڵام لێرەدا جەخت ئەکاتەوە لەسەری لە کاتێکدا سوککردن لە پایەکانیدا رووی داوە، وە لەو ڕێ پێدانەی دراوە دەربارەی هاتوچوون تێیدا کە لە غەیری نوێژدا نییە وەك خوای بەرز دەفەرموێت دەربارەی مانگە حەرامکراوەکان: ﴿فَلَا تَظْلِمُوا۟ فِيهِنَّ أَنفُسَكُمْ﴾ [التوبة: ٣٦] هەرچەندە ئەوە قەدەغەیە لەغەیری ئەوەدا، بەڵام جەختی لەسەر کراوەتەوە لەبەر گەورەیی حورمەت و گەورەییەکەی. لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا قَضَيْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱذْكُرُوا۟ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمْ﴾، واتە لە هەموو بارودۆخێکی ژیانتاندا، پاشان فەرموویەتی: ﴿فَإِذَا ٱطْمَأْنَنتُمْ فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ واتە کاتێ هاتنەوە سەرخۆو ترسەکە نەما و دڵنیایی بـەدەسـت هـات ﴿فَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بـەتـەواوەتـی نـوێـژەکـانـتـان بـکـەن، وەك فەرمانتان بە سنوورەکانی کراوە لە ملکەچی تێیدا و لە ڕکوع و سجودەکانی و هەموو کاروبارەکانی.

خـوای گـەورە دەفـەرمـووێـت: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتْ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ كِتَٰبًا مَّوْقُوتًا﴾ ئیبنو عەبباس وتوویەتی: فەرزکراوە، هەروەها وتوویەتی: بۆ نوێژ کات دانراوە وەك کاتی حەج.

ئیبنو مەسعود وتوویەتی: بۆ نوێژ کاتێك دیاری کراوە وەك کاتی حەج.

کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ﴾ واتە لە چوون بە دوای

دوژمندا لاوازی مەنوێنن، بەڵکو تێبکۆشن و جەنگیان دژ بکەن لە هەموو شوێنێکدا خۆیان بۆ داگرن ﴿إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ﴾ وەك چۆن ئێوە بریندار بوون و لێتان کوژراوە ئەوانیش بەو شێوەیەن، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ فَقَدْ مَسَّ ٱلْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُۥ﴾ [آل عمران: ١٤٠].

پاشان خوا دەفەرموێت: ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ﴾ واتە ئێوە و ئەوان یەکسانن تووشتان بووە لە برینداربوون و ئازارو کوژران، بەلام ئێوە بە ئومێدی پاداشت و سەرکەوتن لە خوا و پشتگیریتان وەك فەرمانی پێداون لە کتێبەکەیدا لەسەر زمانی پێغەمبەرەکەیەوە کە ئەویش پەیمانێکی هەتاهەتاییەو هەواڵێکی راستە، بەلام ئەوان بە ئومێدی هیچ نین لەوانە. ئێوە لە پێشتر بۆ جیهادکردن و زۆر تر بە رەغبەتن بۆی لەوان و دەربارەی راگرتنی وشەی خوا و بەرزکردنەوەی.

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا﴾ واتە: ئەو زاناتر و بەتواناترە لەوانەدا کە داینا‌وە جێبەجێی دەکات لە حوکمە کەونی و شەرعییەکاندا ئەو هەر ستایشکراوە لەسەر هەموو شێوە و بارودۆخێك.

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمًا ﴿١٠٧﴾ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾﴾

واتە: ئێمە ئەم قورئانەمان بۆ لای تۆ ناردوەتە خوار کە هەرچی تێدایە راستە، سا تۆ بەهۆی ئەم قورئانە وەك خودا ڕێی نیشان داوی بەکاری مەردم رابگە، خۆشت مەکە بە لاگری گزیکاران، لەبەر خودا بپاڕێوە کە لێت خۆش

بێ، خودا لە گوناه و دەبورێ و دلۆڤانە، گێرەو کێشە لەسەر ئەو کەسانە مەکە کە لەگەڵ خۆیان غەیانن خوا حەز ناکات لەو کەسانەی زۆر غەیان و گوناهبارن. شت لە خەڵك دەشارنەوە خۆ ناتوانن لە خودا هیچ بشارنەوە، خوداش لەگەلیانە کاتێ کە شەوانە قسەگەلێ دەکەن کە پێ قادێ نییە، هەر کارێکی ئەوان دەیکەن، دیارە خودا ئاگای لێیە.

وا گریمان تا لەسەر دنیا ژیاون توانیت لاگیرییان لێ بکی و لەسەر ئەوانە بە جواب بی، ئەدی کێ لە ڕۆژی دوایی توانای هەیە کە لە بەرامبەر خودا لەسەر ئەوان بکاتەوە، یان کێ هەیە کارەکەیان بگرێتە ئەستۆ؟

خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەی دەفەرمووێ: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ﴾ واتە ئەوە لە خواوە هەقە وە هەقیشی تێدایە لە هەواڵ و داخوازییەکانیدا ﴿لِتَحۡكُمَ بَيۡنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ﴾ لە زانایانی ئوصول دا هەیە ئەوەیان کردۆتە بەڵگە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بۆی هەیە بە ئیجتیهاد کار بکات بەپێی ئەو ئایەتە و بەپێی ئەوەی چەسپاوە لەهەردوو سازەواردا لە ئوسولەمەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) گوێ لێ بوو کۆمەڵێك کردبویان بەهەرا لە بەردەم دەرگای ژوورەکەیدا، ئەویش ئەچێتە دەر بۆیان دەفەرمووێت: "ألا إنما أنا بَشَر، وإنما يأتيني الخصم فلعل بعضكم أن يكون ألحن بحجته من بعض فأقضي له، فمن قضيت له بحق مسلم، فإنما هي قطعة من نار، فَلْيَحْمِلْهَا، أو ليذَرْها"، واتە: منیش ئادەمییەکم بەپێی ئەوە حوکم ئەکەم کە دەیبیستم لەوانەیە کەسێکیان زیاتر حوججە بەکاربهێنێ اوی لەویتریان، هەرکەسێکتان مافی مسوڵمانێکم بۆ بچڕی با بزانێ پشکۆ ئاگرێکم بۆ بچریوە یا هەڵی دەگرێ یان وازی بلێ دێنێ. هەردوو پیاوەکە دەست دەکەن بە گریان، هەریەکەیان وتوویەتی: مافەکەی من بۆ براکەم، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: لەبەرئەوەی ئەوە دەڵێن بچن بەشی بکەن ئاگاتان لە هەقی نێوانتان بێت، پاشان پشکی بۆ بخەن، پاشان گەردنی هەریەکەتان ئازاد بکەن.

ئیبنو مەردەویە دەگێڕێتەوە لە ڕێگای عەوفییەوە لە ئیبنو عەباسەوە وتوویەتی: چەند کەس لە ئەنصار لەگەڵ پێغەمبەردا (دروودی خوای لێ بێت)

چوونە غەزا، قەڵغانی یەکێکیان دزرا، خاوەنەکەی گومانی هەبوو لە پیاوێکی ئەنصاری، خاوەن درعەکە هات بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتی: توعمەی کوڕی ئوبەیرەق قەڵغانەکەمی دیزوە کە ئەوەی بینی قەڵغانەکەی هەڵدایە ماڵی کابرایەکی بێ تاوان بە چەند کەسێك لە عەشیرەتەکەی وت: من قەڵغانەکەم هەڵداوەتە ماڵی فڵان بچن لە ماڵەکەویدا ئەیدۆزنەوە ئەوانیش بەشەو چوون بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) وتیان: ئەی نێردراوی خوا هاوەڵەکەمان بێ تاوانە فڵانە کەس دزیویەتی ئێمە دەزانین هاوەڵەکەمان لەبەردەم خەڵکدا عوزری هێنایەوە وتی ئەگەر خوا بە تۆ بێ تاوانی نەکات تیادەچی، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هەڵسا بەری کرد و بە یەرچاوی خەڵك بەهانەی بۆ هێناوە، خوای گەورە ئەم ئایەتەی نارده خوارەوە: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾ وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ﴾.

پاشان خوای بەرز بەوانەی فەرموو کە هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) درۆیان کرد ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾. واتە ئەوانەی هاتوون بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) درۆیان کرد ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾، واتە ئەوانەی هاتوون بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) شتەکەیان شاردەوە بە درۆو لەسەر ناپاکەکان هەڵیان دایە.

پاشان دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ﴾، واتە ئەوانەی هاتن بۆ لای پێغەمبەر و بە درۆ راستییەکەیان شاردەوە، پاشان فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾﴾ واتە دزەکە و ئەوانەی کردویانەتە هەرا لەسەر دزەکە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق ئەو بەسەرهاتە بە درێژی دەگێڕێتەوە و دەڵێت: لە قەتادەی کوڕی نوعمانەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ماڵێك لە هۆزەکەی ئێمە پێیان دەوتن بەنی ئوبەیرق: بەناوی بیشر و بەشیر و موبەشیر، بەشیریان پیاوێکی مونافیق بوو، سیحری دەوت و جوێنی ئەدا بە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، پاشان دەیدایە پاڵ هەندێ لە عەرەب، پاشان

دەیوت: فڵان ئەوەو ئەوەی وتووە کاتێ هاوەڵەکانی پێغەمبەر ئەو هۆنراوەیان دەبیست وتیان: سوێند بە خوا لەو پیسە بەو لاوە کەسی تر ئەو هۆنراوەیە نەوتووە، وە وتیان: ئەوە ئیبنو ئیبەرق ئەو هۆنراوەیە وتووە. وتوویانە: ئەو ماڵە لەسەردەمی نەزانیدا هەژار و کەم دەست بوون، خەڵك لە مەدینە ئەو سەردەمە خواردنەکەیان خورما و نانی جۆ بوو، بەڵام دەسەڵاتدارەکان ئەگەر شتێکی باش لە شامەوە بهاتایە دەیانکڕی بۆ خۆیان، بەڵام هەژارەکان خواردنەکەیان خورماو نانی جۆ بوو. کاروانێك لە شامەوە هات ڕیفاعەی کوڕی زەیدی مامم بارێك خواردەمەنی کڕی خستیە ناو حەوزێکی بێ ئاووە کە هەیبوو، لەناو حەوزەکەدا چەك و قەڵغان و شمشێریشی دانابوو، لەژێر خانووەکەوە خەندەقیان لێ داو چوون حەوزەکەیان کون کرد و چەك خواردنەکەیان دزی، کاتێ ڕۆژ بووەوە ڕیفاعەی مامم هات وتی: ئەی کوڕی برام، ئەمشەو دەستدرێژییان کردووەتە سەرمان، خوادرن و چەکەکانیان بردووین. دەربارەی پرسیارمان کرد، پێیان وتین: بەنی ئوبەریق ئەمشەو ئاگریان دەوە ئێمە رامان وایە بۆ خواردەمەنییەکەی ئێوە بووە، بەنی ئوبەریق لەو کاتەدا کە پرسیارمان دەکرد ئەیانوت ئێمە رامان وایە لەبیدی کوڕی سەهل ئەو کارەی کردووە. کاتێ لەبید ئەو کارەی بیست شمشێرەکەی هەڵکێشاو وتی: من دزیم کردووە؟ سوێند بە خوا ئەم شمشێرە ئەخەمە ناوتان یان ئەو دزەم بۆ دەردەخەن، وتیان: لێمان دوور بکەوەرەوە، تۆ ئەو کەسە نیت دزیت کردبێ، بە ماڵەکاندا گەڕا بن و پرسیارمان کرد هەتا بە تەواوەتی بۆمان دەرکەوت ئەوان بوون دزییەکەیان کردووە. مامم پێی وتم: ئەی برازاکەم بۆ ناچیت بۆ لای پێغەمبەر و ئەوەی بۆ باس بکەیت. قەتادە وتوویەتی: هاتم بۆ لای پێغەمبەر و پێم وت: کۆمەڵێك کەس و کارمان هەیە خراپن، چوونە ماڵی ڕیفاعەی مامم، حەوزێکی هەبووە کونیان کردووە و هەرچی خواردەمەنی و چەکی تێدا بووە بردوویانە، با چەکەکانمان بدەنەوە، خواردەمەنییەکە بۆ خۆیان، ئێمە پێویستمان پێی نییە، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "پاشان لەوبارەیەوە فەرمان ئەدەم"، کاتێ بەنی ئوبەریق ئەوەیان بیست چوون بۆ لای پیاوێك لە خۆیان کە ناوی ئەسیری کوڕی عەمر بوو، لەو بارەیەوە

قسەیان بۆ کرد، کۆمەڵێك لە خاوەن ماڵەکان کۆبونەوە لەوباریەوە وتیان ئەی نێردراوی خوا قەتادەی کوڕی نوعمان و مامی دێن بۆ ئەوە ماڵە کە ئەهلی چاکە و موسڵمانن، ئەڵێن دزییان کردووە، بەبێ بەڵگەو چەسپاندن، قەتادە وتوویەتی: چووم بۆ لای پێغەمبەر قسەم بۆ کرد، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: چویت ماڵێك کە ئەهلی چاکەو ئیسلامەتین، تاوانبارت کردوون بەدزی بەبێ بەڵگە و چەسپاندن، وتوویەتی: گەڕامەوە حەزم دەکرد هەندێ لە ماڵەکەم بدانایە، بەڵام لای پێغەمبەر پێغەمبەر ئەوەم نەوتایە، ریفاعەی مامم هات وتی: چیت کرد؟ منیش پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) چی پێ وتبووم بۆم گێڕایەوە، وتی: خوا یارمەتیدەرە، ئەوەندەی نەخایاند ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە: ﴿إِنَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ لِتَحْكُمَ بَيْنَ ٱلنَّاسِ بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُ ۚ وَلَا تَكُن لِّلْخَآئِنِينَ خَصِيمًا ﴿١٠٥﴾﴾. واتە بەنی ئوبەیرق ﴿وَٱسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ ۖ﴾ لەسەر ئەوەی وتووتە بە قەتادە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٦﴾ وَلَا تُجَٰدِلْ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخْتَانُونَ أَنفُسَهُمْ ۚ﴾ هەتا ﴿رَّحِيمًا﴾ واتە ئەگەر داوای لێبوردن بکەن لە خوا خوا لێیان دەبورێ ﴿وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ﴾ هەتا ﴿إِثْمًا مُّبِينًا﴾ [النساء: ١١١ ـ ١١٤] کاتێ قورئان هاتە خوارەوە چەکەکانیان هێناوە بۆ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دایەوە بە ریفاعە.

قەتادە وتوویەتی: کاتێ هاتم بۆ لای مامم بە چەکەکانەوە کە نابینا بوو هەر لە سەردەمی نەزانییەوە کاتێ چەکەکانم بۆ هێناوە وتی: ئەی برازاکەم ئەو چەکانە یا لە ڕێی خوادا بن بەوەدا زانیم کە بەڕاستی موسڵمانە. کاتێ قورئان هاتە خوارەوە بەشیر هەڵات چوو بۆ لای هاوبەشدانەرەکان چووە ماڵی سلافەی کچی سەعدی کوڕی سومعەیە خوای گەورە ئەم ئایەتەی ناردە خـــوارەوە: ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعْدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلْهُدَىٰ وَيَتَّبِعْ غَيْرَ سَبِيلِ ٱلْمُؤْمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ ۖ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾﴾ [النساء: ١١٥ ـ ١١٦]، کاتێ چووە ماڵی سولافە کچی سەعد، حەسانی کوڕی سابیت بە چەند دێڕە هۆنراوەیەك هەجوی کرد، سولافە کەلوپەلەکەی کۆکردەوە و خستیە سەر سەری و فڕێی دایە ئەبتەع، پاشان وتی: هۆنراوەی

حەسانم پێشکەش دەکەیت تۆ بە خێرەوە نەهاتووی بۆ لای من' تیرمزی وتوویەتی: (هذا حديث غريب).

خوای گەورە کە دەفەرمووێت: ﴿يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ﴾ ئەوە ئنكاری کردنە دەربارەی مونافیقەکان کە کارە ناشیرینەکانیان لە خەڵك دەشارنەوە بۆ ئەوە ئینکاریان لێ نەکەن، بەڵام ئاشکرای دەکەن لەبەردەم خوادا چونکە خوا ئاگاداری نهێنییەکانیانە و ئەزانێ چی لە دەروونیاندایە، لەبەرئەوە دەفەرمووێت: ﴿وَهُوَ مَعَهُمْ إِذْ يُبَيِّتُونَ مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا﴾ ئەمەش هەڕەشیە لێیان، پاشان خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا﴾ الآية، واتە با وای دابنێین ئەوانە لە دونیادا سەرکەوتوو دەبن بەوانەی دەری دەخەن لای ئەو دادوەرانیە حوکم بە ڕواڵەت دەدەن هەرچەندە ئەوا خواپەرستییە بۆ ئەوان، بەڵام ئەی ڕۆژی قیامەت چی دەکەن لەبەردەم خوادا کە ئاگاداری نهێنی و شاراوەکانە؟ وە کە لە ڕۆژی قیامەت گوێ بە دەعواکەیان دەدات؟ واتە کەس ئەو ڕۆژە نابێتە بریکاریان لەبەرئەوەی خوا دەفەرمووێت: ﴿أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا﴾.

﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا
رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾ وَمَن يَكْسِبْ إِثْمًا فَإِنَّمَا يَكْسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا
حَكِيمًا ﴿١١١﴾ وَمَن يَكْسِبْ خَطِيٓـَٔةً أَوْ إِثْمًا ثُمَّ يَرْمِ بِهِۦ بَرِيٓـًٔا فَقَدِ ٱحْتَمَلَ
بُهْتَٰنًا وَإِثْمًا مُّبِينًا ﴿١١٢﴾ وَلَوْلَا فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ وَرَحْمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٌ
مِّنْهُمْ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ ۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَىْءٍ ۚ
وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ ۚ
وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ﴿١١٣﴾﴾

واتە: هەر کەسێکیش کارێکی نالەبەر بکات یان غەدرێکی لە خۆی بکات، پاشان لەخوا بخوازێ کە بیبەخشێ، دەبینێ کە خوا لێبوردە و دلۆڤانە، هەر کەس گوناحێك بکات، گوناهەکەی زیان بە خۆی دەگەیەنێ و

خودا زانای لە کارزانە، هەرکێ بە هەڵە یان بە قەست تاوانێکی لێ رووبدا و بیخاتە سەر بێگوناهێك، ئاشکرایە باری تاوانی بوختانی لەسەر شانە، ئەگەر چاکە و بەزەیی خودا دەهانای تۆ نەهاتایە هێندێ لەوان فۆرمی خۆیان خۆش کردبوو رێت لێ ون کەن، هەر خۆیانن کە رێگە لە خۆ گوم دەکەن ئەو ناتوانن هیچ زیانێك لە تۆ بدەن خوا کتێبی بۆ ناردووی و لەکا زانێتی فێر کردوی، زۆر شتی وای فێری تۆ کرد کە تۆ پێشوونەت دەزانین چاکەی زۆر هێژا و گرینگت لەخواوە لەگەڵ کراوە.

خوای گەورە دەربارەی کەرەم و بەخشندەیی هەواڵ دەدات کە هەر کەس تۆبە بکات لێی دەبورێ تاوانەکەشی هەرچۆنێك بێت خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾﴾. عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە وتوویەتی: ئیبنو عەباس دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: خوای گەورە هەواڵ بە بەندەکانی دەدات کە لێبوردە و خاوەن حیلمە و خاوەن کەرەمەوە رەحمەتی فراوانە لێبوردەیە هەر کەس تاوانێك بکات تاوانەکە بچووك بێت یان گەورە بێت ﴿ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾، ئەگەر تاوانەکانی لە ئاسمانەکان و زەوی گەورەتر بێت هەر لێی دەبوري.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئەبی وائیلەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: عەبدوڵلا وتوویەتی: بەنی ئیسرائیل کاتێ یەکێکیان تاوانێکی دەکرد کە ڕۆژ دەبووەوە کەفارەتی ئەو تاوانە لەسەر دەرگای ماڵەکە دەنووسرا، ئەگەر شوێنێك لە جلەکانی میزی بەرکەوتایە ئەبوایە بە موقەست بیبڕیایە. پیاوێك وتی: خوا خێری بەخشیوە بە بەنی ئیسرائیل، عەبدوڵلا (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: ئەوەی خودا داوێتی بە ئێوە چاکترە لەوەی داوێتی بەوان، ئاوی بۆ کردوون بە خاوێنکەرەوە، وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَٰحِشَةً أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ﴾ [آل عمران: ١٣٥]، وە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا أَوْ يَظْلِمْ نَفْسَهُۥ ثُمَّ يَسْتَغْفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١١٠﴾﴾.

دووبارە وتوویەتی: یەعقوب بۆی گێڕاینەوە لە هوشەیمەوە لە ئیبنو عەونەوە لە حەبیبی کوڕی ئەبی سابیتەوە کە وتوویەتی: ژنێك هات بۆ لای

عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل دەربارەی ژنێك لێی پرسی کە داوێن پیسی کردووە و دووگیان بووە و کاتێ منداڵەکەی بووە منداڵەکەی کوشتووە. چی بۆ هەیە. عەبدوڵڵای کوڕی موغەفەل وتوویەتی: غەیری ئاگر هیچی تری بۆ نییە. ژنەکە بە گریانەوە ڕۆیشت، ئەویش بانگی کردەوە و پێی وت: من ڕام وایە کاری یەکێ لەم کارانەی بۆ ئەبرێ ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١١٠﴾﴾ ئەڵێ ژنەکە چاوەکانی سڕی و ڕۆیشت.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبوبەکرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ما من مسلم يذنب ثم يتوضأ ثم يصلي ركعتين ثم يستغفر الله لذلك الذنب الا غفر له" واتە: هەر مسوڵمانێك تاوانێك بکات هەڵسێت دەست نوێژێك بگرێت و دوو ڕکات نوێژ بکات، پاشان داوا لە خوا بکات لەو تاوانەی خۆش بێت خوا هەر لێی خۆش دەبێت. پاشان ئەو دوو ئایەتەی خوێندەوە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ﴾ وە ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ [آل عمران: ١٣٥].

ئیبنو مەردەویە وتوویەتی: لە ئەبو دەرداوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئێمە کە بە دەوری پێغەمبەردا دادەنیشتین ئەگەر پێویستی چوونە سەر ئاوی هەبوایە هەڵدەسا و سۆڵەکانی لە شوێنی خۆیدا بەجێدەهێشت یا هەر شتێکی تر بوایە، ڕۆژێك هەڵسا و سۆڵەکانی بەجێهێشت، ئەبو دەردا وتوویەتی: گەڕایەوە فەرمووی: "لە خواوە نێرراوێك هات بۆ لام پێی وتم: ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ سُوٓءًا أَوۡ يَظۡلِمۡ نَفۡسَهُۥ ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴿١١٠﴾﴾ ویستم مژدە بدەم بە هاوەڵەکانم.

ئەبو دەردا وتوویەتی: ئەو ئایەتەی پێش ئەوە زۆر گران بوو بەسەر خەڵکەوە کە دەفەرموێت: ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾ [النساء: ١٢٣] وتم: ئەی نێرراوی خوا ئەگەر ئەو کەسە زینا بکات یان دزی، پاشان داوای لێبوردن بکات لەخوا، خوا لێی ئەبورێ؟ فەرمووی: "بەڵێ"، هەتا سێ جار ئەوەم وت، هەر فەرمووی: بەڵێ، ئەگەر ziناش بکات یان دزی، پاشان داوای لێبوردن لە خوا بکات خوا لێی دەبورێ پێی خۆش بێت یان پێی

ناخۆش بێت ئەبی دەردا. (هذا حديث غريب جدا من هذا الوجه بهذا السياق وفي اسناده ضعف).

کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ﴾ وەك ئایەتی: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٞ وِزۡرَ أُخۡرَىٰۚ﴾ [فاطر: ١٨] واتە کەس لە سەر کەس ناگیرێ بەڵکو هەر کەس چی بکات کە بۆی هەڵناگرێ لەبەرئەوە خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا﴾ واتە بە زانستی خۆی و حیکمەتی خۆی و بە دادپەروەری خۆی و بە بەزەیی خۆی، ئەوەبووە پاشان دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً أَوۡ إِثۡمٗا ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا﴾ واتە وەك بەنی ئوبەریق بە کارە خراپەکەیان ئەو پیاوە چاکەیان تاوانبار کرد کە ناوی لەبیدی کوڕی سەهل بوو کە ئەو بەری بوو ئەوان ستەمکار و ناپاك بوون.

﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ أَن يُضِلُّوكَ وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡۖ وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيۡءٖۚ﴾ واتە ئەسیری کوڕی عەروە و هاوەڵەکانی مەبەستی ئەوەیە بەوەی بە چاکی باسی بەنی ئوبەیریقیان کرد و لۆمەی قەتادەی کوڕی نوعمانیان کرد.

﴿لَّا خَيۡرَ فِي كَثِيرٖ مِّن نَّجۡوَىٰهُمۡ إِلَّا مَنۡ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوۡ مَعۡرُوفٍ أَوۡ إِصۡلَٰحِۭ بَيۡنَ ٱلنَّاسِۚ وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمٗا ﴿١١٤﴾ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾﴾

واتە: زۆربەی سرتە و چپەکان بەهرەی نییە جا مەگین باسی خیرات و کاری ڕەوا و پێك هێنانەوەی مەردم بێ هەر کەس مەحزی ڕەزای خودا چپە بکات لە دواڕۆژدا پاداشتی گەورەی دەدەنێ، هەرکەسێکی لە پاش ڕاستی بۆ دەرکەوتن و شارەزا بووبێ لەم دینە پێچەوانەی پێغەمبەر بجوڵێتەوە و ڕچەیەك بگرێتە بەرێکەر بێ باوەڕداران نییە، ئێمە بەو ڕێیەی دادەبەین کە خۆی هەڵیبژاردووە، تا دەیخەینە جەهەنم و دواڕۆژی زۆر ناخۆش دەبێ.

خوای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ﴾ واتە قسەی خەڵك ﴿إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ﴾ واتە جگە لە سرتە و چرپە هەر کەس ئەوە بڵێ، وەك لەو حەدیسەدایە ئیبنو مەردەویە ریوایەتی کردووە کە دەڵێ: سوفیانی سەوری بە سەعیدی کوڕی حەسانی مەخزومی وت: ئەم فەرموودەیەم بۆ بگێڕەرەوە کە لە ئوم ساڵحەوە دەیگێڕێتەوە ئەویش وتی: ئوم ساڵح لە سەفیەی کچی شەیبەوە لە ئوم حەبیبەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "كلام ابن آدم كله عليه لا إلٰه إلّا ذكر الله عزوجل أو أمر بمعروف ونهى عن المنكر" واتە: قسەی ئادەمیزاد هەمووی لەسەری دەکەوێ نەك سوودی هەبێ بۆی جگە لە یادکردنی خوا یان فەرمان کردن بە چاکە یان قەدەغەکردنی خراپە. سوفیان وتی: ئایا ئەوەت لە کتێبەکەی خوادا نەبیستووە کە دەفەرمووێت: ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ﴾ ئەوە هەر ئەوەیە. ئەی نەتبیستووە خوا دەفەرمووێت: ﴿يَوْمَ يَقُومُ الرُّوحُ وَالْمَلَائِكَةُ صَفًّا لَّا يَتَكَلَّمُونَ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ الرَّحْمَٰنُ وَقَالَ صَوَابًا﴾ [النبأ: ٣٨] ئەوەش هەروەك ئەوە وایە، ئەی نەتبیستووە کە خوا لە کتێبەکەیدا دەفەرمووێت: ﴿وَالْعَصْرِ ﴿١﴾ إِنَّ الْإِنسَانَ لَفِي خُسْرٍ ﴿٢﴾﴾... [العصر: ١ ـ ٢] ئەوەش هەر ئەوەیە.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: کە حومەیدی کوڕی عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف وتوویەتی: ئوم کەلسومی کچی عوقبە بۆی گێڕامەوە کە خۆی گوێی لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووە فەرموویەتی: "ليس الكذاب الذي يصلح بين الناس فينمى خيراً أو يقول خيراً" واتە: ئەو کەسەی نێوان خەڵك ڕێك دەخات هەرچی بڵێت درۆزن نابن.

وە وتوویەتی: گوێبیستی نەبووم ڕێی بدایە خەڵك درۆ بکەن لە سێ شتدا نەبێت: لە جەنگ و چاك کردنی نێوان حەڵك و قسەی پیاو بۆ ژنەکەی و قسەی ژن بۆ مێردەکەی، ئەڵێ: ئوم کەلسومی کچی عوقبە لەو کۆچکەرانە بوو کە بەیعەتیان دا بە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت).

هەر ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی دەرداوە هاتووە وتوویەتی:

پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (ألا أخبركم بأفضل من درجة الصيام والصلاة والصدقة ؟) قالوا: بلى يا رسول الله. قال: (إصلاحُ ذات البَيْن). پاشان فەرمووی: وفساد ذات البين هي الحالِقَةُ) واتە: پێتان رابگەیەنم چی چاکترە لە پلەدا لە ڕۆژوو نوێژ و صەدەقە وتیان: بەڵێ پێمان بڵێ، فەرمووی: "چاك كردنی نێوان خەڵك" پاشان فەرمووی: "نێوان خەڵك تێك دان سەرتاسەرە" (قال الترمذي حسن صحيح).

فەرموودەڕەوان ئەبو بەکری بەزار وتوویەتی: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بە ئەبوئەیوبی وت: "الا أدلك على التجاره؟" واتە ڕێنماییت نەکەم بۆ بازرگانییەك؟ وتی: بەڵێ ڕێنماییم بکە ئەی نێردراوی خوا، فەرمووی: هەوڵی چاك كردنی نێوان خەڵك بدە و لە یەکیان نزیك بکەرەوە کاتێ لەیەك دووركەوتنەوە.

لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ﴾ واتە خاوێن کار بکات لەو بارەیەوە بە ئومێدی پاداشتەکەی بێت لە لایەن خواوە ﴿فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمًا﴾ واتە پاداشتێکی زۆر و فراوانی پێ دەبەخشرێت.

﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ﴾ واتە هەر کەس ڕێگایەکی گرت وەك ئەو ڕێگایە نەبوو کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) پێیدا هاتووە ئەوە لە لایەکە و شەرعیش لە لایەك. ئەوەش ئەگەر بە قەستی بوو کاتێ حەقی بۆ ڕوون بووەوە ﴿وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئەمەش پەیوەستە بە سیفەتی یەکەم. بەڵکو ئەبێ چوویێتە سەر ئەو ڕێگایەی پێچەوانەی دەقی یاسادانەرە و ئەبێ کاتێ نەتەوەی موحەممەدی لەسەری کۆ بن و بەڕاستی بزانێ ئەوان لەسەری کۆن، چونکە ئەو ڕێگایە بێتاوانییان بۆ زامن دەکات کاتێ لەسەر هەڵە کۆدەبنەوە لەبەر ڕێز بۆیان و لەبەر بە گەورەدانانی پێغەمبەرەکەیان لەوبارەیەوە فەرموودەی ڕاست و زۆر هاتوون.

وە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا﴾ واتە کاتێ ئەو ڕێگایە دەگرێت سزای دەدەین لەسەر ئەوە بەوەی لە سنگیا بە چاکی دادەنێن و دەیڕازێننەوە کە ببێتە ئیستیدراج بۆی وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿فَذَرۡنِي وَمَن يُكَذِّبُ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِۖ سَنَسۡتَدۡرِجُهُم مِّنۡ حَيۡثُ لَا يَعۡلَمُونَ﴾

[القلم: ٤٤]، وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا زَاغُوٓاْ أَزَاغَ ٱللَّهُ قُلُوبَهُمۡۚ﴾ [الصف: ٥] وە فەرمایشی: ﴿وَنَذَرُهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾ [الأنعام: ١١٠] خوای گەورە چارەنووسی ئەوانەی لە ڕۆژی دواییدا بۆ ئاگر داناوە، چونکە هەر کەس لە ڕێی ڕاست دەرچوو ڕێگایەکی تری نییە جگە لە ڕێگای چوون بۆ ناو ئاگر لە ڕۆژی دواییدا وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ٱحۡشُرُواْ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ وَأَزۡوَٰجَهُمۡ﴾ [الصافات: ٢٢] وە هەر فەرموویەتی: ﴿وَرَءَا ٱلۡمُجۡرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓاْ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمۡ يَجِدُواْ عَنۡهَا مَصۡرِفٗا﴾ [الكهف: ٥٣]..

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُۚ وَمَن
يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾ إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ
إِنَٰثٗا وَإِن يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنٗا مَّرِيدٗا ﴿١١٧﴾ لَّعَنَهُ ٱللَّهُۘ وَقَالَ
لَأَتَّخِذَنَّ مِنۡ عِبَادِكَ نَصِيبٗا مَّفۡرُوضٗا ﴿١١٨﴾ وَلَأُضِلَّنَّهُمۡ وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ
وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ
وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا
مُّبِينٗا ﴿١١٩﴾ يَعِدُهُمۡ وَيُمَنِّيهِمۡۖ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿١٢٠﴾
أُوْلَٰٓئِكَ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا ﴿١٢١﴾ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ
وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ
فِيهَآ أَبَدٗاۖ وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا ﴿١٢٢﴾﴾

واتە: خودا لەوانە نابورێ کە شەریکی بۆ بناسن، لەوە بەولاوە لە هەرکەسێ بۆ خۆی حەز بکا عەفوی دەکات، وە هەرکەسێك شەریك بۆ خودا دابنێ لەڕادەبەدەر گومڕایە، ئەوانە لە جیاتی خودا هانا دەبەنەبەر بەرد و کرەکی وا کە زۆربەیان ناوی مێینەیان هەیە و دیارە هاوار دەبەنە بە ئەو شەیتانەی کە سەر بزێوی کردووە و دەکراوە، خوا نەفرەتی کردووە و ئەویش لە وەڵامدا وتوویەتی: شەرتە لە بەندەکانی تۆ بەشێك بۆ خۆم گل بدەمەوە، دیاریشە لە ڕاستە ڕێ یان دەردەخەم و دڵیان پڕ دەکەم لە ئاوات و بۆخۆم فەرمانیان پێدەدەم گوێچکەی وڵساتیان دادەڕن و فەرمانیشیان بۆ دەردەخەم

نەرح و بچمی ئەو شتانەی خوا کردویە، تێکی بدەن و بیگۆڕن، جال هەرکەسێ خودای نەوێ و لەگەڵ شەیتان ببێتە دۆست دیارە چەند زیانمەند دەبێت.

بەڵێ بەڵێنیان پێ دەدات و دەیانخاتە سەر ئاوەرز، ئەو بەڵێنی کە شەیتان لەوانی دەدات فریو نەبێ چیتر نییە، جێی ئەوانە جەهەنمە و دەرەتانی تریان نییە، ئەوانەی کە بە بڕوان و ئاکار چاکن دەیانبەینە ناو باغێك جۆباریان بە بەردا دەڕوا و هەتا سەر هەر تیا دەبن دیارە وادەی خوا هەقە و کێ لە خودا راستگۆ ترە؟

لەپێشەوە قسە لەسەر ئەم ئایەتە پیرۆزە کراوە کە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾... الآیـة [٤٨]، لـەو فەرموودانەمان باسکرد کە پەیوەندی پێوەی هەیە لەسەرەتای ئەم سورەتەدا، تیرمزی دەگێڕێتەوە لە عەلیەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە وتوویەتی: لە قورئاندا ئایەتێك نییە ئەوەندەی ئەو ئایەتەم خۆش بوێ کە دەفەرمووێ: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ﴾ الآية، پاشان ترمیزی وتوویەتی: (هذا حسن غريب).

کـە دەفـەرمـووێـت: ﴿وَمَن يُشۡرِكۡ بِٱللَّهِ فَقَدۡ ضَلَّ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا﴾ واتـە کـە ڕێگایەکی ناهەقی گرتووە و ڕێی ڕاستی گووم گووم کردووەو لە ڕاستی دوورکەوتۆتەوە و خۆی کوشتووە و لە دونیاو ئاخیرەتدا خۆی لە دەست داوە و بەختەوەری دونیا و ئاخیرەتی لەدەست چووە.

کە دەفەرمووێت: ﴿إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا﴾ ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە هاتووە وتوویەتی: لەگەڵ هەر بتێکدا جنۆکەییەك هەبووە.

لە عائیشـەوە دەگێـڕنـەوە کـە دەربـارەی: ﴿إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا﴾ وتووەیتی: ئەوە بتە.

جوبەیر لە ززەحاکەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ئایەتەکە وتوویەتی: هاوبەشدانەرەکان ئەیانوت فریشتەکان کچی خوان، بۆیە ئەیانپەرستین کە لە خوامان نزیك بکەنەوە وتوویەتی: ئەوانەیان دەکردە پەروەردگاری خۆیان لەسەر شێوەی جاریە بەوێنەیان دەکێشان و ئەیانڕازاندنەوە ئەیانوت: ئەمانە

لەو کچەکانی خوا دەچن کە دەیانپەرستین. ئەو ڕاڤەکردنەش لە فەرمایشی خوای بەرز دەچێت کە دەفەرمووێت: ﴿أَفَرَءَيۡتُمُ ٱللَّٰتَ وَٱلۡعُزَّىٰ﴾ [النجم: ١٩] وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ ٱلَّذِينَ هُمۡ عِبَٰدُ ٱلرَّحۡمَٰنِ إِنَٰثًاۚ﴾ [الزخرف: ١٩] وە فەرموویەتی: ﴿وَجَعَلُواْ بَيۡنَهُۥ وَبَيۡنَ ٱلۡجِنَّةِ نَسَبًاۚ﴾ [الصافات: ١٥٨] واتە مردوو، موبارەك وتویەتی: واتە ئیبنو فەزالە، لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە کە ﴿إِن يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا﴾ وتوویەتی: ﴿إِنَٰثًا﴾ی هەموو شتێك مردووە و گیانی تێدا نییە، یا تەختە وشکێکە یا بەردێکە.

ئیبنو ئەبی حاتەم و ئیبنو جەریریش ئەوەیان گێڕاوەتەوە (وهو حدیث غریب).

﴿وَإِن يَدۡعُونَ إِلَّا شَيۡطَٰنًا مَّرِيدًا﴾ واتە شەیتانە کە فەرمانیان بەوە پێ دەکات و بۆیان دەڕازێنێتەوە، ئەوان ئیبلیسیان دەپەرست لەو کاتەدا وەك خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿أَلَمۡ أَعۡهَدۡ إِلَيۡكُمۡ يَٰبَنِيٓ ءَادَمَ أَن لَّا تَعۡبُدُواْ ٱلشَّيۡطَٰنَۖ﴾ [یس: ٦٠] خوای گەورە هەواڵ دەدات کە ڕۆژی سەلا فریشتەکان بە هاویەش دانەرەکان دەڵێن کە لە دنیادا دەیانپەرستن ﴿بَلۡ كَانُواْ يَعۡبُدُونَ ٱلۡجِنَّۖ أَكۡثَرُهُم بِهِم مُّؤۡمِنُونَ﴾ [سبأ: ٤١].

کە دەفەرمووێت: ﴿لَّعَنَهُ ٱللَّهُۘ﴾ واتە دەری کردووە و دووری خستووەتەوە لە ڕەحمەتی خۆی و لە نزیکی خۆیەوە نەیهێشتووە و وتووەیتی: ﴿لَأَتَّخِذَنَّ مِنۡ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفۡرُوضًا﴾ واتە دیاری کرا و چەندێتییەکی مەعلوم.

موقاتیل وتوویەتی: لەهەر هەزار کەس نۆسەد و نەوەد و نۆ بۆ ئاگر و یەکێك بۆ بەهەشت.

﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمۡ﴾ لەهەق لایان دەدەم، ﴿وَلَأُمَنِّيَنَّهُمۡ﴾ واتە تۆبەکردنیان بۆ ئەڕازێنمەوە و فەرمانیان پێ دەکەم کە خۆیان دوابخەن لە تۆبەکردن و غەڕایان دەکەم ﴿وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلۡأَنۡعَٰمِ﴾ قەتادە و سوودی و غەیری ئەوانیش وتوویانە: واتە گوێیان هەڵدەدڕن و دەیکەن بە نیشانە بۆ بوحەیرە و سائیبەو واسیلە ﴿وَلَأٓمُرَنَّهُمۡ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلۡقَ ٱللَّهِۚ﴾ ئیبنو عەباس وتوویەتی: مەبەست لەوە خەساندنی ئاژەڵەکانە.

حەسەنی کوڕی ئەبی حەسەنی بەسری وتوویەتی: نیشانەکردنیان بە داخ کردن، لە سازەواری موسلیمدا هاتووە کە داخ کردنی سەرچاو قەدەغەکراوە و لە زاراوەیەکدا هاتووە: کە لەعنەتی خوا لەو کەسە بێت کاری وەها دەکات.

لە سازەواردا هاتووە لە ئیبنو مەسعودەوە وتوویەتی: نەفرینی خوا لەو کەسانە بێت خاڵیان بۆ دەکوترێ و لەو کەسەی خاڵ دەکوتێ و ئەوانەی دەموچاویان هەڵدەگرن و ئەوانەش دەموچاوی خەڵك هەڵدەگرن و ئەوانەی دانیان شاش دەکەن بۆ جوانی و شێوەی دروستکراوەکانی خوا دەگۆڕن، پاشان وتوویەتی: ئەی من نەفرین لەو کەسە نەکەم کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) نەفرینی لێ کردووە وە لە کتێبەکەی خوادا نەفرینیشیان لێ کراوە، واتە کە دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ [الحشر: ٧].

ئیبنو عەباس و عەکریمە و ئیبراهیمی نەخەعی و حەسەن و قەتادە و حەکەم و سوودی و زەحاك و عەتای خوراسانی دەربارەی ﴿وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ﴾ وتوویانە: واتە ئاینەکەی خوای بەرز و شکۆمەند، ئەوەش وەك فەرمایشی: ﴿فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ﴾ [الروم: ٣٠] لەسەر وتەی ئەوەی ئەوەی کردووەتە فەرمان واتاکەی ئەوەیە کە سروشتی خوا مەگۆڕن بڵێن خەڵك لەسەر سورشتی خۆی بێت.

وەك چەسپاوە لەهەردوو وسەحیحدا لە ئەبی هورەیەرەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "كل مولود يولد على الفطرة فأبواه يهودانه او ينصرانه أو يمجسانه، كما تولد البهيمة بهيمة جمعا و هل تجدون بها من جدعاء" واتە: هەرچی منداڵێك لە دایك ئەبێ لەسەر سروشتی خۆیەتی کە ئیسلامەتییە، بەڵام دایك و باوکی یان ئەیکەن بە جولەکە یان بە گاور یان بە ئاگرپەرست، وەك چۆن ئاژەڵ بەچکەی تەواوی دەبێ ئایا گوێ بڕاویان تێدا دەبینن.

لە سازەواری موسلیمدا هاتووە لە عەیازی کوڕی حیمارەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "قال الله عزوجل اني خلقت

عبادي حنفا و فجاءتهم الشياطين فاجتالهم عن دينهم وحرمت عليهم ما احللت لهم» واته: خوای بەرز و شکۆمەند دەفەرموویت: من بەندەکانم دروست کردووە لەشێوەیەك خوا بپەرستن، بەڵام شەیتانەکان دێن بۆ لایان لەسەر ئاینەکەیانیان لایان دەبەن و ئەوانەیان لەسەر حەرام دەکەن کە من لەسەرم حەڵاڵ کردوون.

پاشان خوای بەرز دەفەرموویت: ﴿وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا مُّبِينٗا﴾ واتە بێ سۆ دونیا و ئاخیرەت لە دەست دەدەن ئەو لەدەستچوونەش گێرسانەوەی بۆ نییە و گەیشتن بە لەدەستچوونەکەی نییە.

وە کە دەفەرموویت: ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا﴾ وەك خوای بەرز هەواڵ دەدات دەربارەی ئیبلیس لە ڕۆژی قیامەتدا: ﴿وَقَالَ ٱلشَّيۡطَٰنُ لَمَّا قُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ إِنَّ ٱللَّهَ وَعَدَكُمۡ وَعۡدَ ٱلۡحَقِّ وَوَعَدتُّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُكُمۡۖ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيۡكُم مِّن سُلۡطَٰنٍ﴾ إلى قوله: ﴿إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ لَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ﴾ [إبراهيم: ٢٢].

کە دەفەرموویت: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانە نەوەی شەیتان پەیمانی پێدابوون بە چاکیان دەزانی ﴿مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ﴾ ڕۆژی قیامەت دوا شوێنیان جەهەنمە ﴿وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا﴾ نە رزگاریان دەبێت لێی و نە کەس هەیە رزگاریان بکات.

پاشان خوای بەرز بارودۆخی بەختەوەران و لەخواترسان و شوێن و بارودۆخیان باس دەکات دەفەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ واتە: دڵیان باوەڕیان هێناوە و ئەندامەکانیان ئەو کارانەیان بەجێ هێناوە کە خێرە و فەرمانیان بە کردنی پێ کراوە و وازیان لەو خراپانە هێناوە کە لێیان قەدەغە کراوە ﴿سَنُدۡخِلُهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ﴾ واتە بە ئارەزووی خۆیان سەرفی دەکەن و بۆ کوێیان بوێ دەچن ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدٗاۖ﴾ واتە بەبێ بڕانەوە و لابردن ﴿وَعۡدَ ٱللَّهِ حَقّٗاۚ﴾ واتە ئەوە پەیمانێکە لە خواوە و پەیمانی خوا ڕاستییەکەی دیارە کە ئەبێ دروست بێت، پاشان خوای بەرز دەفەرموویت: ﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ قِيلٗا﴾ واتە کەس نییە لە خوا قسە ڕاست تر بێت. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) لە وتارەکەیدا فەرموویەتی:

"إن اصدق الحديث كلام الله وخير الهدى هدى محمد (دروودی خوای لێ بێت) وشر الامور محدثاتها وكل محدثة بدعه وكل بدعه ضلاله وكل ضلاله في النار" واتە: بەراستی راست ترین قسە قسەی خوایە و چاکترین رێنمایی رێنمایی موحەممەدە (دروودی خوای لێ بێت) و خراپترین کار تازە داهێنراوەکانە هەموو تازە داهێنراوێك بیدعەیە و هەموو بیدعەیەك گومڕاییە و هەموو گومڕاییەك خاوەنی لە ئاگردایە.

﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٢٣﴾ وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾ وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا ۗ وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾ وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ مُّحِيطًا ﴿١٢٦﴾﴾

واتە: نە بە ئاواتی ئێوە و نە بە هەوا و ئارەزووی ئەو کەسانەیە بە ئەهلی کتێب حسێبن، هەر مرۆڤێك کارێکی نالەبار بکات بەو کارەی خۆی سزا دەدرێت و جیا لەخوا هیچ کەس بۆ پەیدا نابێ دۆستی بێ و دە هاوار بێ، هەر مرۆڤێك نێر بێ یان مێ هەر هێندە خاوەن باوەڕ و ئاکار چاك بێ دەچنە بەهەشتەوە و بە ئەندازەی تلّیشی وردیلەی ناوکە خورمایەش ناهەقیان لێ ناکرێ، چ دیندارێك دینی لەو کەسە چاکترە کە خۆی بە خوا سپاردووە و چاکە کارە و کەوتۆتە شوێنی ئایینی ئیبراهیم لە ناڕەوا لادەر و بەرەو هەق هاتووە؟ ئەو ئیبراهیمی کە خودا ببوە دۆستی، هەر شتێك لە ئاسمانان و زەمیندایە هی خودایە و هەر خودایە لە هەموو شت ئاگادارە.

قەتادە وتوویەتی: بۆمان باسکراوە کە موسڵمانەکان و ئەهلی کتێب شانازییان دەکرد بەسەریەکدا. ئەهلی کتێب دەیانوت: پێغەمبەرەکەی ئێمە پێش پێغەمبەرەکەی ئێوە نێردراوە و کتێبەکەمان پێش کتێبەکەی ئێوە هاتووەتە خوارەوە، لەبەرئەوە ئێمە لە پێش ترین لای خوا لە ئێوە. وە موسڵمانەکان

دەیانوت: ئێمە لە پێشترین لە ئێوە بۆ خوا، چونکە پێغەمبەرەکەمان کۆتا پێغەمبەرە و کتێبەکەمان کتێبەکانی پێش خۆی سڕیوەتەوە، ئیتلا خوای بەرزی ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾، ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ خـوای گـەورە حـوجـەی موسڵمانەکان سەردەخات بەسەر ئەوانەدا دژیان وەستاون لە ئاینەکانی تر خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾.

خوای گەورە ئارەزووی داوە بۆ هەڵبژاردنی ئاینەکانی کە دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ تافەرمایشتی: ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا﴾. موجاهید وتوویەتی: عەرەب دەیانوت: ئێمە نەزیندوو دەکرێینەوە نە سزاش دەدرێین، جولەکەو گاورەکانیش دەیانوت: ﴿لَن يَدْخُلَ ٱلْجَنَّةَ إِلَّا مَن كَانَ هُودًا أَوْ نَصَٰرَىٰ﴾ [البقرة: ١١١]، هەر کەس جولەکە نەبێ یا گـاور نـەبێـت نـاچێـتە بـەهـەشـتـەوە و ئـەیـانـوت: ﴿لَن تَمَسَّنَا ٱلنَّارُ إِلَّآ أَيَّامًا مَّعْدُودَٰتٍ﴾ [آل عمران: ٢٤]. واتای ئەم ئایەتە ئەوەیە کە یان بە ئاوات خواستن نابێت، بەڵام بەپێی ئەوەیە کە لەدڵدا جێگیربووە و کردەوەتان بەراستی دە گێڕن و ئەوە نییە هەر کەس شتێکی بە ئاوات خواستن ئەو شتەی بۆ ببێت بە داوای پەتی، وە بەوە نییە هەر کەس بڵێ لەسەر هەقم قسەکەی ببیسترێ بەو دەعوا پەتییە هەتا لە خواوە بورهانی بۆ نەیەت لەبەرئەوە خوای گەورە فـەرمـوویـەتـی: ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ واتە: نە بۆ ئێوە نە بۆ ئەوان ڕزگاربوون نییە بە ئاواتخوازتنی پەتی، بەڵکو بەپێی پەرستنی خوایە و شوێنکەوتنی ئەوەی داناوە لەسەر زمانی پێغەمبەرە بەڕێزەکانییەوە، لەبەرئەوە دوای ئەوە فەرموویەتی: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾، وەك فەرمایشی: ﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُۥ ۝٧ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُۥ ۝٨﴾ [الزلزلة: ٧ - ٨]. دەگێڕنەوە کاتێ ئەم ئایەتانە هاتە خوارەوە گران بوو لەسەر شانی زۆر لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت).

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: دەگێڕنەوە ئەبو بەکر وتوویەتی: ئەی نێردراوی

خوا دوای ئەم ئایەتە چۆن ڕزگاربوون هەیە ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَآ أَمَانِيِّ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ ۗ مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾ هەرچی خراپەمان کردووە سزا بدرێینەوە لەسەری؟ پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: خوا لێت خۆش بێت ئەی ئەبو بەکر ئایا نەخۆش ناکەوی ئایا ماندوو نابیت ئایا تووشی خەم نابیت؟ وتی: بەڵێ ئەی نێردراوی خوا، فەرمووی: ئەوەیە کە سزا دەدرێنەوە لە سەری.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە کە گوێبیستی ئەبو بەکر بووم ئەیوت: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من يعمل سوءا يجزبه في الدنيا" هەر کەس خراپەیەك بکات لە دونیادا سزا دەدرێ لەسەری.

ئەبوبەکری کوڕی مەرجەویە وتوویەتی: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: سەیری ئەو شوێنە بکەن کە عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر تێیدا لە دار درابوو. بەلایا مەڕۆن، وتوویەتی: غەلامێك هەڵەی کرد لە کاتێکدا عەبدوڵڵای کوڕی عومەر سەیری ئیبنو زوبێری دەکرد سێ جار وتی: خوا لێت خۆش بێ.

بە خوا تۆم هەر بە ڕۆژووگر و شەونوێژکار و سیلەی ڕەحم گەیەنەر ناسیوە، بەڵام بەخوا من هیوام وایە لەگەڵ ئەو کارە خراپانەی کردن خوا سزات نەدات دوای ئەوە. ئەڵێ پاشان لای کردەوە بەلامەوە و وتی: گوێبیستی ئەبو بەکر بووم ئەیوت: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من يعمل سوءا في الدنيا يجز به" هەر کەس لە دونیادا خراپەیەك بکات سزا دەدرێ لەسەری.

ئەبوبەکری کوڕی مەردەویە وتوویەتی: لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: گوێبیستی ئەبو بەکر بووم دەیوت: لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بووم ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەی ئەبو بەکر ئەو ئایەتەت بۆ نەخوێنمەوە هاتە خوارەوە بۆم؟ ئەڵێ: وتم: بەڵێ ئەی نێردراوی خوا بۆم بخوێنەرەوە، ئەڵێ: بۆی خوێندمەوە بێ ئەوەی هەست

بکەم جیابوونەوەیەك لە پشتما پەیدا بوو نەمتوانی بەپێ بڕۆم، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەوە چیتە ئەی ئەبوبەکر؟ دایك و باوکم بە فیدات بێ کێ هەیە لە ئێمە کاری خراپەی نەکردبێ، ئایا ئێمە سزا دەدرێین لەسەر هەموو ئەو خراپانەی کردوومانە؟ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "ئەی ئەبو بەکر تۆو هاوەڵە باوەڕدارەکانت لەدونیادا سزا دەدرێن لەسەر کارە خراپەکانتان هەتا کاتێ دەگەن بە خوا تاوانتان بەسەرەوە نامێنێ، بەڵام ئەوانی تر، ئەوانەیان بۆ کۆدەکرێتەوە هەتا ڕۆژی قیامەت سزای لەسەر وەردەگرن".

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە عەتای کوڕی ئەبی ڕەباحەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: کاتێ ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە ئەبو بەکر وتی: ئەم ئایەتە پشتی پیاو دەشکێنێ! پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەو سزایانە ئەو موصیبەتانەیە لە دونیادا تووشتان دەبێت.

عەتای کوڕی یەسار وتوویەتی: لە ئەبی سەعید و لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە کە هەردووکیان گوێبیستی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بوون ئەیفەرموو: "ما يصيب المسلم من نصب ولا وصب ولا سقم ولا حزن حتى الهم يهمه إلا كفر الله من سيئاته" واتە: موسڵمان هەر ماندووبوون و نەخۆشی و ئازارێکی تووش دەبێت هەتا پەژارەیەك کە ببێتە هۆی جەنجاڵ کردنی، خوا دەیکاتە کەفارەتی تاوانەکانی.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی سەعیدی خودرییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وتی: ئەم نەخۆشییانەی تووشمان دەبن چی بۆ ئێمە دەکەن؟ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: ئەبنە کەفارەتی تاوانەکان.

فەرموودەیەکی تر: ئیبنو مەردەویە دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەباسەوە کە وتوویەتی: وترا ئەی نێردراوی خوا ﴿مَن يَعۡمَلۡ سُوٓءٗا يُجۡزَ بِهِۦ﴾. فەرمووی: "نعم ومن يعمل حسنه يجز بها عشراً" بەڵێ، هەرکەسیش چاکەیەك بکات پاداشتی ئەدرێتەوە، ئەو کەسانە تیاچوون کە یەکەکەی زاڵ دەبێت بەسەر دەکەیدا.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە حەسەنەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی: ﴿مَن يَعْمَلْ سُوٓءًا يُجْزَ بِهِۦ﴾. وتوویەتی: ئەوە کافرەن پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ﴾ [سبأ: ١٧]. بەو شێوەیە لە ئیبنو عەباس و سەعیدی کوڕی جوبەیر دەگێڕنەوە کە (سوء)یان ڕاڤە کردووە لێرەدا بە (الشرك) هاوبەشدانان.

﴿وَلَا يَجِدْ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ عەلی کوڕی ئەبی تەلْحە وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: مەگەر تۆبە بکات خوایش تۆبەکەی لێ وەردەگرێت. ئەوەی ڕاست بێت ئەوە گشتییە، هەموو کردەوەکان دەگرێتەوە بەپێی فەرموودەکانی پێشوو. ئەوەش هەڵبژاردەی ئیبنو جەریرە - ئیتر خوا دەزانێ -.

﴿وَمَن يَعْمَلْ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ مِن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ﴾، کاتێ باسی سزای کردووە لەسەر کارە خراپەکان کە ئەبێ هەکەس شایستەی بێت وەری بگرێ یان لە دونیادا کە ئەوە بۆی باشە، یان لە ڕۆژی قیامەت دا، پەنا ئەگرین بە خوا لەوە و داوای عافیەتی لێ دەکەین لە دونیا و ئاخیرەت دا، وە داوای لێبوردنی لێ دەکەین، دەستی کردووە بە ڕوونکردنەوەی کەرەم و ڕەحمەتی خۆی دەربارەی وەرگرتنی کاری چاکە لە بەندەکانی نێریان و مێیان، بەمەرجی باوەڕ بوون. ئەویش ئەوەیە کە دەیانخاتە بەهەشتەوە بێ ئەوەی تۆزقاڵێك لە چاکەکانیان لابەرێ و ستەمیان لێ بکات.

پاشان خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُۥ لِلَّهِ﴾ واتە: بە خالیصی کار بکات بۆ پەروەردگاری بە باوەڕەوە و بە ئومێدی پاداشتەوە، ﴿وَهُوَ مُحْسِنٌ﴾ واتە لە کارەکەیدا بەپێی ئەوە بڕوات کە خوا بۆی داناوە و بەپێی ئەوەی کە نێردراوەکانی پێدا ناردووە لە ڕێنمایی و دینی هەق، ئەو دوومەرە کاری هیچ کەس بەبێ ئەو دوانە دروست نابێت واتە ئەبێ خالیص و صەواب بێت، خالیص ئەوەیە هەر لەبەر خودا بێت و صەوابیش ئەوەیە بەپێی شەریعەت بێت، ئەوکاتە ڕواڵەتەکەی بە شوێنکەوتن دروست دەبێت و ناوەڕۆکی بە ئیخلاص، هەرکاتێ کردەوەی مرۆڤ یەکێ لەو دوو مەرجەی تێدا نەبوو گەندەڵ دەبێت، هەرکاتێ ئیخلاصی تێدا نەبوو ئەو کەسە

مونافیقە و ریابازی دەکات بۆخەڵك و هەرکەسیش شوێنکەوتنی نەبوو ئەو کەسە گومڕاو نەزانە، هەرکاتێ هەردووکیانی هەبوو ئەوە کردەوەی باوەڕدارانە ﴿ٱلَّذِينَ نَتَقَبَّلُ عَنۡهُمۡ أَحۡسَنَ مَا عَمِلُواْ وَنَتَجَاوَزُ عَن سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ [الأحقاف: ١٦].

لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۗ﴾، ئەوانیش موحەممەد و شوێنکەوتووانین هەتا ڕۆژی قیامەت، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِنَّ أَوۡلَى ٱلنَّاسِ بِإِبۡرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِيُّ﴾ [آل عمران: ٦٨] وە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ أَنِ ٱتَّبِعۡ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗاۖ وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ [النحل: ١٢٣] (الحنيف) کەسێکە لانەکات بە لای هاوبەشدانانەوە، واتە وازی لێ هێنابێ بەبەرچاوڕوونییەوە و بەرەو هەق و ڕاستی چوونە بە تەواوی، بێ ئەوەی هیچ شتێك ڕێی لێ بگرێ و بێ ئەوەی هیچ بیگێڕێتەوە لێی.

﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا﴾ ئەوە لە دەروازەی ڕەغبەت پێ دانە دەربارەی شوێنکەوتنی، چونکە پێشەوایە کە ئەبێ چاوی لێ بکرێ بەشێوەیەك پێی بگات بەمەبەستی ئەوەی پێی نزیك بێتەوە لە خوا. وە ئەو گەیشتۆتە پلەی (نحلة) کە بەرزترین پایەکانی خۆش ویستنە، ئەوەش لەبەر ئەوە بوو کە زۆر بەرفەرمانی پەروەردگار بووە و خواپەرستی کردووە، وەك خوای گەورە بەوە وەصفی کردووە دەفەرمووێت: ﴿وَإِبۡرَٰهِيمَ ٱلَّذِي وَفَّىٰٓ﴾ [النجم: ٣٧]، زۆر لە زانایانی پێشوو وتوویانە: واتە هەڵساوە بە جێبەجێکردنی هەموو ئەوانەی خوا فەرمانی پێداوە لە هەموو پلە و پایەکانی پەرستن هیچ شتێك لە شتێکی دی نەدەکرد نە گەورە لە بچووك، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِذِ ٱبۡتَلَىٰٓ إِبۡرَٰهِـۧمَ رَبُّهُۥ بِكَلِمَٰتٖ فَأَتَمَّهُنَّۖ﴾ [البقرة: ١٢٤] وە فەرموویەتی: ﴿إِنَّ إِبۡرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةٗ قَانِتٗا لِّلَّهِ حَنِيفٗا وَلَمۡ يَكُ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ [النحل: ١٢٠] وە ئایەتەکانی دوای ئەوە.

بوخاری وتوویەتی: سەعیدی کوڕی جوبەیر لە عەمری کوڕی مەیمونەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: کاتێ موعاز هات بۆ یەمەن نوێژی بەیانی بۆ کردن ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبۡرَٰهِيمَ خَلِيلٗا﴾ی خوێندەوە، پیاوێك وتی: بێ سۆ دایکی ئیبراهیم بە مەرامی خۆی گەیشتووە.

ئیبنو جەریر لە تەفسیرەکەیدا لە یەکێ لەوانەوە باسی ئەوە دەکات: کە بۆیە خوا ئیبراهیمی ناو ناوە خەلیل، چونکە خەڵکەکەی دەور و پشتی تووشی قات و قڕی برسێتی بوون، ڕۆیشت بۆ لای هاوەڵێکی لە خەڵکی موصڵ، هەندێ لە زانایان دەڵێن: لە خەڵکی میصر، بۆ ئەوەی هەندێ خواردن بۆ کەس و کاری بهێنێ لای ئەوەوە، بەڵام لەلایەن هاوەڵەکەیەوە پێویستییەکەی جێبەجێ نەبوو، کاتێ نزیك بوویەوە لە کەسوکاری چاوی کەوت بە تەپۆڵکەیەك لم، لە دڵی خۆیدا وتی: بۆچی ئەم تالنگانە پڕ نەکەم لە لم بۆ ئەوەی کەس و کارەکەم غەمبار نەبن کە گەڕامەوە بۆ لایان بەبێ خواردەمەنی، بۆ ئەوەی بزانن حەز لە چی دەکەن بۆم هێناون، ئەوەی کرد، بەڵام ئەو لمەی کردبوویە تالنگەکانی بوو بە ئارد، کاتێ گەیشتەماڵەوە خەوت کەسوکاری هەڵسان تالنگەکانیان کردەوە، بینیان ئاردی تێدایە، هەویریان لێ شێلاو نانیان لێ کرد. کاتێ لە خەو هەڵسا دەربارەی ئەو ئاردەی کردبویانە نان پرسیاری لێ کردن، وتیان: ئەو ئاردەیە کە تۆ هێناوتە لای هاوەڵەکەتەوە، وتی: بەڵێ، ئەوە لە لایەن خەلیلەکەمەوە کە خوایە هێناومە، ئیتر خوا ناوی نا خەلیل (دەربارەی ڕاستی ئەوەو ڕوودانی چاوپیاخشاندنەوەی دەوێ) ئەوە هەواڵێکی ئیسرائیلییە نە باوەڕی پێ دەکرێ، نە بە درۆ دادەنرێت.

بەڵکو بۆیە خوا ناوی خەلیل، چونکە پەروەردگاری بەرز و شکۆمەندی زۆر خۆش ویستووە، لەبەرئەوەی هەڵساوە بەو فەرمانانەی خوا خۆشی ویستوون و ڕازی بووە پێی. لەبەرئەوە لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە لە گێڕانەوەی ئەبی سەعیدی خودری کە پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) واتاری بۆ دان لەدوا وتاردا کە داوێتی فەرموویەتی: "أما بعد، أيها الناس، فلو كنت متخذ من أهل الأرض خليلا لاتخذت أبا بكر ابن أبي قوحافه خليلا لكن صاحبكم خليل الله" واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر لە خەڵکی سەرزەوی کەسێکم بکردایە بە خەلیلی خۆم ئەوە ئەبو بەکری کوڕی قوحافەم دەکردە خەلیلی خۆم. بەڵام خەلیلی خوام.

لە ڕێگەی جوندوبی کوڕی عەبدوڵڵای بەجەلی و عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە هاتووە وتوویەتی: کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانی پێغەمبەر دانیشتبوون

چاوەڕوانی هاتنی پێغەمبەریان دەکرد، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) هاتە دەر کاتێ لێیان نزیك بووەوە گوێی لێ بوو یادی خوایان دەکرد، گوێی لە قسەکانیان بوو، سەیری کرد هەندێکیان دەڵێن: سەیرە، خوا لەناو دروستکراوەکانیدا ئیبراهیمی کردووەتە خەلیلی خۆی، یەکێ تریان وتی: چی لەوە سەیرترە کە خوا قسەی لەگەڵ موسادا کردووە، ئەوی تریان وتی: عیساش ڕۆحی خوا و وشەکەیتی، یەکێکی تریان وتی: ئادەم هەڵبژاردەی خوایە، پێغەمبەر(درودی خوای لێ بێت) هاتە ناویان و سلاوی لێ کردن و فەرمووی: "بێ سۆ گوێبیستی قسەکانتان بووم، کە لاتان سەیر بوو ئیبراهیم خەلیلی خوایە و موسا خوا قسەی لەگەڵ کردووە و عیسا گیان و وشەیەتی و ئادەم هەڵبژاردەیەتی، ئەوانەش بە و شێوەیەن، موحەممەدیش بەو شێوەیەیە و فەرمووی: "بزانن منیش خۆشەویستی خوام، شانازی ناکەم من یەکەم تکاکارم و یەکەم کەسم تکام وەردەگیرێ، شانازی ناکەم من یەکەم کەسم ئەڵقەی بەهەشت دەجوڵێنم، خوای گەورە دەرگاکەی دەکاتەوە من و هەژارە باوەڕدارەکان ئەخاتە ناوی و شانازی ناکەم من بەرزترین کەسی سەرەتا و کۆتاییم ڕۆژی قیامەت بەبێ شانازی". (ئەوە فەرموودەیەکی غەریبە لەو ڕووەوە).

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە عوبێدی کوڕی عومەیرەوە هاتووە وتوویەتی: ئیبراهیم هەمیشە خەڵکی بانگ دەکردەوە بۆماڵی خۆیان. ڕۆژێك چووە دەرەوە بۆ ئەوەی کەسێك بهێنێتەوە بۆ ماڵەوە، بەڵام کەسی دەست نەکەوت، گەڕایەوە بۆ ماڵەوە سەیری کرد پیاوێك لە ماڵەکەیدا ڕاوەستاوە، وتی: ئەی بەندەی خوا چی پاڵی پێوە ناوی بێیتە ماڵەکەم بێ ئەوەی من ڕێت پێ بدەم؟ کابرا وتی: هاتوومە ناوی بە ڕێپێدانی پەروەرینی، وتی: کەواتە تۆ کێی؟ وتی: من فریشتەی گیانکێشانم، پەروەردگارم ناردومی بۆ لای بەندەیەك لە بەندەکانی کە مژدەی پێ بدەم کە خوا کردوویەتییە خەلیلی خۆی، وتی: ئەو بەندەیە کێیە؟ تو خوا ئەو بەندەیە کێیە؟ ئەگەر لەوپەڕی دونیا بێت ئەچم بۆ لای لێی دورناکەومەوە هەتا مردن لێکمان جیائەکاتەوە. ئەویش وتی: ئەو بەندەیە تۆیت، وتی: من؟ وتی: بەڵێ. وتی: لەبەرچی

پەروەردگارم منی کردووە بە خەلیلی خۆی؟ وتی: تۆ شتت دەبەخشی بە خەڵك بێ ئەوەی داوای هیچیان لێ بکەی.

﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ واتـە: هـەمـوو مـوڵـکـی خـوان و بەندەی خوان، هەر خۆی تەسەڕوف لە هەموو ئەوانەدا دەکات، ئەوەی ئەو داینا گێڕانەوەی نییە، هەرچی حوکمێك بدات بە دواچوونی نییە، هەرچی بکات لێپرسینەوەی نییە، لەبەر گەورەیی و توانای و دادپەروەری و داناییەکەی و لوتف و ڕەحمەتیەتی.

﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطًا﴾ واتە: زانستی بەناو ئەوانەدا تێدەپەڕێ و هیچ شتێکی لێ ناشارڕێتەوە مسقاڵە زەڕەیەك شتی لە ئاسمانەکان و زەویدا لێ ون نابێت.

﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ ۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ ٱلَّٰتِي لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ ۚ وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا ﴿١٢٧﴾﴾

واتە: دەربارەی ژنەکانەوە لێت دەپرسن، بڵێ: بەهۆی ئەم کتێبەوە کە بۆتان دەخوێنرێتەوە خودا جوابی ئەو پرسیارە و دەداتەوە، ئەو کیژانەی کە بە هەتیوی ماونەتەوە و ئەو ماڵەی کە دەیانکەوێ، نایاندەنێ و گەرەکتانە لە خۆتانیان مارە بکەن، هەروەها ئەو منااڵانەی زەبوون و بێ دەرەتانن لەسەرتانە لەگەڵ هەموو هەتیوان دا بە یەکسانی ڕەفتار بکەن و ئێوە هەر کارێ چاك بکەن، لێتان روون بێ کە خودا لێی ئاگادارە.

بوخاری وتوویەتی: لە عائیشەوە هاتووە وتوویەتی: ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ﴾ هەتا ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ عـائیشـە وتـوویـەتـی: ئەوە پیاوێکە کچە بێ باوکێکی لا بێت خۆی سەرپەرشتیکار و میرات گری بێت دێت هاوبەشی دەکات لە ماڵەکەیدا هەتا لە باغ و باخاتدا، حەزدەکات بیدات بە شوو، بەڵام لای ناخۆشە بیدات بە پیاوێك بێتە هاوبەشی لەو

ماڵەدا کە ئەم هاوبەشی کردووە، دێت ڕاگیری دەکات، ئەو ئایەتە هاتە خوارەوە.

هەر لە عائیشەوە هاتووە وتوویەتی: دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە خەڵك پرسیاریان لە پێغەمبەر دەکرد، خوای گەورەش ئەم ئایەتەی ناردە خـــوارەوە ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِۖ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِيهِنَّ وَمَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ فِي ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئەوەی خوا باسی کردووە ئەوەیە کە لە قورئاندا بۆی دەخوێنرێتەوە. ئایەتی یەکەم: ﴿وَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تُقْسِطُواْ فِي ٱلْيَتَٰمَىٰ فَٱنكِحُواْ مَا طَابَ لَكُم مِّنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ [النساء: ٣]. هەر بەو ئیسنادە لە عائیشەوە هاتووە وتوویەتی: فەرمایشی خوا: ﴿وَتَرْغَبُونَ أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ وتوویەتی ڕەغبەتی کەسێکتان لەوەی ئەو کچە هەتیوەی لە ماڵەکەیدایە مارە بکات کاتێ ماڵ و جوانی کەم بێت، قەدەغە کراوە لێیان کەسێك مارە بکەن کە حەز لە ماڵ و جوانییەکەی بێت لە کچە هەتیوەکان بە دادپەروەری نەبێت لە پێناوی ئەوەی حەزیان لێ نەکەن، مەبەست ئەوەیە ئەگەر پیاوێك کچێکی هەتیو بەخێو بکات ڕەوایە بۆی مارەی بکات، جاری وائەبێ پیاوەکە حەز دەکات مارەی بکات خوا فەرمانی پێدەدات وەك ژنانی تر مارەیی بۆ دابنێ، ئەگەر ئەوە نەکات با ژنێکی تر بهێنێ خوای گەورە ڕێگای فراوان کردووە لەوبارەوە، وە جاری وائەبێ حەز ناکات مارەی بکات لەبەر ناشیرینی، خوای گەورە لێی قەدەغە دەکات کە نەیەڵێت شوو بکات بە کەسانی تریش بکات لە ترسی ئەوە هاوبەشی بن لەو ماڵەدا کە ئەم ئەو کچە هاوبەشی کردووە تێیدا، وەك عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: ئەویش ئایەتی: ﴿فِي يَتَٰمَى ٱلنِّسَآءِ﴾ الآیە. وتوویەتی: پیاو لەسەردەمی نەفامیدا ئەگەر کچێکی بێ باوکی لابوایە کراسەکەی خۆی دەدا بەسەریدا، ئەگەر ئەوەی بکردایە کەس نەیدەتوانی مارەی بکات هەرگیز، جا ئەگەر جوان بوایە و حەزی لێ بکردایە مارەی دەکرد و ماڵەکەشی دەخوارد، ئەگەر ناشیرین بوایە نەیدەهێشت شوو بکات بە کەس هەتا دەمرد، کاتێ بمردایە میراتەکەی دەبرد، ئیتر خوای گەورە ئەوەی حەرام کرد و قەدەغەی کرد، وە دەربارەی ﴿وَٱلْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ ٱلْوِلْدَٰنِ﴾ وتوویەتی: لە سەردەمی نەفامیدا میراتیان نەدەدا

بە منداڵی بچووك و کچ، ئەم ئایەتەش لەبەرئەوە بووە کە دەفەرمووێت: ﴿لَا تُؤْتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ خوای گەورە ئەوەی قەدەغە کردووە و هەکەس پشکی خۆی بۆ دیاری کرد فەرمووی: ﴿لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾ [النساء: ١١] ئەو نێر و مێیە گەورە بن یان بچووك.

سەعیدی کوڕی جوبەیر و غەیری ئەویش دەربارەی ﴿وَأَن تَقُومُوا۟ لِلْيَتَـٰمَىٰ بِٱلْقِسْطِ﴾وتوویانە: وەك چۆن کە جوانی و ماڵی هەبوایە مارەی دەکرد و کاریگەر دەبوو پێوەی، بەوشێوەیە ئەگەر ماڵ و جوانی نەبوایە مارەی بکات و کاریگەری بوایە لەسەری، کە فەرموویەتی: ﴿وَمَا تَفْعَلُوا۟ مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمًا﴾ پاڵنانە بۆ کاری خێر و ملکەچ کردن بۆ فەرمانەکانی خوا، بەڕاستی خوا زانایە بە هەموو ئەوانە و لەسەریان پاداشتیان دەداتەوە بە فراوانترین و تەواوترین شێوە.

﴿وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا ۚ وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ ۗ وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ ۚ وَإِن تُحْسِنُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٢٨﴾ وَلَن تَسْتَطِيعُوٓا۟ أَن تَعْدِلُوا۟ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوْ حَرَصْتُمْ ۖ فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ ۚ وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾ وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾﴾

واتە: ئەگەر ژنێك هەستی بەوەکرد مێردەکەی ئەشقی بوو یا نەرووی لێ وەردەگێرێ، قەیدی ناکات هەوڵی لە هەق هاتن بدەن، ئاشتبوونەوە لەو دڕدونگیە باشترە، خۆشەویستی ماڵی دونیاش لە لای هەموو کەسێ هەیە جا ئەگەر چاکەی بکەن و خۆ لە هەڵە بپارێزن، خودا لە هەرکارێ دەیکەن ئاگادارە، ئێوە هەرچەندە هەوڵیش بدەن قەت ناتوانن لەگەڵ ژنانی خوتاندا بێ جیاوازی ڕەفتار بکەن، سا ئەوەندە لە خۆیان دوور مەخەوە کە بیانکەنە هەڵپەسارده و تەخسیریان بکەن، ئەگەر لەگەڵیان پێك بێن و خۆ لە گوناح

بپارێزن خودا بووردنی لە لایەو دلۆڤانە، خۆئەگەر بە یەکجاریش دەس لێك بەردەن خودا فەرحانی لەلایەو هەردووکیان بێ نیاز دەکاو بەزەیی خودا هەراوە و هەر بۆ خۆشی لە کارزانە.

خوای گەورە هەواڵ دەدات و یاسا بۆ حاڵی ژن و مێرد دادەنێ جارێك بۆ حاڵی نەویستنی ژن و جارێك بۆ حاڵەتی رێك کەوتن لەگەڵیا و جارێك بۆ جیابوونەوە لێی، حاڵەتی یەکەم ئەگەر ژنەکە لە مێردەکەی ترسا کە لێی دوور بکەوێتەوەو حەزی پێ نەکا، بۆی هەیە واز لە چەند هەق بێنێ کە لەسەر پیاوەکەیە، یان لە هەندێکی لە نەفەقە و پۆشاك و شەومانەوە لای یان گەلێ شتی تر لەو مافانەی لەسەریەتی و بۆ پیاوەکە هەیە ئەوەی لێ قبوڵ بکات خراپ نییە بۆ ژنەکە لەو بارەیەوە هەرچی سەرف بکات و خراپ نییە لەسەر پیاوەکەش کاتی قبوڵ کردنی ئەوە لە ژنەکەی، لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا﴾ پاشان فەرموویەتی: ﴿وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌ﴾، واتە لە جیابوونەوە باشترە، وە کە دەفەرمووێت: ﴿وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّ﴾ واتە صوڵح کردن چاکترە لە جیابوونەوەکانی شەڕ و ئاژاوە، لەبەر ئەوە کاتێ سەودەی زەمعە گەورە بوو بە تەمەن پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ویستی لێی جیابێتەوە ئەویش صوڵحی لەگەڵدا کرد کە لای خۆی بیهێڵێتەوە، بەڵام شەوەکەی بۆ عائیشە بێت، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ئەوەی لێ قبوڵ کرد و لە شوێنی خۆی هێشتییەوە.

لەوبارەیەوە باسێك هاتووە لە ئیبنو عەباسەوە کە ئەبوداودی تەیالیسی هێناویێتی وتوویەتی: کاتێ سەودە ترسی ئەوەی لێ نیشت کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) تەڵاقی بدات وتی: ئەی نیچرراوی خوا تەڵاقم مەدە شەوەکەم بۆ عائیشە دابنێ، ئەویش ئەوەی کرد و ئەم ئایەتەش هاتە خوارەوە: ﴿وَإِنِ ٱمْرَأَةٌ خَافَتْ مِنۢ بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ﴾.

شافیعی وتوویەتی: موسلیم لە ئیبنو جورەیجەوە بۆمان دەگێڕێتەوە لە عەتاوە لە ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کاتێ مرد نۆ ژنی هەبوو، شەوەکانی بۆ هەشتیان بەش دەکرد.

لەهەردوو سازەواردا هاتووە کە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی:

کاتێ سەودەی کچی زەمعە چووبەساڵا و تەمەنی گەورە بوو ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بە عائیشە.

سەعیدی کوڕی مەنصور وتوویەتی: عەبدوڕەحمانی کوڕی ئەبی زەناد لە هیشامەوە لە عەروەی باوکییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: خوای گەورە دەربارەی سەودە و هاوشێوەکانی ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ﴾ هاتە خوارەوە. ئەوەش لەبەر ئەوە بووە کە سەودە ژنێکی بە تەمەن بوو ڕۆژەکەی خۆی بەخشی بە عائیشە، پێغەمبەریش (دروودی خوای لێ بێت) قبوڵی کرد.

بەیهەقی وتوویەتی: هیشامی کوڕی عەروە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە لە عائیشەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەزڵی کەسمانی نەئەدا بەسەر کەسدا، دەربارەی مانەوەی لامان کەم ڕۆژ نەبێت هەموو ڕۆژێك سەرەمانەوە دەگەڕا لە هەموو ژنەکانی نزیك دەبووەوە بەبێ ئەوەی بچێتە لای هەتا ئەگەیشتە ماڵی ئەوەمان کە سەرەی بوایە شەو لای دەمایەوە، سەودەی کچی زەمعە کاتێ تەمەنی زۆربوو ئەترسا پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) تەڵاقی بدات وتی: ئەی نێردراوی خوا شەوەکەی خۆم ئەبەخشم بە عائیشە، ئەویش پێغەمبەر قبوڵی کرد.

عائیشە وتوویەتی: دەربارەی ئەوە خوا ئایەتی: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾ ناردە خوارەوە.

بوخاری وتوویەتی: هیشامی کوڕی عەروە لە باوکییەوە دەگێڕێتەوە کە عائیشە وتوویەتی: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾ پیاوی وا هەیە ژنێکی بەتەمەنی دەبێ ئەیەوێت لەبەر پیری لێی جیابێتەوە ژنەکەشی دەڵێت: من لە شەوەکانی خۆم گەردنت ئازاد دەکەم تەڵاقم مەدە، خوای گەورەش ئەو ئایەتەی ناردە خوارەوە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە عائیشەوە هاتووە کە ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌ﴾ وتوویەتی: ئەوە دەربارەی ژنێکە لای پیاوێك بێت لەوانەیە نەتوانێ ژنی زۆری هەبێ یان ئەو ژنە منداڵی نابێت و ماوەیەکی زۆر لەگەڵ ئەو پیاوەدا

دەبێت، بە پیاوەکەی دەڵێت: تەڵاقم مەدە دەربارەی خۆم گەردنت ئازاد دەکەم.

هەروەها دەربارەی پیاوێکە دوو ژنی دەبێت، یەکێکیان پیر دەبێت یان ناشیرینە ئەیەوێ لێی جیابێتەوە ئەویش دەڵێت: تەڵاقم مەدە لە بەشەکەی خۆم گەردنت ئازاد دەکەم.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئیبنو سیرینەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) دەربارەی ئایەتێك پرسیاری لێ کرد لای ناخۆش بوو بە قامچی لێی دا، یەکێکی تر هات دەربـــــارەی ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ﴾ وتی: دەربارەی شتی وەها لێم بپرسن، پاشان وتی: ئەوە ژنێکە لای پیاوێك دەبێ بە ساڵدا دەچێ، پیاوەکەش ژنێکی گەنج دەهێنێ منداڵ و لێی دەبێ، ژنە کۆنەکە و پیاوەکە لەسەر هەرچی ڕێك کەوتن دروستە.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: خالیدی کوڕی عەر عەرە دەگێڕێتەوە و دەڵێت: پیاوێك هات بۆ لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب دەربارەی ئایەتی: ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضًا﴾ عەلی وتی: پیاوی وا ئەبێ ژنێکی دەبێ ناشیرین دەبێ، یان پیر دەبێ، یان ڕەوشتی خراپ دەبێ، ژنەکە حەز ناکات لەو پیاوە جیابێتەوە ئەگەر هەندێ لە مارەییەکەی لەسەر پیاوەکە لا ببات دروستە، یان لە ڕۆژەکانی خۆی ببورێ خراپ نییە.

بەو شێوەیە سەعیدی کوڕی موسەیب و سلیمان باسی ئەو ەرێك کەوتنەیان کردووە کە خوا فەرموویەتی: ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيۡهِمَآ أَن يُصۡلِحَا بَيۡنَهُمَا صُلۡحًاۚ وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٌۗ﴾ وتوویانە بۆیان باس کردووین کە ڕافیعی کوڕی خەدیجی ئەنصاری کە لە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) بووە ژنێکی دەبێ لای دەمێنێتەوە هەتا پیر دەبێت، ئەویش ژنێکی گەنجی بەسەر دەهێنێ. ئەو ژنە گەنجەی خۆشتر دەوێ لەو، ئەویش داوای لێ دەکات تەڵاقی بدات، ئەویش یەك تەڵاقی دەدات، پاشان لەسەری دەوەستێ هەتا وای لێ دێ گێڕانەوەی نامێنێ، پاشان گێڕایەوە هەر ژنە گەنجەکەی خۆشتر دەوی، ژنەکەش داوای لێ دەکات تەڵاقی بدات، پێی دەڵێت: ئارەزووی خۆتە من

یەك تەڵاقم لەسەرت هێشتووەتەوە ئەگەر حەز دەكەیت بمێنەرەوە لام لەسەر ئەو شێوەیە كە زۆرتر لای ئەو دەمێنمەوە، ئەگەر حەز دەكەیت لێت جیادەبمەوە، ژنەكە وتی: نا دەمێنمەوە لەسەر ئەو شێوەیە ئەویش لەسەر ئەوە ڕێك كەوت لەگەڵیدا كە زۆرتر لای ژنە گەنجەكە بمێنێتەوە، ئەوەش ڕێك كەوتنی نێوانیان بوو، وە رافیع ئەو رازیبوونەی بە تاوان نەزانی لەسەری كاتێ رازی بوو لای بمێنێتەوە بەو شێوەیە.

كە دەفەرموویێت: ﴿وَٱلصُّلۡحُ خَيۡرٞ﴾ واتە ڕێك كەوتنیان لەسەر ئەوەی ژنەكە لە هەندێ مافی خۆی خۆش بێ و پیاوەكەش قبوڵی بكات باشترە لە جیابوونەوە لێی بە تەواوەتی وەك چۆن پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) زەمعەی هێشتەوە لەسەر ئەوەی شەوەكەی خۆی ببەخشێ بە عائیشە ئیتر لێی جیانەبووەوە. وە لەو فەرموودەیەدا هاتووە كە ئەبو داود و ئیبنو ماجە گێڕاویانەتەوە لە عەبدوڵڵای كوڕی عومەرەوە كە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ابغض الحلال الی الله الطلاق" واتە: ناشیرینترین شتی ڕەوا لای خوا جیابوونەوەی ژن و مێردە لە یەك.

كە دەفەرموویێت: ﴿وَإِن تُحۡسِنُواْ وَتَتَّقُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعۡمَلُونَ خَبِيرٗا﴾ واتە ئەگەر ناخۆش ئارام گرتن بچەژن لەسەر ئەوەی حەزی پێ ناكەن دەربارەیان و وەك ژنەكانی تر شەویان بۆ دادەنین خوای گەورە ئاگاداری ئەوە دەبێ و لەسەر پاداشتێكی زۆرتان دەداتەوە.

كە دەفەرموویێت: ﴿وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ﴾ دەربارەی عائیشە هاتووەتە خوارەوە، واتە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) لە ژنەكانی تری خۆشتر دەویست. زوك لەو فەرموودەیەدا هاتووە كە ئیمام ئەحمەد ریوایەتی كردووە، لە عەبدوڵڵای كوڕی یەزیدەوە لە عائیشەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) شەوەكانی لە نێوان ژنەكانیدا بەش دەكرد بە دادپەروەری، پاشان دەیفەرموو خوایە ئەوە بەش كردنی منە دەربارەی ئەوانەی من خاوەنیمی لۆمەم مەكە لەسەر ئەوانەی تۆ هەتەو من نیمە، واتە: دڵ.

كە دەفەرموویێت: ﴿وَلَن تَسۡتَطِيعُوٓاْ أَن تَعۡدِلُواْ بَيۡنَ ٱلنِّسَآءِ وَلَوۡ حَرَصۡتُمۡۖ﴾

واتە ئەی خەڵکینە ئێوە ناتوانن بەیەکسانی کار بکەن لە نێوان ژنەکانتاندا لە هەموو ڕوویەکەوە.

﴿فَلَا تَمِيلُوا۟ كُلَّ ٱلْمَيْلِ﴾ واتە ئەگەر مەیلتان هەبوو بە لای یەکێ لە ژنەکانتانەوە زیادەڕەوی تێدا مەکەن.

﴿فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِ﴾ واتە ئەویتر بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە، ئیبنو عەباس و موجاهید و سەعیدی کوڕی جوبەیر و حەسەن و زەحاك و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس و سوودی و موقاتیلی کوڕی حەیان وتوویانە: واتە: ئەویتر یان بە هەڵواسراوی بمێنێتەوە نە مێردی هەبێ نە تەڵاقدرابێ.

ئەبو داودی تەیالیسی وتوویەتی: لە ئەبو هورەیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من كانت له امرأتان فمال الى أحدهما جاء يوم القيامة واحد شقيه ساقط" واتە: هەر کەس دوو ژنی هەبێ مەیلی بە لای یەکێکیانەوە بێ ڕۆژی قیامەت دێت لایەکی پێوە نابێت.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن تُصْلِحُوا۟ وَتَتَّقُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ واتە ئەگەر لە کاروبارەکانتاندا ڕێك کەوتن لەگەڵ یەك و دابەشکردنەکەتان دادپەروەرانە بوو و لەخوا ترسان لە هەموو بارودۆخێکدا، خوا لێتان دەبووری لەو مەیلەی کە بە لای هەندێ لە ژنەکانتانەوە هەبوو.

پاشان خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَإِن يَتَفَرَّقَا يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾﴾ ئەمەش حاڵەتی سێیەمە، ئەویش حاڵەتی لەیەك جیابوونەوەیە، خوای گەورە هەواڵی داوە ئەگەر لە یەك جیابوونەوە خوا بێ ئیحتیاجیان دەکات لەیەك بەوەی کە بریتی ئەداتەوە بە ژنێك بۆی چاکتر بێ لەو و ژنەکەش بریتی دەداتەوە بە کەسێك کە چاکتر بێت لە پیاوەکەی تری ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾﴾ واتە فەزڵی گەورەو فراوان لەهەموو کردار و دانراوەکانی و شەرعەکەیدا.

﴿وَلِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ

وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾ وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي
ٱلْأَرْضِۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾ إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ
بِـَٔاخَرِينَۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا
فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا ﴿١٣٤﴾﴾

واتە: بۆ خودایە هەر شتێك لە ئاسمان و زەمیندایە، ئەو کەسانەی لە پێشوودا کتێبی ئێمەیان بۆ هات، ئێوەشمان ڕاسپاردووە کە دەبێ لە خوا بترسن، خۆئەگەر حاشاش لێ بکەن، دیسان هەرچی کە لە ناو ئاسمانان و زەویدایە بۆ خودایە و خوا هەمیشە هەر لە گشت کەس بێ نیازە و هەردەبێ پەسەندی بدرێ.

ئارێ هەرچی لە ناو ئاسمان و زەویدایە سەر بەخوایە هەر خودا کارسازی بێ بەسە. ئەی مەردم! ئەگەر خوا حەز بکات گشت تەفر و تونا دەکا و غەیری ئێوە لە جێگە و دادەمەزرێنێ خودا ئەو کارەی لەدەست دێ. کێ لە ئێوە ئەیەوێ لە دونیا خۆش ڕابوێرێ، با تێ بکات کە خۆشی دونیا و قیامەتیش وەلی لای خوا و خوداش بیسەر و بینەرە.

خوای بەرز هەواڵی داوە کە خۆی خاوەنی ئاسمانەکان و زەویە و هەر خۆی خاوەنی دەسەڵاتە تیاندا و دادوەرە، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ﴾ واتە چیمان بەوانەی پێش ئێوە وتووە هەرئەوەشمان بە ئێوە وتووە کە لە خوای بەرز و شکۆمەند ترست هەبێت و بە تاك و تەنها و بێ هاوبەش بیپەرستن.

پاشان فەرموویەتی: ﴿وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِۚ﴾ وەك خوای گەورە دەربارەی موسا هەواڵی داوە کە بەنەتەوەکەی وتووە: ﴿إِن تَكْفُرُوٓا۟ أَنتُمْ وَمَن فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ [إبراهيم: ٨].

وە وتوویەتی: ﴿فَكَفَرُوا۟ وَتَوَلَّوا۟ۚ وَّٱسْتَغْنَى ٱللَّهُۚ وَٱللَّهُ غَنِيٌّ حَمِيدٌ﴾ [التغابن: ٦]، واتە: هیچ پێویستی بە بەندەکانی نییە و ستایش کراوە دەربارەی هەموو ئەو شتانەی دایناوە و ئەو یاسانەی ناردونییە خوارەوە.

کـە دەفـەرمـوێـت: ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾﴾ واتە: ئەو ڕاوەستاوەی بەسەر هەموو ئەو نەفاسەنەوە کە چی دەکەن و چاودێر و ئاگادارە بەسەر هەموو شتێکدا.

﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ وَيَأْتِ بِـَٔاخَرِينَ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾﴾ واتە توانای هەیە ئێوە لەناو ببات و کۆمەڵێکی تر لە جێگای ئێوە بهێنێ و دابنێ ئەگەر سەرپێچی فەرمانەکانی بکەن. وەك فەرموویەتی: ﴿وَإِن تَتَوَلَّوْا۟ يَسْتَبْدِلْ قَوْمًا غَيْرَكُمْ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓا۟ أَمْثَٰلَكُم﴾ [محمد: ٣٨].

یەکێ لە پێشینەکان وتوویەتی: ئەی بەندەکانی خوا چەند ئاسانن بەدەست خوا و کاتێ فەرمانەکانی جێبەجێ نەکەن، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ وَيَأْتِ بِخَلْقٍ جَدِيدٍ ﴿١٩﴾ وَمَا ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ بِعَزِيزٍ ﴿٢٠﴾﴾ [إبراهيم: ١٩ - ٢٠] واتە کەس ڕێی ئەوەی لێ ناگرێت.

کـە دەفـەرمـوێـت: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ واتە: ئەی ئەو کەسانەی کە لە غەمی دونیا بەولاوە غەمی دیکەتان نییە بزانە کە پاداشتی دونیا و ڕۆژی دوایی هەر لای خوایە. ئەگەر داوای ئەوانەی لێ بکەی خوا بێ پێویست دەکات و ئەتداتێ ئەتپارێزێ وەك خوای بـەرز فـەرمـوویـەتـی: ﴿فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِي ٱلْـَٔاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ ﴿٢٠٠﴾ وَمِنْهُم مَّن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِي ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي ٱلْـَٔاخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴿٢٠١﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ نَصِيبٌ مِّمَّا كَسَبُوا۟﴾ [البقرة: ٢٠٠ - ٢٠٢]. وە خـوای بـەرز فـەرمـوویـەتـی: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ ٱلْـَٔاخِرَةِ نَزِدْ لَهُۥ فِي حَرْثِهِۦ﴾ [الشورى: ٢٠] وە فـەرمـوویـەتـی: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ﴾ هـەتـا: ﴿ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ﴾ [الإسراء: ١٨ - ٢١].

ئیبنو جەریر دەڵێت: واتای ئەم ئایەتە: ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ واتە لەو مونافیقانەی بەدرۆ دەڵێن باوەڕدارین، لەبەرئەوە ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەو دەستکەوتانەیە لەگەڵ موسڵمانەکان بەدەستی دەهێنن کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلْـَٔاخِرَةِ﴾ واتەی وەلای خوا پاداشتی ڕۆژی دوایی هەیە ئەویش ئەو سزایانەیە کە بۆی داناون لە ئاگری دۆزەخدا وەك ئەم فەرمایشەی

لێ کردووه ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا وَزِينَتَهَا﴾ تادەگاتە: ﴿وَبَٰطِلٌ مَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ﴾ [هود: ١٥ ـ ١٦]. گومانی تێدا نییە ئەم ئایەتە واتاکەی دیارە، بەڵام ڕاڤەکردنی ئایەتی یەکەم بەوشێوەیە چاوپیاخشاندنەوەی دەوێ. چونکە فەرمایشتی خوای بەرز ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنْيَا وَٱلْءَاخِرَةِ﴾ دیارە دەربارەی بەدەستهێنانی خێر لە دونیا و ئاخیرەتدا واتە هەردووکیانی بە دەستە، سەرچاوەی ئەوانە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ لای ئەوەی زیان و سوودی بەدەستە ئەویش ئەو خوایەیە کە شایستەیەکی پەرستن نییە جگە لە ئەو، هەر ئەوە بەختەوەری و چارەڕەشی بەش کردووە لە نێوان بەندەکانیدا لە دونیا و ئاخیرەتدا، وە دادپەروەرە لە نێوانیندا بەپێی ئەوەی ئەیزانێ کە کامیان شایستەی ئەوەیانە و کامیان شایستەی ئەمەیانە لەبەرەئەوە فەرموویەتی: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًۢا بَصِيرًا﴾.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ كُونُوا۟ قَوَّٰمِينَ بِٱلْقِسْطِ شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ ۚ إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا ۖ فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟ ۚ وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان! بەیەکسانی و بێ جیاوازی بەکاری مەردم ڕا بکەن و بۆ خوداش شایەتی بدەن هەرچەندە شایەتی دانتان بەزیانی خۆتان و دایك و بابتان و خزمانیشت بێ ئەگەر شایەتی بۆ دراوان دارا بن یاخۆ هەژار بن، خوا بۆ ئەوان دڵسۆزترە، مەکەونە شوێن ئارەزووتان نەوا لە ڕێگە لا بدەن، ئەگەر زمان بخەنە لا یا خۆتان لە شایەتی دان بدزنەوە، لەهەر کاری ئێوە دەیکەن خوا هەمیشە ئاگادارە.

خوای گەورە فەرمان دەکات بە بەندە باوەڕدارەکانی کە کاروباری مەردم بە دادپەروەری ببەن بەڕێوە بە لای ڕاست و چەپدا لێی لا نەدەن لەبەر خوا لۆمەی لۆمەکاران کاریان تێ نەکاو دووریان نەخاتەوە و ئەبێ یارمەتیدەری یەکتر بن و پشتی یەکتر بگرن.

﴿شُهَدَآءَ لِلَّهِ﴾ ئەمە وەك ئەو ئایەتە کە دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلشَّهَٰدَةَ

لِلَّهِ﴾ [الطلاق: ٦٥] واتە: جێبەجێ کردنی لەبەر خوا بێت ئەو کاتە راستەو دادپەروەرانەیە دوور لە تەحریف و گوڕاندن و شاردنەوە لەبەر ئەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَوْ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ﴾ واتە شایەتی هەق بدە ئەگەر زیانەکەشی بگەڕێتەوە بۆ سەر خۆت ئەگەر دەربارەی شتێك پرسیاریان لێ کردی هەق بڵێ با زیانەکەشی بگەڕێتەوە سەر خۆت، چونکە خوای گەورە دەروو کارە بۆ ئەوانەی بەرەفەرمانی ئەون.

﴿أَوِ ٱلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ﴾ واتە ئەگەر شایەتی دانەکە لەسەر دایك و باوکت و خزمەکانیشت بن گوێیان مەدەرێ تۆ شایەتی هەق بدە ئەگەر زیانەکەشی بگەڕێتەوە بۆ سەریان، چونکە هەق حاکمە بەسەر هەموو کەسەوە.

﴿إِن يَكُنْ غَنِيًّا أَوْ فَقِيرًا فَٱللَّهُ أَوْلَىٰ بِهِمَا﴾ واتە لەبەر دەوڵەمەندییان ریعایەتیان مەکە و دڵت بۆیان نەسووتێ ئەگەر هەژار بوون. خوا سەرپەرشتییان دەکات، چونکە هەر ئەو لە پێشترە بۆیان لە تۆ و زاناترینە بەوانەی چاکی بۆ ئەوان تێدایە؟

﴿فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ أَن تَعْدِلُوا۟﴾ واتە هەواو ئارەزوو و ڕەگەزپەرستی و رقبوونی خەڵك پاڵتان پێوە نەنێت واز لە دادپەروەری بهێنن لە کاروبارتاندا، بەڵکو پابەنجی دادپەروەری بن لەسەر هەموو باروزۆخێك وەك خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟ ۚ ٱعْدِلُوا۟ هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ ۖ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ [المائدة: ٨] لەسەر ئەو شێوەیە قسەکەی عەبدوڵڵای کوڕی ڕەواحە هەیە کە وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) ناردنی بۆ خەرص کردنی خەڵکی خەیبەر و بەربوومیان و دانەوێڵەیان کە ویستیان بەرتیلی بدەنێ بۆ ئەوەی بەزەییان پێیانا بێتەوە، وتی: سوێند بە خوا لای کەسێکەوە هاتووم کە خۆشەویست ترین کەسمەو ئێوە زۆر رقم لێتانە، بەڵام خۆشەویستی ئەو و رقم بوونم لە ئێوە پاڵم پێوە نانێ کە دادپەروەر نەبم بۆتان. وتیان: بەوە ئاسمانەکان و زەوی راگیراون.

﴿وَإِن تَلْوُۥٓا۟ أَوْ تُعْرِضُوا۟﴾ موجاهید و چەند کەس لە پێشینان وتوویانە: واتە شایەتی راست نەدەن و بیگۆڕن، چونکە (اللي) لادان و درۆکردنە بە قەستی.

خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ مِنْهُمْ لَفَرِيقًا يَلْوُنَ أَلْسِنَتَهُم بِالْكِتَابِ﴾ [آل عمران: ٧٨] ، (اعراض) شاردنەوەی شایەتی و وازلێهێنانە. خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْتُمْهَا فَإِنَّهُ آثِمٌ قَلْبُهُ﴾ [البقرة: ٢٨٣]. وە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "خير الشهداء الذي يأتي بالشهادة قبل أن يسألها" واتە: باشترین شایەت کەسێکە شایەتی بدات پێش ئەوەی پرسیاری لێ بکرێ. لەبەرئەوە خوا هەرەشەیان لێدەکات و دەفەرموێت: ﴿فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا﴾ واتە لەسەر ئەوە سزایان دەدەم.

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان وێڕای ئەوەی باوەڕتان بە خوا هێناوە ئەشێ بڕوا و بە پێغەمبەرەکەی هەبێ و بڕواتان بەو قورئانە هەبێت بۆ پێغەمبەری ناردووە و بڕواتان بەو کتێبەش هەبێ کە بەر لە قورئان ناردوویەتی، هەرکەسێکیش لە خودا و فریشتەکانی و کتێبانی و پێغەمبەرەکانی خوداو ڕۆژی سەڵا حاشا بکا لە ڕادەبەدەر گومڕایە.

خوای بەرز فەرمان دەکات بە بەندە باوەڕدارەکانی داخلی هەموو دانراوەکانی باوەڕو لقەکانی و پایەکانی ببن ئەوە لە دەری بەدەستهێنان نییە، بەڵکو لە دەری تەواوەتی و بڕیاردان لەسەری و چەسپاندی و بەردەوام بوونە لەسەری وەك هەموو باوەڕدارەکان لە نوێژەکانیاندا دەڵێن: ﴿اهْدِنَا الصِّرَاطَ الْمُسْتَقِيمَ﴾ [الفاتحة: ٦] واتە: چاومان بکەوە لە سەری و ڕێنمایی و چەسپاومان بکە لەسەری. خوای گەورە فەرمانیان پێ دەکات باوەڕیان بەو و بە نێردراوەکانی هەبێ وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَآمِنُوا بِرَسُولِهِ﴾ [الحديد: ٢٨]. وە فەرمایشی: ﴿وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ﴾ واتە قورئان ﴿وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ﴾ ئەوە ڕەگەزێکە هەموو کتێبەکانی پێشوو دەگرێتەوە، وە دەربارەی قورئان وتوویەتی: هاتۆتە خوارەوە، چونکە بە جیا جیاو ئایەت ئایەت هاتۆتە خوارەوە لەسەر

ڕووداوەکان و بەپێی ئەوەی بەندەکانی پێویستییان پێی هەیە لە ژیانیاندا و لە ڕۆژی دواییاندا، بەڵام کتێبەکانی پێشوو بە یەکجار هاتۆتە خوارەوە، لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ﴾، پاشان خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا﴾ واتە بێ سۆ لە ڕێگای ڕاست دەرچووە و دووركەوتووەتەوە بە قەستی دووریەکی زۆر.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًۢا ﴿١٣٧﴾ بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾ ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾ وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِى ٱلْكِتَٰبِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ حَتَّىٰ يَخُوضُوا۟ فِى حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ ۚ إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِى جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾﴾

واتە: ئەو کەسانەی یەکەم جار بڕوایان هێناو پاشان پەشیمان بوونەوە دووبارە بڕوایان هێناو بە شوێنیدا حاشایان لێکرد، ئەوسا خودانەناسییان پتەوتر بوو، هەرگیز خودا نایانبەخشێ و ڕێگایەکیان نیشان نادا، مزگێنی بدە بە دووڕووەکان کە ئازارێکی زۆر بە ژان والەڕێیاندا. ئەو کەسانەی دەبنە دۆستی خوانەناسان و لە کۆمەڵی باوەڕداران دەتەکنەوە، ئاخۆ بە تەمان کە لای وان قەدر و حورمەتیان دەس کەوێ؟ با بزانن کە قەدر و ڕێز هەر لای خوا هەیە و هیچی تر. لەم قورئانا بە ئێوەی ڕاگەیاندووە هەرگایەکی پێتانزانی کەسانێك هەن لە وەختی قورئان خوێندنا دەس دەکەن بە گاڵتە و گەپ و بە درۆی هەڵبەستەی دەزانن، ئێوە نابێ هەتا ئەو باسە نەگۆڕن لەگەڵیاندا دانیشن دەنا ئێوەش ئەوسا وەکو ئەوان دەبن دیارە خودا گشت ئەو کەسانەی دووڕووین وێڕای گەلی خوانەناسان لە دۆزەخ کۆ دەکاتەوە.

خوای گەورە هەواڵی ئەوانە دەدا کە باوەڕیان هێناوە، پاشان پەشیمان

بوونەوە، پاشان گەڕانەوەو بەردەوام بوون لەسەر گومڕایی و کاری گومڕاییان زیاد کردووە هەتا مردون ئەو کەسانە تۆبەیان بۆ نییە و خوایش لە دوای مردنیان لێیان خۆش نابێت ئەوەی ئەوان وان لەسەری بۆیان ناکاتە دەرو خۆشی و بۆیان ناکاتە ڕێگا بەرە و هیدایەت، لەبەرئەوە دەفەرمووێت: ﴿لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا﴾.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی: ﴿ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا﴾ وتوویەتی: لەسەر خوانەناسی مانەوە هەتا مردن. موجاهیدیش ئەوەی وتووە.

ئیبنو ئەبی حاتەم لە عەلییەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: هەڵگەڕاوە لە دین سێ جار داوای تۆبەکردنی لێ دەکرێت، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندووەتەوە: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ءَامَنُوا۟ ثُمَّ كَفَرُوا۟ ثُمَّ ٱزْدَادُوا۟ كُفْرًا لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا ﴿١٣٧﴾﴾، پاشان وتوویەتی: ﴿بَشِّرِ ٱلْمُنَٰفِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾﴾ واتە: مونافیقەکان لەسەر ئەو سیفەتانەن، چونکە باوەڕیان هێناوە، پاشان پەشیمان بوونەوە، خوا مۆری ناوە بەسەر دڵیاندا، پاشان وەسفیان دەکات بەوەی کە بەخوانەناسەکان ئەکەنە دۆستی خۆیان بە بێ باوەڕدارەکان. بەو واتایەی ئەوان لەگەڵیانان لە ڕاستی دا ئەبنە دۆستیان و بە نهێنی خۆشەویستیان بۆ دەردەبڕن کاتی بە تەنهاییان دەگەن پێیان دەڵێن: ئێمە لەگەڵ ئێوەداین ئەوە گاڵتە بە باوەڕداران دەکەین کەویان بۆ دەردەخەین لەگەڵیاندا ڕێکین.

خوای گەورە ئەو ڕێگایەی گرتوویانە گە بوونە دۆستی خوانەناسەکانی ئینکاریان لێ دەکات ﴿أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ﴾، پاشان خوای گەورە ڕادەگەیەنێ کە عیزەت و بەرزی هەموو بۆ ئەوی بێ هاوبەشە و بۆ ئەوانە کە خوا عیزەت و بەرزییان دەداتێ وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿مَن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعِزَّةَ فَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ جَمِيعًا﴾ [فاطر: ١٠]. وە خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَلِلَّهِ ٱلْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِۦ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَلَٰكِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾ [المنافقون: ٨]. مەبەست لەو ورووژاندنە لەسەر داوای عیزەت کردن لە خوا و چون بەرەو بەندایەتی کردنی و ڕێك کەوتن لەناو هەموو بەندە باوەڕدارەکانی ئەوانەی کە سەرکەوتن

بۆ ئەوانەی لە ژیانی دونیا و لەو ڕۆژەدا کە شایەتەکان ڕاست دەبنەوە.

گونجاوە لێرەدا باسی ئەو فەرموودەیە بکەین کە ئیمام ئەحمەد گێڕاویەتییەوە وتوویەتی: لە ئەبی ڕەیحانەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (من انتسب إلى تسعة آباء كفار يريد بهم عزًا وفخرًا، فهو عاشرهم في النار)، واتە: هەر کەس نۆ لە باو و باپیرانی خوانەناس بووبن ئەمیش بیەوێ شانازییان پێوە بکات ئەو کەسە دەیەمیانە لە ئاگردا.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ فِي الْكِتَابِ أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ آيَاتِ اللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا فَلَا تَقْعُدُوا مَعَهُمْ حَتَّى يَخُوضُوا فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِ إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ﴾ واتە: ئێوە ئەگەر قەدەغەکردنەکەتان شکاند دوای ئەوە پێتان گەیشت و ڕازی بوون بە دانیشتن لەگەڵیان لەو شوێنەدا کە بێ باوەڕی دەکرێت بە ئایەتەکانی خوا و گاڵتەیان پێ دەکرێ و بەکەم دادەنرێ و بڕیارتان دان لەسەر ئەوە بێ سۆ هاوبەشیانن لەوەی ئەوانی تێدان لەبەرئەوە خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ﴾ لە تاواندا وەك لە فەرموودەدا هاتووە: "من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فلا يجلس على مائدة يدار عليها الخمر" هەر کەس باوەڕی بە خوا و ڕۆژی دوایی هەیە نابێ دانیشێ لەسەر خوانێك عارەقی تێدا بگێڕرێ.

ئەوەی ئیحالە دەکرێتە سەری لەم ئایەتەدا لە قەدەغەکردن دەربارەی ئەوە فەرمایشتەکەی خوایە کە سورەتی (الانعام)دا هاتووە کە مەکیە ﴿وَإِذَا رَأَيْتَ الَّذِينَ يَخُوضُونَ فِي آيَاتِنَا فَأَعْرِضْ عَنْهُمْ﴾ [الأنعام: ٦٨] موقاتیلی کوڕی حەیان وتوویەتی: ئەو ئایەتەی لە سورەتی ئەنعام دا هاتووە نەسخ کراوەتەوە واتە ئایەتی: ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِثْلُهُمْ﴾ سڕاوەتەوە بە ئایەتی: ﴿وَمَا عَلَى الَّذِينَ يَتَّقُونَ مِنْ حِسَابِهِمْ مِنْ شَيْءٍ وَلَٰكِنْ ذِكْرَىٰ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ﴾ [الأنعام: ٦٩].

کە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ جَامِعُ الْمُنَافِقِينَ وَالْكَافِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا﴾ واتە: وەك هاوبەشیان بوون لە بێ باوەڕیدا بەوشێوەیە خوای گەورە مانەوەیان بۆ هەمیشە لە ئاگردا هاوبەش دەکات یان کۆتایان دەکاتەوە لە خانەی سزاو ئازاردان و پەیوەندی کردن و خواردنەوەی گەرم و کێم و جەراعەت کۆیان دەکاتەوە نەك لە شوێنی خۆشدا.

﴿ٱلَّذِينَ يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ
وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ
ٱلْمُؤْمِنِينَ ۚ فَٱللَّهُ يَحْكُمُ بَيْنَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَٰفِرِينَ عَلَى
ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا ﴿١٤١﴾﴾

واتە: ئەوانە لێتان دەخەفتێن، یا هەرگا خوا ئێوەی سەرخست ئەڵێن ئێمەش هەر لەگەڵ ئێوەدا نەبووین؟ خۆئەگەر خوانەناسانیش لە بەشێکدا باو خۆشتر بوون، پێتان ئەڵێن هونەر هونەری ئێمە بوو بەدڵ لەگەڵتان بووین، ئێمە نەتهێشت باوەڕداران بتانگەنێ و دەڕۆستوبێن خودا دوایی و ڕۆژی سەلا بە کاروبارتان ڕادەگا، خودا هەرگیز هیچ ڕێگایەك نادا بە خودانەناسان کە دژی باوەڕداران بێ.

خوای گەورە دەربارەی مونافیقەکان ڕای دەگەیەنێ کە ئەوان چاوەڕوانن خراپە ڕوو بکاتە باوەڕدارەکان واتە چاوەڕوانن کە دەوڵەتەکەیان نەمێنێ و بێ باوەڕی سەرکەوێ بەسەریانداو نەتەوەکەیان نەمێنێ، ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ واتە سەرکەوتن و پشتگیری و زەفەربردن و دەستکەوتی جەنگ بەدەست هێنان ﴿قَالُوٓاْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ واتە ئەو قسەیەیان وتەوە پێ دەڵێن: ﴿وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ﴾ واتە سەرەیان بێت سەرکەون بەسەر باوەڕدارەکاندا هەندێ جار وەك لە جەنگی ئوحوددا ڕوویدا، چونکە نێردراوەکانی تووشی بەڵا دەبن، بەڵام پاشەڕۆژ هەر بۆ ئەوانە.

﴿قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە لە ناوەرۆکدا یارمەتیمان دان.

سوودی وتوویەتی: ﴿نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ﴾ واتە سەردەکەوین بە سەرتاندا وەك فەرمایشتی: ﴿ٱسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ ٱلشَّيْطَٰنُ﴾ [المجادلة: ١٩] ئەوەش تەوەدودێکەوە لەوانەوە بۆ ئەوان، چونکە ئەوانە مەرایی بۆ ئەمان دەکەن بۆ ئەوە لە شەڕیان ئەمین بن و چارەیان هەبێت لایان، ئەوەش بە هۆی لاوازی باوەڕیانەوەیە.

خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ بەوەی کە لە ئێوەی دەزانێ ئەی موونافیقەکان لە دەروونە گەندەڵەکەتان غەرامە بدەن کە حوکمەکانی شەریعەت بەسەرتاندا ئەسەپێ لە ژیانی دونیادا بەپێی ئەو حیکمەتەی کە هەیەتی لەوبارەیەوە، جا ڕۆژی قیامەت ڕواڵەتییەکانیان سوودی نابێت بۆتان، بەڵکو ئەوە ڕۆژێکە نهێنییەکان دەردەخرێن و ئەوەی لە سنگدایە بەدی دێت.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا﴾.

عەبدوڕەزاق وتوویەتی: لە سەبیعی کەلبییەوە هاتووە وتوویەتی: پیاوێك هاتە لای عەلی کوڕی ئەبی تالیب وتی: ﴿وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا﴾. چۆنە؟ عەلیش وتی: لێم نزیك بەرەوە، لێم نزیك بەرەوە، ﴿فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا﴾.

هەر بەو شێوەیە جورەیج لە عەتای خوراسانییەوە لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە ﴿وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا﴾، وتوویەتی: ئەوە ڕۆژی قیامەتە.

بەوشێوەیە سوودی لە ئەبی مالیکی ئەشجەعییەوە دەگێڕێتەوە واتە ڕۆژی قیامەت. سوودی وتوویەتی: (سبیلا) واتە بەڵگە. لەوانەیە واتاکەی ئەوەبێ کە ڕێگای نەکردووەتەوە بۆ بێ باوەڕەکان سەرکەون بەسەر باوەڕدارەکاندا و عاقیبەت بە بەندە لەخواترسەکان لە دونیا و ڕۆژی دواییدا وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ [غافر: ٥١]. لەسەر ئەوە، ئەبێت بە ڕەتدانەوەی موونافیقەکان لەوانەدا بە هیوابوون و چاوەڕوانی بوون لە نەمانی دەوڵەتی باوەڕدارەکان، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٞ يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ﴾ تادەگاتە فەرمایشتی: ﴿نَٰدِمِينَ﴾ [المائدة: ٥٢].

بەشی زۆر لە زانایان ئەوەیان کردووەتە بەڵگە لەسەر قەدەغەیی فرۆشتنی بەندەی موسڵمان بە بێباوەڕ، لەبەرئەوەی بوونە بەندە ئەبێتە هۆی زاڵ بوون بەسەریداو زەلیل کردنی، ئەوەی لە زانایان وتوویەتی: دروستە فرۆشتنی بەندەی باوەڕدار بە بێباوەڕ کە ئەتوانێ لە موڵکایەتییەکەی دەرچێ لەهەر

کاتێکدا بێت بەپێی فەرمایشی: ﴿وَلَن يَجْعَلَ ٱللَّهُ لِلْكَـٰفِرِينَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ سَبِيلًا﴾.

﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ وَإِذَا قَامُوٓا۟ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُوا۟
كُسَالَىٰ يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٤٢﴾ مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ
لَآ إِلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَـٰٓؤُلَآءِ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ﴿١٤٣﴾﴾

واتە: بە دڵ دەغەڵانی دووڕوو دەیانەوێ خوا فریدەن، کەچی خوا دەیانخەڵەتێنێ، ئەگەر دەچن نوێژ دابەستن بە تەوەزەلی هەڵدەستن، رووبینی لە خەڵك دەکەن، کەمیان نەبێ کەمتر ناوی خوداش دێنن واس واسین، لەم نێوانەدا دوودڵن بچنە لای ئەمان یا خۆیان بدەنە لای ئەوان، کەسێك خوا رێی لێ بگۆڕێت تۆ ناتوانی هیچ رێگەیەکی نیشان بدەیت

لەسەرەتای سورەتی (البقرە)دا ئایەتی: ﴿يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ [البقرة: ٩]، هاتووە، لێرەشدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلْمُنَـٰفِقِينَ يُخَـٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ﴾ گومانی تێدا نییە خوا فریو نادرێ، چونکە ئەو ئاگاداری نهێنییەکان و چەمیرەکانە، بەڵام مونافیقەکان لە نەزانییان و کەمی زانستیی و ئاوەزیان وا ئەزانن کە کارویاریان وەك لەناو خەڵکدا رەواجی پێ دراوە و حوکمەکانی شەریعەت بەسەریاندا ئەسەپێ، حوکمەکەشیان بەو شێوەیە دەبێ ڕۆژی قیامەت لای خوا و کارویاریان لای خوا رەواجی پێ دەدرێ وەك خوای گەورە دەربارەیان ڕای دەگەیەنێ کە ڕۆژی قیامەت سوێند دەخرن بۆ خوا کە ئەوان راستاڵی و راستی بوون و وا ئەزانن ئەوە سوودی دەبێ بۆیان لای خوا وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ يَبْعَثُهُمُ ٱللَّهُ جَمِيعًا فَيَحْلِفُونَ لَهُۥ كَمَا يَحْلِفُونَ لَكُمْ﴾ [المجادلة: ١٨] کە دەفەرموێت ﴿وَهُوَ خَـٰدِعُهُمْ﴾ واتە خوایە کە مۆڵەتیان دەدا بمێننەوە لە سەر توغیان و گومراییان و دووریان دەخاتەوە لە هەق و گەیشتنیان پێی لە دونیادا بەشێوەیەش لە ڕۆژی قیامەتدا وەك خوای بەرز دەفەرموێت: ﴿يَوْمَ يَقُولُ ٱلْمُنَـٰفِقُونَ وَٱلْمُنَـٰفِقَـٰتُ لِلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱنظُرُونَا نَقْتَبِسْ مِن نُّورِكُمْ﴾ إلـى قـولـه: ﴿وَبِئْسَ ٱلْمَصِيرُ﴾ [الحديد: ١٣ ـ ١٥]..

لە فەرموودەشدا هاتووە کە: "من سمع سمع الله به ومن رايا رايا الله به" واتە: هەر کەس بۆ ریایی و سومعە کار بکات خوا ئابڕووی دەبات.

لە فەرموودەیەكی تردا هاتووە: " إن الله يأمر بالعبد إلى الجنة فيما يبدو للناس، ويعدل به إلى النار" واتە: خوا فەرمان دەكات بە بەندەكەی بچێتە بەهەشتەوە بە وانەی بۆ خەڵكیان دەرخستووە، بەڵام هەر بەوانە دەگێڕێتەوە بۆ ناو ئاگر، خوا پەنامان بدات لەوە.

كــە دەفــەرمــووێــت: ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾....، ئــەوە سیفەتی مونافیقەكانە لە بەڕێزترین كردەوە و چاكترین و خێرترینیاندا كە نوێژە كاتێ بۆی هەڵسن بەتەمەڵییەوە هەڵدەستن، چونكە نە نیازیان هەیە دەربارەی نە باوەڕیان هەیە پێی و نەترسیان هەیە. وە نە واتاكەشی تێدەگەن.

وەك ئیبنو مەردەویە دەگێڕێتەوە لە ئیبنو عەباسەوە كە وتوویەتی: پیاو حەز ناكات هەڵسێت بۆ نوێژ لەبەر ماندوویێتی، بەڵام كاتێ هەڵدەستێ بۆی رووی دەكرێتەوە و زۆر رەغبەتی لێی هەیە و زۆر دڵشادە پێی، چونكە ئەو كەسە قسە لەگەڵ خوا دەكات و خوایش بەرامبەرێتی لێی دەبوورێ و وەڵامی دەداتەوە كاتێ داوای لێ دەكات، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾.

كە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾ ئەوە سیفەتە رواڵەتییەكانیانە وەك دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَأْتُونَ ٱلصَّلَوٰةَ إِلَّا وَهُمْ كُسَالَىٰ﴾ [التوبة: ٥٤].

پاشان خوا سیفەتی ناوەكیان باس دەكات، دەفەرمووێت: ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ﴾ واتە ئیخلاصیان نییە كە بۆ خوای بكەن، بەڵكو بۆ خەڵكە دەكەن، بۆ خۆپاراستن لێیان. لەبەرئەوە زۆر لە نوێژەكان دوا دەدەكەون بەتایبەتی ئەو نوێژانەی كەس چاوی پێیان ناكەوێ وەك نوێژی بەیانیان و خەوتنان، وەك لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە كە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "أثقل الصلاة على المنافقين صلاة العشا و صلاة الفجر، ولو يعلمون ما فيهما لأتوهما ولو حَبْوًا، ولقد هممت أن آمر بالصلاة فتقام، ثم آمر رجلا فيصلي بالناس، ثم أنطلق معي برجال، معهم حُزَم من حطب إلى قوم لا يشهدون الصلاة، فأحرّق عليهم بيوتهم بالنار". واتە: گرانترین نوێژ لای مونافیقەكان نوێژی عیشا و نوێژی بەیانیە، ئەگەر ئەیانزانی چەندە خێریان

تێدایە بە گاگۆڵکێش بوایە دەچوون بۆیان، بێ سۆ بە دڵما دێت کە فەرمان بکەم قامەت بکرێ بۆ نوێژ و فەرمان بگەم بە یەکێك نوێژەکەیان بۆ بکات، پاشان من و چەند پیاوێك کە یەکی باوەشێ داریان پێی بێ بچین بۆ ئەو ماڵانەی کە پیاوەکانیان نەهاتوون بۆ نوێژ بە ئاگر ماڵەکانیان بەسەردا بسووتێنم. وە لە ریوایەتێکی تردا هاتووە فەرموویەتی: "والذي نفسي بيده، لو علم أحدهم أنه يجد عَرْقًا سمينًا أو مَرْمَاتين حسنتين، لشهد الصلاة، ولولا ما فى البيوت من النسا و والذرية لحرقت عليهم بيوتهم بالنار". واتە: بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەگەر ئەیانزانی رانەگۆشتێکی قەڵەویان دەست دەکەوێت یان دەست و پێیەکی چاك، ئەهاتن بۆ نوێژ، ئەگەر لە ماڵەکاندا ژن و منداڵ نەبوایە ماڵەکانیانم ئەسووتاند بەسەریاندا.

فەرموودەڕەوان ئەبو یەعلا وتوویەتی: لە عەبدوڵڵاوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من أحْسَنَ الصلاة حيث يراه الناس، وأساءها حيث يخلو، فتلك استهانة، استهان بها ربه عز وجل" واتە: هەر کەس لەبەر چاوی خەڵك بە چاکی نوێژەکەی بکات و کاتێ کەس چاوی لێی نییە بە خراپی بیکات ئەوە ئیهانەیە کە پەروەردگاری پێ ئیهانە دەکات.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا يَذْكُرُونَ اللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە لە نوێژەکانیاندا ملکەچ نابن و نازانن چی دەڵێن، بەڵکو لە نوێژەکانیاندا سەهو دەکەن و بێ ئاگان لەو خێرەی لێیان پشت هەڵدەکەن.

ئیمام مالیك وتوویەتی: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە هاتووە وتوویەتی: "تلك صلاة المنافق، تلك صلاة المنافق، تلك صلاة المنافق: يجلس يَرْقُب الشمس، حتى إذا كانت بين قَرْنَي الشيطان، قام فَنَقَر أربعا لا يذكر الله فيها إلا قليلا" ئەوە نوێژی مونافیقە، ئەوە نوێژی مونافیقە، ئەوە نوێژی مونافیقە، کەسێك دانیشێ چاودێری ڕۆژ بکات هەتا دەگات نێوان دوو شاخەی شەیتان ئینجا هەڵدەستێ چوار دەنوك دەدات بە زەویدا کەمێك نەبێت یادی خوای تێدا ناکات.

کە دەفەرمووێت: ﴿مُّذَبْذَبِينَ بَيْنَ ذَٰلِكَ لَا إِلَىٰ هَٰؤُلَاءِ وَلَا إِلَىٰ هَٰؤُلَاءِ﴾ واتە

مونافیقەکان سەرلێشێواون لە نێوان باوەڕ و بێ باوەڕیدا، لەگەڵ باوەڕدارەکانیشدا نین، نە بەڕواڵەت نە بە دڵ، بەڵکو بە ڕواڵەت لەگەڵ باوەڕدارانداىن و بە دڵ لەگەڵ بێ باوەڕاندا، هەمیشانە شك و گومان دایاندەگرێ جارێك بە لای ئەواندا و جارێك بە لای ئەماندا ﴿كُلَّمَآ أَضَآءَ لَهُم مَّشَوۡاْ فِيهِ وَإِذَآ أَظۡلَمَ عَلَيۡهِمۡ قَامُواْۚ﴾ [البقرة: ٢٠]. وە موجاهدی وتوویەتی: ﴿مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ﴾ واتە هاوەڵانی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت)، ﴿وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ﴾ واتە: جولەکە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئیبنو عومەرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "مثل المنافق كمثل الشاة العائرة بين الغنمين، تَعِيرُ إلى هذه مرة، وإلى هذه مرة، ولا تدرى أيتهما تتبع". (تفرد به مسلم) واتە: مونافیق وەك مەڕێكی سەرلێشێواو وایە لە نێوان دوو مێگەلدا، جارێك ڕادەکات بۆ لای ئەویان، جارێك ئەمیان و نازانێ شوێن کامیان بکەوێ.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: شوعبە لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی: ﴿مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ﴾ وتوویەتی: باوەڕداری خاوێن نین، نەهاوبەشدانەری ئاشکران. وتوویەتی: بۆیان باس کردووین کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) کە نموونەی دەربارەی باوەڕدار و مونافیق و بێ باوەڕ هێناوەتەوە فەرموویەتی: ئەو سیانە وەك سێ کەس وان کە چوونە ڕووبارێك، باوەڕدارەکە ئەکەوێتە ناوی و ئەپەڕێتەوە، پاشان مونافیقەکە ئەچێتە ناوی خەریکە بگاتە باوەڕدارەکە، خوانەناسەکە بانگی دەکات بگەڕێرەوە بۆ لای من ئەترسم بخنکێی، وە باوەڕدارەکە بانگی دەکات وەرە بۆ لای من، ئەوەی من لامە لای ئەو نییە، بەوشێوەیە مونافیقەکە سەرگەردان دەبێت لە نێوانیاندا هەتا ئاو دێت بەسەریداو نوقیمی دەکات. بەراستی مونافیق بەردەوام لە شك و گوماندا دەبێت هەتا مردن ڕێی پێ دەگرێ هەر بەو شێوەیە دەبێت.

لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلٗا﴾ واتە کەسێك لە ڕێگەی ڕاستی لایدا ﴿مَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَا هَادِيَ لَهُۥۚ﴾ [الأعراف: ١٨٦] کەس نییە ڕزگاری بکات لەوەی تێیدا، چونکە کەس نییە

تەعقیبی حوکمەکەی بکات و هەرچی بکات لێی ناپرسرێتەوە، بەڵکو بەندەکانی لێپرسینەوەیان لەسەرە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَۚ
أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُواْ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾ إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى
ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ
وَأَصْلَحُواْ وَٱعْتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُواْ دِينَهُمْ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَۖ
وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾ مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ
إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْۚ وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾﴾

واتە: ئەی گەلی خاوەن باوەڕان بەدەر لە خاوەن باوەڕان مەبنە دۆستی خوانەناسان، ئاخۆ ئێوە دەتانەوێ بەڵگەیەکی بە ئاشکرای دژی خۆتان بدەن بە خوا؟! دیارە ئەو کەسانەی دووڕوون وان لە کاتی هەرەژێرەوەی دۆزەخ، تۆ ناتوانی یاریدەریان بۆ پەیداکەی، مەگەین ئەو کەسانەی دووڕوون دەست لە دووڕوویی هەڵگرن و تەواو پەشیمان ببنەوە و ڕێگەی چاکە بگرنە بەر و خۆیان بە خودا بسپێرن و بە دڵی پاك ببنە دینداری بەراستی ئەوسا ئەویش وێڕای باوەڕداران دێن و لە دوارۆژدا خودا بە باوەڕدارەکان پاداشتی زۆر گرنگ دەدات. ئەگەر ئێوە بڕواتان بە خودا هەبێ و چاکەی ئەوتان لەبەرچاودا بێ خوا چە کاری بە ئازاری ئێوە داوە؟ خودا سوپاسی پێزانان قبوڵ دەکات و لە هەموو شت ئاگادارە.

خوای گەورە مەنعی بەندە باوەڕدارەکانی دەکات کە خوانەناسان بکەنە دۆستی خۆیان لە جیاتی باوەڕداران، واتە ببنە هاوەڵیان و باوەڕیان پێ بکەن و ئامۆژگارییان لێوەرگرن و بەدڵ خۆشیان بون و بارودۆخی باوەڕدارەکانیان بۆ دەربخەن، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُواْ مِنْهُمْ تُقَىٰةً وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ﴾ [آل عمران: ٢٨] واتە: خوا لە سزاکەی ئەتانترسێنێ کاتێ ئەوەی قەدەغەی کردووە بیکەن، لەبەرئەوە لێرەدا دەفەرموێت: ﴿أَتُرِيدُونَ أَن

﴿تَجْعَلُوا لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَانًا مُّبِينًا﴾ واتە حوجە بەسەرتانەوە دەربارەی سزادانی ئێوە لەلایەن خۆیەوە.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە دەربارەی ﴿سُلْطَانًا مُّبِينًا﴾ وتوویەتی: هەموو وشەیەکی ﴿سُلْطَانًا﴾ لە قورئاندا مانای بەڵگەیە، ئەوەش ئیسنادێکی ڕاستە.

هەر بەو شێوەیە موجاهید و عەکریمە و سەعیدی کوڕی جوبەیر و موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی و زەحاك و سوودی و نەزری کوڕی عەرەبی ڕافەیان کردووە.

پاشان خوای بەرز پێمان ڕادەگەیەنێ: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ واتە ڕۆژی قیامەت لە قاتی هەرەژێرەوەی دۆزەخدان لەسەر بێباوەڕییەکەیان.

والبی وتوویەتی: ئیبنو عەباسە دەربارەی: ﴿فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ وتوویەتی: واتە لە ژێری ژێرەوەی ئاگردان، ئاگریش ماوەی هەیە وەك بەهەشتن پلەی هەیە.

سوفیانی سەوری لە عاصمەوە دەگێڕێتەوە کە زەکوان لە ئەبی ساڵحەوە دەگێڕێتەوە کە ئەبی هورەیرە دەربارەی: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ وتوویەتی: لە تابوتێکدا دەبن کە دەلەرزێنرێ بەسەریانەوە.

وە لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ وتوویەتی: ﴿الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ﴾ چەندەها خانوون دەرگایان هەیە لەسەریان دادەخرێ و لەسەروو ژێرەوە ئاگر دەدرێن.

ئیبنو جەریر لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الْأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ وتووەیتی: لەناو تابووتدا دەبن کە سەرو ژێری داخراوە لە ئاگر.

ئیبنو ئەبی حاتەم دەگێڕێتەوە کە لە ئیبنو مەسعودیان پرسی دەربارەی مونافیقەکان وتی: ئەخرێنە ناو تابووتی ئاگرەوە لەسەریان قەپات دەکرێ لەو خانەی ژێرەوەی جەهەنمدا.

﴿وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا﴾ کەسێك نییە رزگاریان بکات لەوەی تێیدان و لەو سزا بەژانە دەریان بهێنێ.

پاشان خوای بەرز ڕایدەگەیەنێ هەر کەس لەوانە تۆبە بکات لە دونیادا تۆبەکەی قبوڵ دەکات کاتێ بە دڵ و بە پاکی تۆبە بکات و کردەوەکانی چاك بکات و پەنا ببات بە خوا لە هەموو کاروبارێکیدا، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِلَّا الَّذِينَ تَابُوا وَأَصْلَحُوا وَاعْتَصَمُوا بِاللَّهِ وَأَخْلَصُوا دِينَهُمْ لِلَّهِ﴾ واتە: ریاییەکەیان گۆڕی بە ئیخلاص، ئەو کاتە کردەوەی چاك سوودی دەبێ بۆیان با کەمیش بێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە موعازی کوڕی جەبەلەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "اخلص دينك يكفك قليل من العمل" واتە: بەس ئاینەکەت خاوێن بکە کردەوەی کەمت بەسە.

﴿فَأُولَٰئِكَ مَعَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ واتە لەناو ئەوانەدا دەبێ ڕۆژی قیامەت ﴿وَسَوْفَ يُؤْتِ اللَّهُ الْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ پاشان خوای گەورە ڕایدەگەیەنێ کە پێویستی بە هیچ کەسێك نییەو بەندەکانی بە تاوانەکانیان سزا دەدات و دەفەرموێت: ﴿مَّا يَفْعَلُ اللَّهُ بِعَذَابِكُمْ إِن شَكَرْتُمْ وَآمَنتُمْ﴾ واتە کردەوەکانتان چاك کرد و باوەڕتان بە خوا و بە نێردراوەکەی هێنا ﴿وَكَانَ اللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا﴾، واتە هەر کەس ستایش بکات ئەویش ستایشی دەکات و هەر کەس بە دڵ باوەڕبهێنێ خوا پێی ئەزانێ و پاداشتی دەداتەوە لەسەر ئەوە بە زۆرترین پاداشت.

﴿لَّا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ ۚ وَكَانَ اللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾ إِن تُبْدُوا خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ أَوْ تَعْفُوا عَن سُوءٍ فَإِنَّ اللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾﴾

واتە: خودا پێی خۆش نییە هیچ کەس بە دەنگی بەرز قسەی ناحەز بدرکێنێ مەگین غەدری لێ کرابێ، خودا بیسەرو زانایە. ئەگەر ئێوە چاکە بکەن ئەو چاکەیە و ئاشکرا بێ یان نەهێنی، یان لە کارێکی نالەبار چاوپۆشن، خودا هەمیشە توانایە بۆ عافوکردن.

ئیبنو ئەبی تەڵحە بە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: واتە خوا پێی خۆش نییە کەس دوعا لە کەس بکات، مەگەر ستەمی لێ کرابێ، ئەو کەسە ڕێی پێ دراوە کە دوعا لەو کەسە بکات ستەمی لێ کردووە ئەوەشە کە دەفەرمووێت: ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ ئەگەر ئارامیش بگرێ خێرترە بۆی.

ئەبو داوود وتوویەتی: لە عائیشەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: شتێکم لێ دزرا دەستم کرد بە دوعا کردن لێی، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "لا تستنجی عنه" دوعای لێ مەکە. حەسەنی بەصری وتوویەتی: نابێ دوعای لێ بکات، بەڵکو ئەبێ بڵێ: خوایە یارمەتیم بدە بیدۆزمەوە و هەقی منی لێ بسێنە. لە ڕیوایەتێکدا لەوەوە هاتووە وتوویەتی: ڕێی پێدراوە دوعا لەو کەسە بکات کە ستەمی لێ کردووە بێ ئەوەی زیادەڕەوی بکات.

عەبدلکەریمی کوڕی مالیکی جەزری دەربارەی ئەم ئایەتە وتوویەتی: ئەو پیاوێکە جوێنت پێ دەدا تۆش جوێنی پێ دەدەیتەوە، بەڵام ئەگەر تاوانێکی دایە پاڵت تۆ تاوانی نادەیتە پاڵ.

ئەبو داود وتوویەتی: لە ئەبی هوڕەیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "المُسْتَبَّانِ ما قالا فعلى البادئ منهما، ما لم يعتد المظلوم" ئەو دوانەی کە جوێن بەیەك دەدەن هەرچییان وت لەسەر ئەوەیانە کە لەسەرەتاوە جوێنەکەی داوە بە مەرجێ ستەم لێکراو زیادەڕەوی نەکات.

عەبدوڕەزاق وتوویەتی: موسەنای کوڕی سەباح لە موجاهیدەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی: ﴿لَّا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ وتوویەتی: پیاوێك پیاوێك بکاتە میوانی خۆی، بەڵام مافی میواندارێتی پێ نەدا، کاتێ بچینە دەر بە خەڵك بڵێت: فلان کەس کردمی بە میوانی خۆی، بەڵام مافی میواندارێتی نەدامێ وتوویەتی: ئەوەیە: ﴿الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ هەتا ئەوەی تریان مافی میواندارێتی ئەداتەوە.

ئیبنو ئیسحاق وتوویەتی: لە ئیبنو ئەبی نەجیحەوە لە موجاهیدەوە هاتووە دەربارەی ﴿لَّا يُحِبُّ اللَّهُ الْجَهْرَ بِالسُّوءِ مِنَ الْقَوْلِ إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ وتوویەتی: ئەوە

پیاوێکه ئەبێته میوانی پیاوێك به چاکی میوانداریتی ناکات، ئەویش دێتەدەر دەڵێت: بەخراپی مامەڵەی لەگەڵ کردم و چاك نەبوو لەگەڵما.

کۆمەڵی زانایانی فەرمووده جگه له نەسائی و ترمزی له عوقبەی کوڕی عامیرەوه دەگێڕنەوه وتوویەتی: وتمان ئەی نێردراوی خوا تۆ بەم لاولادا دەمان نێری، جاری وا هەیه لای کۆمەڵێك دادەبەزین میوانداریمان ناکەن تۆ چی دەڵێیت لەوبارەیەوه؟ فەرمووی: کاتێ لای هۆزێك دادەبەزن هەرچی بۆ میوان پێویسته پێیان دا لێیان قبوڵ بکەن، بەڵام ئەگەر ئەوەیان نەکرد به زۆر ئەو مافەی بۆ میوان پێویسته لێیان بسەنن".

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: له میقدادی کوڕی ئەبی کەریمەوه هاتووه که پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "هەر موسڵمانێك بووه میوانی هۆزێك بێبەشیان کرد له مافی میوان لەسەر هەموو موسڵمانێك پێویسته یارمەتی بدات هەتا بەشی شەوەکەی له دەغل و دانەکەی هەڵدەگرێ". (تفرد به احمد من هذا الوجه).

ئەحمەد دووباره وتوویەتی: له میقدادی کوڕی ئەبی کەریمەوه دەگێڕنەوه که گوێبیستی (درودی خوای لێ بێت) بووه فەرموویەتی: "ليلة الضيف واجبة على كل مسلم، فإن أصبح بفِنَائه محرومًا كان دَيْنًا له عليه، إن شا و اقتضاه وإن شا و ترکه". واته: شەوی میوانداریتی پێویسته لەسەر هەموو مسوڵمانێك ئەگەر کەسێك ڕۆژی کردەوه له ماڵی کەسێکدا هیچیان پێ نەدا ئەو خاوەن ماڵه قەرزدار دەبێت، ئەگەر میوانەکه بیەوێ ئەو قەرزەی لێ دەسێنێتەوە، ئەگەر بیەوێت وازی لێ دێنێ.

بەپێی ئەم فەرموودانەو شێوەکانیان ئەحمەد و غەیری ئەویش بۆ ئەوه چوون که خزمەتی میوان کردن واجبه، ئەبو بەکری بەزار له ئەبی هورەیرەوه دەگێڕێتەوه وتوویەتی: پیاوێك هاته لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وتی: دراوسێیەکم هەیه ئازارم دەدا، پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: کەل و پەلی ماڵەکەت دەربێنه فڕێی دە سەر ڕێگا، پیاوکەش کەلوپەلی ماڵەکەی فڕێدایه سەر ڕێگاکه، هەر کەس بەلایدا تێدەپەڕی پێیدەوت: ئەوه چیته؟ ئەویش دەیوت دراوسێکەم ئازارم دەدات، ئەویش دەیوت: نەفرینی خوای لێ

بیٚ و خوا ڕسوای بکات، وتوویەتی: دراوسێکەی هات بۆ لای وتی: کەلوپەلەکەت بخەرەوە ماڵەکەت سوێند بە خوا ئیتر هەرگیز ئازارت پیٚ ناگەیەنم.

کە دەفەرمووێت: ﴿إِن تُبۡدُواْ خَيۡرًا أَوۡ تُخۡفُوهُ أَوۡ تَعۡفُواْ عَن سُوٓءٖ فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا ١٤٩﴾، واتە: ئەی خەڵکینە ئەگەر خێرەکانتان دەربخەن یان بیشارنەوە، یان لەوانە ببورن کە خراپە دەکەن بەرامبەرت دەبنە هۆی نزیك بوونەوەتان لە خواوە و پاداشتی زۆرتان دەداتەوە، چونکە لە سیفەتەکانی خوا ئەوەیە کە لە بەندەکانی دەبووریٚ لەگەڵ ئەوەی توانای هەیە کە سزایان بدات لەسەری، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوّٗا قَدِيرًا ١٤٩﴾، لەبەرئەوە لە بۆماوەیەکدا هاتووە کە هەڵگرانی عەرش تەسبیحاتی خوا دەکەن هەندێکیان دەڵێن: پاك و بێگەردی بۆ تۆ خوایە لەسەر حیلمەکەت دوای زانستیەکەت. وە هەندێکیان دەڵێن: پاك و بێگەردی بۆ تۆیە لەسەر لێبوردنەکەت دوای تواناکەت" وە لە فەرموودەی سازەواردا هاتووە: "ما نقص مال من صدقة، ولا زاد الله عبدا بعفو إلا عزًّا، ومن تواضع لله رفعه الله"، واتە: هەرگیز ماڵ بە خێر لێکردن کەم ناکات، بەندەی خواش بە لێبوردن لە کەسێکی تر، خوا عیزەتی بۆ زیاد دەکات، هەر کەس خۆی بە کەم زانی لەبەر خوا، خوا بەرزی دەکاتەوە.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ١٥٠ أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ١٥١ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٥٢﴾

واتە: ئەو کەسانەش دڵیان دژی خوا و پێغەمبەرەکانێتی و دیارە دەیانەویٚ لە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانیدا فەرقیٚ دانین، دەڵێن: ئێمە باوەڕ بە هەندێکیان دەکەین و هەندێکیشیان بە جێگەی باوەڕ نازانین، ئەیانەویٚ لەم

نێوانە ڕێگەیەك بۆ خۆ پەیدا بکەن، بەراستی ئەمانە خودا نەناسن و ئێمە بۆ ئەو خوانەناسانە ئازاری ئابڕوویەرمان ئامادەیە، ئەوانەش کە باوەڕیان هەیە بە خوا و پێغەمبەرەکانی و لەناویاندا جیاوازی دانانێن کە لە دواڕۆژدا پاداشتیان دەداتێ و لە گوناهانیان دەبورێ و دلۆڤانە.

خوای گەورە هەڕەشە لە جولەکە و گاورەکان دەکات کاتێ جیاوازی دەدانێن لە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانیدا، دەربارەی باوەڕبوون بە هەندێکیان و بێ باوەڕی کردن بە هەندێکیان بە ئارەزوو و عادەت و بەوەی ڕاهاتوون لەسەری باوو باپیرانیانەوە بێ ئەوەی بەڵگەیەکیان هەبێ بۆ ئەوەی بەرەو ئەوەیان ببات، بەراستی ئەوانە هیچ ڕێگایەکیان نییە بۆ ئەوە، بەڵکو بە هەوا و هەوەسی خۆیانەوە. جولەکە بەرنەفرینی خوا بکەون باوەڕیان بە پێغەمبەرانی تر هەیە جگە لە عیسا و موحەممەد، سڵاوی خوایان لێ بێ، گاورەکان باوەڕیان بە هەموو پێغەمبەرەکان هەیە جگە لە دواپێغەمبەرو بەرێزترینیان و سامیرەکان باوەڕیان بە هیچ پێغەمبەرێك نییە، دوای یوشع جێنشینی موسا، مەجوسەکان دەوترێ کە باوەڕیان بە پێغەمبەری خۆیان هەیە کە ناوی زەردەشتە، پاشان شەرعەکەیان بە درۆ دانا خوا لە نێوانیاندا هەڵی گرت، ئیتر خوا دەزانێ.

مەبەست ئەوەیە هەر کەس بێ باوەڕی بکات بە یەکێ لە پێغەمبەرەکان ئەوە بە هەموو پێغەمبەرەکانی تر بێ باوەڕییان کردووە، باوەڕبوون بە هەموو پێغەمبەرێك بەپێی شەرع واجبە. لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكۡفُرُونَ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ بەخواو نێردراوەکانی ئەو مۆرەیان پێدا دەنێت کە خوا و پێغەمبەرەکانی ناناسن و ئەیانەوێت جیاوازی بخەنە نێوان خوا و پێغەمبەرەکانی لە باوەڕدا ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ واتە لە ئیمانـدا، ﴿وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا﴾ واتە: ڕێگایەك، پاشان خوای بەرز ڕایدەگەیەنێت دەربارەیان و فەرموویەتی: ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ﴾ واتە بێباوەڕییان موحەقەقە بۆ ئەوانەی دەڵێن باوەڕمان پێی هەیە، چونکە ئەوە شەرعی نییە، ئەگەر باوەڕدارەکان باوەڕیان پێی هەبێت، لەبەرئەوەی نێردراوی خوایە، ئەوە

باوەڕیشیان بە هاوتاکەی هەیە و بەوەی زۆر بەڵگەیەکی ڕۆشنە و بەهێزترین سەلماندنە لەوەوە.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ عَذَابًا مُّهِينًا﴾ واتە وەك چۆن ئیهانەی ئەوەیان کردووە کە باوەڕیان پێی نییە، یان لەبەرئەوەی باوەڕیان بەوە نییە کە پێی هاتووە لە خواوەو پشتیان تێ کردووە و بەرەو کۆکردنەوەی شتە گەندەڵەکانی دونیا کە پێویستییان پێی نییە، یان بەبێ باوەڕییان پێی دوای ئەوەی کە نێردراوی خوایە وەك زۆر لە حیبرەکانی جولەکە دەیان کرد لە سەردەمی پێغەمبەردا، بەشێوەیەك حەسوودیان پێ دەبرد لەسەر ئەوانەی بۆی هاتبوون لە خواوە هاتن پێچەوانەیان جولانەوە و بە درۆیان دائەنا و دژایەتییان دەکرد و دەجەنگان لە دژی، خوای گەورەش زەلیلی دونیای سەپاند بەسەریاندا و گەیشتوو بە زەلیلی ڕۆژی دوایی ﴿وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ وَٱلْمَسْكَنَةُ وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٦١] لە دونیاو ئاخیرەتدا.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمْ يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ أَحَدٍ مِّنْهُمْ﴾ مەبەستی لەوە نەتەوەی موحەممەدە (دروودی خوای لێ بێت)، چونکە ئەوان باوەڕیان بە هەموو ئەو کتێبانە هەیە کە خوا ناردوویەتییە خوارەوە و بە هەموو ئەو نێردراوانەی خوا ناردوونی وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ءَامَنَ ٱلرَّسُولُ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِۦ وَٱلْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ [البقرة: ٢٨٥]، پاشان خوای بەرز ڕایدەگەیەنێت بەوەی کە بۆی ئامادەکردوون پاداشتێکی زۆرو گەورە و بەخششێکی جوانم، فەرموویەتی: ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ سَوْفَ يُؤْتِيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾ لەسەر ئەوە باوەڕیان بە خوا و نێردراوەکانی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾ واتە لە تاوانەکانیان واتە ئەگەر هەندێکیان تاوانی هەبێت.

﴿يَسْـَٔلُكَ أَهْلُ ٱلْكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيْهِمْ كِتَٰبًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ ۚ فَقَدْ سَأَلُوا۟
مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ ۚ
ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا
مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾ وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟

ٱلْبَابَ سُجَّدًا وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟ فِى ٱلسَّبْتِ وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾

واته: ئەوانەی ئەهلی کتێبن، لێت دەخوازن کتێبێکیان بەتایبەتی لە ئاسمانەوە بۆ بێنی، هەر ئەوانە ئەوەی لە موسایان دەویست زۆر لەم کارەش گرنگتر بوو گوتیان: خوامان بە ئاشکرا پێ نیشان دە! لە سزای ئەم بەدفەڕییەدا بەر هەورەتریشقە کەوتن جارێکی تر پاش دیتنی گەلێك بەڵگەی بەئاشکرا چوون بوونە گوێرەکەپەرست چاوپۆشیمان لەوەشیان کرد، بەڵگەی دەسەڵاتداریمان دا بە مووسا.

بەهۆی پەیمانێ کە دایان چیای تورن لەسەروان لەسەر بەرزی ڕاگرت پێمان وتن بە سوژدەوە لەو دەرکەوە بچنە ژورێ و پێشمانوتن نابێ لە ڕۆژی شەممەدا دەستدرێژی و لێ رووبدات، پەیمانێکی پتویشمان لێ ستاندن.

موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی و سوودی و قەتادە وتوویانە: جولەکەکانی مەدینە داوایان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کرد کە خوا کتێبێکیان بۆ بنێرێتە خوارەوە وەك چۆن تەورات بە نووسراوی هاتە خوارەوە بۆ موسا (سڵاوی خوای لێ بێت).

ئیبنو جورەیج وتوویەتی: داوایان لێ کرد کە لە خواوە کتێبێك بە نووسراوی بۆ سەر فلان کەس و فلان کەس، بۆ ئەوەی باوەڕ بکەن بەوەی بۆ ئەوەی هاتووەتە خوارەوە، ئەوەش لە ڕووی عینادی و کوفرو ئیلحادەوە وتووە، وەك چۆن خوانەناسەکانی قورەیش لە پێش ئەواندا داوایان لە پێغەمبەر کرد کە لە سورەتی (سبحان)دا باس کراوە ﴿وَقَالُوا۟ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا﴾ [الإسراء: ٩٠] الآيات، لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ﴾، واتــــە بەهۆی ستەمکاری و دەستدرێژییانەوە و بەهۆی عیناد و بێ باوەڕییانەوە ئەوەش لە سورەتی (البقرە)دا ڕاڤەکراوە کە دەفەرموێت: ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَٰمُوسَىٰ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ نَرَى ٱللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ ٱلصَّٰعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ﴿٥٥﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰكُم مِّنۢ بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٥٦﴾﴾ [البقرة: ٥٥ ـ ٥٦].

کە دەفەرمووێت: ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُواْ ٱلْعِجْلَ مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ واتە دوای ئەوەی نیشانەی ئاشکرا و بەرزیان دەبینی لەگەڵ چەندەها بەڵگەی بەرز لەسەر دەستی موسادا (سلاوی خوای لێ بێت) لە شاری میصر و ئەوە بووە هۆی لەناوبردنی فیرعەونی دوژمنیان و هەموو سەربازەکانی لە بەحرەکەدا، کەمیان نەبێت لەئاوەکە تێنەپەڕین هەتا گەیشتنە نەتەوەیەك کە بە لای بتەکانیانەوە ئەمانەوەو ئەیانپەرستن بە موسایان وت: ﴿ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ﴾ [الأعراف: ١٣٨] پاشان خوای بەرز بەسەرهاتی پەرستنی گوێرەکەکەیان باس دەکات لە سورەتی (الاعراف)دا و لە سورەتی (طه)دا دوای ڕۆیشتنی موسا (سلاوی خوای لێ بێت) بۆ موناجات کردن لەگەڵ خوادا، پاشان کە گەڕایەوە ئەوە ڕوویدا بوو، خوای گەورە تۆبەکەیانی لەوەی دروستیان کردبوو و دایان هێنابوو ئەوەبوو کە ئەوانەی گوێرەکەکەیان نەپەرستبوو ئەوانە بکوژن کە پەرستبوویان وایان لێ هات یەکتریان دەکوشت، پاشان خوای گەورە زیندووی کردنەوە، وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ ۚ وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَٰنًا مُّبِينًا﴾. پاشان فەرموویەتی: ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَٰقِهِمْ﴾ ئەوەش کاتێ بوو کە ملیان نەدا پابەندی حوکمەکانی تەورات بن و لەناویانا کۆمەڵێك دەرکەوت ئیبای لەوە کرد کە موسا بۆی هێنابوون، خوای گەورەش شاخێکی بەرزکردەوە بەسەریاندا، پاشان پابەنکران ئەوانیش پابەندبوون و کڕنووشیان برد و سەیری لای سەرووی خۆیان دەکرد ئەترسان بکەوێت بەسەریاندا وەك خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ نَتَقْنَا ٱلْجَبَلَ فَوْقَهُمْ كَأَنَّهُۥ ظُلَّةٌ وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُۥ وَاقِعٌۢ بِهِمْ خُذُواْ مَآ ءَاتَيْنَٰكُم بِقُوَّةٍ﴾ [الأعراف: ١٧١]...

﴿وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُواْ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾ واتە: هەرچیان فەرمان پێکرابوو بە قسە و کردەوە بە پێچەوانەیەوە جوڵانەوە، چونکە فەرمانیان پێ درابوو لە دەرگای (بیت المقدس) بە کڕنوش بردنەوە بچنە ژوورەوە ئەوان ئەقنەخشکێ ئەچوونە ژوورەوە و ئەیانوت خوایە تاوانەکانمان لێ داماڵە کە بە هۆی وازهێنانمان لە جیهاد تووشمان بووە هەتا چل ساڵ لەسەر لێشێواویدا بوون وایان لێ هات لەسەر قنگ ئەڕۆیشتن و ئەیانوت (حنطة فی شعرة) لە جیاتی (سجدة).

﴿وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُواْ فِى ٱلسَّبْتِ﴾ واتە رامان سپاردن ڕۆژانی شەممە

بپارێزن و پابەند بن بەوەوە کە خوا حەرامی کردووە لەسەریان لەو ڕۆژەدا هەتا بۆیان دانرابێت ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَٰقًا غَلِيظًا﴾ واتە توندوتیژ ئەوان موخالەفەی ئەوەیان کرد و سەرپێچییان کرد و فێڵیان کرد بۆ کردنی ئەوەی خوا حەرامی کردبوو لەسەریان وەك لە سورەتی (الأعراف) دا باس کراوە لای فەرمایشتی: ﴿وَسْـَٔلْهُمْ عَنِ ٱلْقَرْيَةِ ٱلَّتِى كَانَتْ حَاضِرَةَ ٱلْبَحْرِ﴾ [الأعراف: ١٦٣] الآيات. وە حەدیسەکەی سەفوانی کوڕی عەسال دێت لە سورەتی (سبحان)دا لای فەرمایشی: ﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَٰتٍۭ بَيِّنَٰتٍ﴾ [الإسراء: ١٠١]. ئەوەی تێدایە، لەسەرتانە بەتایبەتی جولەکە کە لە ڕۆژانی شەممەدا دەستدرێژی نەکەن.

﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَٰقَهُمْ وَكُفْرِهِم بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ وَقَوْلِهِمْ قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ ۚ بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿١٥٥﴾ وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾ وَقَوْلِهِمْ إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ ۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ ۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ ۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِ ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾ وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾

واتە: ئەوسا لەسەر پەیمان شکاندنیان و خو بواردنیان لە نیشانەکانی خوا و هەر لە ناهەق کوشتنی پێغەمبەرانیان و گوتنیان ئێمە دڵمان داخراوە بەرنەفرینی خۆمان خستن، هەرخودا خۆی دڵی بە مۆر داخستبوون، ئیتر بەشی کەمیان نەبێ لە باوەڕهێنان بێ بەشن. لەبەر لەرێی خوا لادان و ئەو بوختانە گەورە بۆ مەریەمیان هەڵبەست، لەبەرئەوەش کە دەیانوت: ئێمە عیسای کوڕی مەریەمان لەناوبرد کە پێغەمبەری خوا بوو، کەچی نە ئەوان کوشتیان، نە توانییان لە قەنارەی دەن، بەڵام سەریان لێ تێکچووبوو، نەیانناسی و ئەو کەسانەی دەربارەی ئەم لەناوخۆدا کێشەیان لە ڕایەکەیان

دوودڵن لەوبارەوە و هەر پەیڕەوانی گومانن و بێگومان نەیان کوشتووە. بەڵکو خوا بەرەوە خۆی هەڵکێشایەوە، خوا هەمیشە خاوەنی دەسەڵات بووە و لەکارزانە، لەوانەی ئەهلی کتێبن هەرکەسێکیان بەرلە مەرگی بڕوای بەعیسا دەهێنێ دیارە عیساش ڕۆژی قیامەت دەبێتە شایەت لەسەریان.

ئەمەش بە هۆی ئەو تاوانانە بووە کە کردبوویان کە بووە هۆی ئەوەی پێویست بێت نەفرینیان لێ بکرێ و دووربخرێ،ەوە لە هیدایەت، ئەویش شکاندنی پەیمانەکەیان بوو کە لێیان وەرگیرابوو و بێباوەڕییان بە ئایەتەکانی خوا واتە حوجەکانی و بورهانەکانی و ئەو موعجیزانەی بنیویانە لەسەر دەستی پێغەمبەرەکانەوە (علیهم السلام) کە دەفەرموێـ: ﴿وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾ ئەوەش لەبەر زۆری تاوانەکانیان و جورئەتیان بەرامبەر پێغەمبەرەکان، چونکە ئەوان کۆمەڵێکی زۆری پێغەمبەرانیان کوشتووە و کە دەڵێن: ﴿قُلُوبُنَا غُلْفٌۢ﴾، ئیبنو عەباس و و موجاهید و سەعیدی کوڕ جوبەیر و ئەکریمە و سوودی و قەتادە و چەند کەسی تر وتوویانە: لەناو بەرگدایە ئەوەش وەك قسەی هاوبەشدانەرەکان ﴿وَقَالُواْ قُلُوبُنَا فِىٓ أَكِنَّةٍ مِّمَّا تَدْعُونَآ إِلَيْهِ﴾ [فصلت: ٥] وە وتراوە واتاکەی ئەوەیە کە ئەوان ئەیانوت دڵمان بەرگە بۆ زانستی واتە بووەتە مەشکە بۆ زانستی و پڕە لە زانستی.

خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿بَلْ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيْهَا بِكُفْرِهِمْ﴾ لەسەر قسەکەی یەکەم ئەوەیە بەهانە بهێننەوە بەوەی بڵێن دڵمان بێ ئاگایە لەوەی دەیڵێ، چونکە لەناو بەرگدایە و داپۆشراوە، خوایش دەفەرموێـ: بەڵکو دڵەکانیان مۆری نراوە بەسەردا، وە لەسەر قسەی دووەم ئەوەی وتوویانە پێچەوانە بۆتەوە لەسەریان لەوەوپێش لە سورەتی (البقرە) دا قسەی لەسەر کراوە.

﴿فَلَا يُؤْمِنُونَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ واتە دڵیان لەسە بێ باوەڕی و ستەم ڕاهاتووە و کەمی باوەڕ ﴿وَبِكُفْرِهِمْ وَقَوْلِهِمْ عَلَىٰ مَرْيَمَ بُهْتَٰنًا عَظِيمًا ﴿١٥٦﴾﴾ عەلی کوڕی ئەبی تەڵحە وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە هاتووە کە ئەوە مانای وایە تاوانی زیناکردنیان دایە پاڵی ئەوەش ڕواڵەتی ئایەتەکەیە کە مەریەم و کوڕەکەی بە تاوانی گەورە دانەپاڵیان تاوانبار دەکرد. مەریەمیان دەکردە زیناکارو دووگیانبوونی لەو زینایە و هەندێکیان وتوویانە: لەکاتێکدا بێ نوێژ بووە نەفرینی خوایان لێ بێ بەدوای بەدوای یەکدا هەتا ڕۆژی قیامەت.

کە وتوویانە: ﴿إِنَّا قَتَلْنَا ٱلْمَسِيحَ عِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ واتە ئەوەی بانگەواز دەکات بۆ ئەو پلەوپایەیە کوشتوومانە، ئەوەش لە دەروازەی گاڵتەجارییەوە دەڵێن وەك قسەی هاوبەشدانەرەکان ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ﴾ [الحجر: ٦]. وە لە هەواڵەکانی جولەکە بەرنەفرینی خوا و تورەیی و سزاکەوی بکەون کاتێ عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) خوا ناردی بە ئایەتەکانی و ڕێنماییەکانی حەسودییان پێ برد، لەسەر ئەوەی خوا ئەو پێغەمبەرایەتی و موعجیزانەی پێبەخشیوە کە کەڕو لاڵ و گەڕ و گولی چاك دەکرد، مردووی زیندوو دەکردەوە بە فەرمانی خوا، وە لە قوڕ باڵندەیەکی دروست دەکرد، پاشان فوی پێدا دەکرد ئەبووە باڵندەیەك ئەیانبینی بە ئاسمانەوە دەفڕی بە فەرماتنی خوا، لەگەڵ گەلێ موعجیزەی گەورەتر، کە خوا پێی بەخشیی بوو و لەسەر دەستیدا روویان دەدا، لەگەڵ ئەوەشدا بە درۆیان دائەناو هەوڵیان دەدا ئازاری بدەن بەهەر شێوەیەك بتوانن، هەتا عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) وای لێهاتبوو لە شارەکەدا لایان دانەدەنیشت، بەڵکو بە زۆری بەملاولادا دەڕۆیشت لەگەڵ دایکیدا سلاوی خوایان لەسەر بێت، پاشان بەوە قانیع نەبوون هەتا چوونە لای پاشای دیمەشق لەو سەردەمەدا کە پیاوێکی هاوبەشدانەربوو، لە ئەستێرەپەرستەکان بە نەتەوەکەیان دەوت یونان و پێیان وت کە لە (بيت المقدس) پیاوێك پەیدا بووە خەڵك هەڵدەگێڕێتەوەو گومڕایان دەکات، هاوولاتیانی پادشا کەندەڵ دەکات. پاشاکەش لەوە تووڕە بوو، نامەیەکی نووسی بۆ جێگرەکەی لە قودس، کە ئەو باسکراوە بگرێت و لە خاچی بدات و درك بەسەریا بچەقێنێ و خەڵکی لە ئازارەکانی رزگار بکات، کاتێ نامە گەیشت والی قودی ملکەچی فەرمانەکەی بوو، خۆی و کۆمەڵێك لە جولەکە چوون بۆ ئەو ماڵەی عیسای (سلاوی خوای لێ بێت) تێدا بوو، کە لەگەڵ دوانزە کەس لە هاوەڵەکانی لەو ماڵەدا بوون، یان سیانزە کەس، وە وتراوە حەڤدە کەس بوون، ئەو ڕۆژەش هەینی بوو، دوای عەسری شەوی شەممە لەو ماڵەدا چواردەوریان دا، کاتێ عیسا هەستی پێ کردن و ئەبێ هەر بێنە ناو ماڵەکەوە یان ئەبێ ئەم بچێتە دەر بۆ ناویان، بە هاوەڵەکانی وت: کامتان دێتە سەر شێوەکەم و ئەبێتە هاوەڵم لە بەهەشتدا. گەنجێکیان

خۆی بۆ ئەوە ئامادە دەکات وەك ئەوەی ئەو کەسە بە بچووك بزانێ بۆ ئەوە دووجار و سێ جار قسەکەی دووبارە کردەوە هەموو جارێك هەر ئەو گەنجە خۆی بۆ ئەوە دائەنا، ئەویش وتی: تۆ ئەو کەسەی خوا خستییە سەر شێوەی عیسا، وەك خۆی لێهات، کڵاوڕۆژنەیەك لە بنمیچی سەربانەکەوە کرایەوە، عیسا وەنەوز گرتی و بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَىٰٓ إِنِّى مُتَوَفِّيكَ وَرَافِعُكَ إِلَىَّ﴾ [آل عمران: ٥٥]. کاتێ ئەو بەرزکرایەوە ئەوانی تر چوونە دەر، کاتێ ئەوانە ئەو گەنجەیان بینی وایانزانی عیسایە، بەشەو گرتیان و لە خاچیان داو دڕکیان چەقاند بە سەریدا، جولەکە وایان دەرخست کە ئەوان هەوڵیان داوە بۆ لە خاچدانی بانگەوازیان بۆ ئەوە کرد و کۆمەڵێك لە گاورەکان خۆیان دا بە دەستیانەوە ئەوەش لەبەر نەزانینیان و کەمی ئاوەزیانەوە جگە لەوانەی لەماڵەکەدا لەگەڵ مەسیح بوون بەرزکردنەوەیان بینی، بەڵام ئەوانی تر وەك جولەکە ئەیانزانی ئەوانیش وایان دەزانی کە ئەوەی لە خاچ دراوە عیسای کوڕی مەریەمە (سڵاوی خوای لێ بێت)، هەتا وتوویان کە مەریەم لە ژێر ئەو لەخاچدراوەدا دادەنیشێت و دەگری، وە وتراوە کە قسە لەگەڵ دایکی دەکات... ئیتر خوا دەزانێ.

ئەوانە هەموو تاقیکردنەوەن بۆ بەندەکانی کە ئەو خوایە چەند حیکمەتێکی گەورەی هەیە.

بێ سۆ خوای بەرز ئەو فەرمانەی وورونکردووەتەوە و ئاشکرای کردوون، وە لە قورئانی پیرۆزدا دەریخستووە کە ناردوویەتیە خوارەوە بۆ سەر نێرراوە پیرۆزەکەی کە بە موعجیزە و روون کراوەکان و بەڵگەی ئاشکرا پشتگیری کردووە.

خوای گەورە کە راستگۆترین راستگۆیان و پەروەرندەی جیهانیانە و ئاگاداری ئاشکرا و نهێنییەکانە ئەوەیە کە نهێنی ئاسمانەکان و زەوی دەزانێت و زانایە بەوەی بووە و دەبێ و ئەگەر بووبێ چۆن دەبێ؟

﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ واتە کاتێ هاوشێوەکەیان بینی وایانزانی عیسایە (سڵاوی خوای لێ بێت)، لەبەرئەوە خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّ﴾ واتە

ئەوانەی ئەیانوت کوشتوومانە لە جولەکەوە ئەوانەش خۆیان تەسلیم کردن گاورەکان لە گاورە نەزانەکان هەموویان لە گوماندان لەسەر ئەوە و لە بەرئەوە فەرموویەتی: ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًا﴾ واتە بە دڵنیاییەوە نەیانکوشتووە، بەڵ:و گومانیان هەیە ﴿بَل رَّفَعَهُ اللَّهُ إِلَيْهِ وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا﴾، بەڵکو خوا بە قودرەت و دەسەڵاتی خۆی پاراستی ﴿حَكِيمًا﴾ واتە بە هەموو ئەوانی دایدەنێ لەو کاروبارانەی دروستی دەکات.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: کاتێ خوا ویستی عیسای کوڕی مەریەم بەرز بکاتەوە بۆ ئاسمان، هاتە لای هاوەڵەکانی کە لە کە لە ماڵەکەدا دوانزە کەس لە حەوارییەکان بوون واتە لەو کاتەیا هاتە دەر کە لە ماڵەکەدا بوو سەری ئاوی لێ دەتکا وتی: لە ئێوەدا هەیە بێ باوەڕیم پێ دەکات، دوانزە جار ئەوەی، دوای ئەوەی باوەڕی پێ هێنابووم، ئەڵێ: پاشان وتی: کام لە ئێوە ئامادەیە بخرێتە سەر شێوەی من و بکوژرێ لە جێگای من لە ڕۆژی قیامەتدا لە پلەوپایەی مندا دەبێ؟ گەنجێك تەمەنی لە هەموویان بچووکتر بوو هەڵسا، پێی وت: دانیشە، پاشان دووبارەی کردەوە، هەر ئەو گەنجە هەڵسا، پاشان دووبارەی کردەوە بۆیان هەر ئەو گەنجە هەڵسا، وتی: من ئامادەم، عیسا فەرمووی: تۆ ئەو کەسەی من دەمەوێت. ئیتر شێوەی عیسا چووە سەر شێوە و عیسا لە کلاوڕۆژنەی ژوورەکەوە بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان. ئەڵێ: کۆمەڵێك لە جولەکە هاتنە ژوورەوە ئەوەی شێوەکەی چووبووە سەری گرتیان و کوشتیان و لە خاچیان دا، یەکێکیان دوانزە جار بێ باوەڕ کرد بە عیسا دوای ئەوەی باوەڕی پێ هێنابوو.

بوون بە سێ بەشەوە:

بەشێکیان وتیان: خوا لەناوماندا بوو هەتا ویستی، پاشان بەرزبووەوە بۆ ئاسمان، ئەوانە پێیان دەوتن یەعقوبییەکان، بەشێکی تریان وتیان: کوڕی خوا لەناوماندا بوو هەتا ئارەزووی کرد، پاشان خوا بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، ئەوانەش پێیان دەوتن نەستوورییەکان، بەشەکەی تریان وتیان: بەندەی خوا و نێردراوی خوا لەناوماندا بوو، هەتا خوا ویستی، پاشان خوا بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، ئەوانەش موسڵمانەکان بوون، هەردوو بەشە بێ باوەڕەکە بەشە

موسڵمانەکەیان لەناوبرد، ئیتر بەردەوام ئیسلام بوو بە ژێرەوە هەتا خوا موحەممەدی (درودی خوای لێ بێت) نارد (ئەوە هەتا دەگاتە ئیبنو عەباس ئیسنادێکی سازە).

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە وەهبی کوڕی مونەبیهەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: عیسا و حەڤدە کەس لە حەوارییەکانی هاتنە ماڵێك، بێ باوەڕەکان دەوریان گرتن، کاتێ چوونە ژوورەوە خوا هەموویانی خستە سەر شێوەی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت)، ئەوانیش پێیان وتن ئێوە سیحرتان لێمان کردووە، عیسامان لەناوتاندا بۆ دەرخەن یان هەمووتان دەکوژین، عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) بە هاوەڵەکانی وت: کێ خۆی دەفرۆشێ بە بەهەشت ئەمڕۆ؟ پیاوێکیان وتی: من، هاتە دەرەوە لەناویاندا وتی: من عیسام، خوا خستبوویە سەر شێوەی عیسا، ئەوانیش بردیان و کوشتیان و لە خاچیان دا، بەوشێوەیە لێیان تێکچوو وایاندەزانی عیسایان کوشتووە و گاورەکانیش هەروایان دەزوانی کە ئەوە عیسایە، خوایش عیسای لەو ڕۆژەوە بەرز کردووەتەوە (ئەمەش سیاقێکی غەریبە).

ئیبنو جەریر وتوویەتی: عەبدوسەمەدی کوڕی مەعقەل وتوویەتی: گوێبیستی وەهب بووم دەیوت: عیسای کوڕی مەریەم کاتێ خوا ئاگاداری کرد کە لە دونیا دەردەچێ لە مردن ترسا و بەلایەوە ناخۆش بوو، حەوارییەکانی بانگێشت کرد و خواردنی بۆ دروست کردن، پێی وتن: ئەمشەو ئامادە بن لام پێویستییەکەم پێتان هەیە، کاتێ ئەو شەوە هاتن بۆ لای، خواردنی دەرخوارد دان و خۆی هەڵسا بە خزمەتکردنیان کاتێ لە خواردن بوونەوە دەستی بۆ شۆردن بە دەستی خۆی، دەستنوێژی بۆ ئەشتن بە جلەکانی دەستیان سڕی، ئەوانیش ئەوەیان زۆر لا سەیر بوو، پێیان ناخۆش بوو ئینجا وتی: بزانن هەر کەس شتێك لەوەی ئەمشەو کردم ڕەدی بکاتەوە بۆم لە من نییە، منیش لەو نیم، ئەوانیش بڕیاتن لەسەر کارەکە دا هەتا کاتێ لێبووەوە وتی: ئەوەی ئەمشەو بۆم کردن لە بانگێشت کردنتان بۆ خواردن و دەستەکانتانم شۆرد بەدەستی خۆم بۆ ئەوە بوو ئێوەش چاو لەمن بکەن، چونکە وەك دەزانن من باشترینتانم کەستان خۆی لە کەسی ترتان بە گەورتر

نەزانێ، یا هەندێکتان گیانی خۆی بەخت بکات لە پێناوی هەندێکتاندا وەك چۆن من گیانی خۆم بەخت بۆ ئێوە، بەڵام ئەو پێویستییەی ئەمشەو داواتان لێ دەکەم بۆم بکەن لە خوا بۆم بپاڕێنەوە زۆر کە ئەجەلم دوابخات، کاتێ دەستیان کرد بە پاڕانەوە ویستیان زۆر بپاڕێنەوە، خەویان لێ کەوت نەیانتوانی بپاڕێنەوە بۆی، عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) هەڵی دەساندن و دەیوت: (سبحان الله) پاکو بێگەردی بۆ خوا نەتانتوانی تاقە شەوێك ئارامم بۆ بگرن یارمەتیم بدەن تێیدا؟ وتیان: سوێند بە خوا نازانین تووشی چی بووین ئێمە لەوەوپێش شەو درەنگ دەخەوتین و بە زۆری ئەماینەوە، بەڵام ئەمشەو نەمانتوانی دانیشین نەخەوین و بپاڕێینەوە هەرکاتێ بمانویستایە بپاڕێینەوە ڕێمان لێ دەگیرا. ئەویش وتی: شوان دەڕوات و مەڕەکان بڵاوەی لێ دەکەن، بەو شێوە قسەی دەکردو مەرگی خۆی ئاشکرا دەکرد، پاشان وتی: بەراستی یەکێ لە ئێوە باوەڕی بە من نامێنێ پێش ئەوەی کەڵەشێر سێ جار بخوێنێ، با کەسێکتان من بفرۆشێ بە چەند درەمێکی کەم و نرخەکەی بخوات، ئەووانیش چوونە دەرەوە بڵاوەیان لێ کرد، ئەوکاتە جولەکە دەگەڕا بە دوایدا شەمعونیان گرت کە یەکێ بوو لە حەواریەکان، وتیان: ئەم لە هاوەڵەکانی عیسایە، ئەویش ئینکاری کرد و وتی: من هاوەڵی ئەو نیم ئەوانیش بەریان دا، پاشان کۆمەڵێکی تر گرتیان ئەمجارەش ئینکاری کرد، وتی: من هاوەڵی ئەو نیم. پاشان دەنگی کەڵەشێرەکەی بیست، دەستی کرد بە گریان و تووشی غەم و پەژارە بوو، کاتێ ڕۆژ بووەوە یەکێ لە حەواریەکان چوو بۆ لای جولەکەکان و وتی: چیم دەدنێ ئەگەر من شوێنی مەسیحێکم نیشان دان؟ سێ درەمیان دایە ئەویش وەریگرت و بردنی بۆ شوێنەکەی کە لەوەوپێش لێیان تێکچووبوو گرتیان و قوڵ بەستیان کر بە پەت لە پێشیەوە دەڕۆیشتن و پێیان دەوت: تۆ لەوەوپێش مردوت زیندوو دەکردەوە و شەیتانت دوور دەخستەوە و شێتت چاك دەکردەوە، ئەی ناتوانی خۆت لەو پەتە ڕزگار بکەیت؟ پاشان تفیان لێ کرد و درکیان ئەدا بەسەریدا هەتا گەیاندیانە لای ئەو تەختەیەی ئەیانویست پیایدا هەڵواسن، خوایش بەرزی کردەوە بۆ لای خۆی، ئەوەی شێوەی چوو بووە سەر ئەو لە داریان دا، حەوت ڕۆژ مایەوە،

پاشان دایکی و ئەو ژنەی کە عیسا تەداوی دەکرد و خوا لە شێتیەکەی چاکی کردەوە هاتن ئەگریان لە وشوێنەی کە کرابوو بە داردا، عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) هات بۆ لایان پێی وتن: بۆچی دەگریەن؟ وتیان: بۆ تۆت، وتی: من خوا بەرزی کردمەوە بۆ لای خۆی خێر نەبێ هیچم تووش نەبووە، ئەوە خراوەتە سەر شێوەی من بە حەواریەکان بڵێن لە فلانە شوێن و لە فلانە شوێن ئەگەن بە من، لەو شوێنەدا یانزە جار پێی گەیشتن، پاشان ئەوەیان لێ ون بوو کە فرۆشتبووی و شوێنەکەی نیشانی جولەکەدا بوو، دەربارەی هاوەڵەکانی پرسیاریان لێ کرد، وتی: من پەشیمانم لەوەی کردوومە خۆی خنکادنو خۆی کوشت، وتی: ئەگەر تۆربەی بکردایە خوا تۆبەکەی قبوڵ دەکرد، پاشان دەربارەی ئەو غولامەی شوێنیان کەوتبوو پرسیاری لێ کردن کە ناوی یەحیا بوو، وتی: ئەوە لەگەڵتانایە، بڕۆن هەر مرۆڤەی وای لێ دێ بە زمانی نەتەنەوەکەی خۆی قسە دەکات و بانگەوازیان دەکات و ئاگاداریان دەکات. (سیاق غریب جداً).

پاشان ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە ئیبنو ئیسحاقەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ناوی ئەو پادشایەی کە پیاوی نارد بۆ عیسا بیکوژێ پێیان دەوت داود، کاتێ بۆ ئەوە کۆبوونەوە کەسێك لە بەندەکانی خوا نەیدەزانی بەرگەی ئەونوە دەگرێ وەك بۆم باسکرا کەش ئەوەندەی ئەو لێی نەدەترسا وە لە خوا پاڕایەوە کە لێی دوور بخاتەوە هەتا وەك ئەڵێن وتوویەتی: خوایە ئەگەر تۆ ئەو کاسە لە کەسێك لە خەڵقی خۆت دوور دەخەیتەوە و لە منی دووربخەرەوە هەتا جەڵد لێدانەکەی ئەوەندە توند بوو خوێن دەردەپەڕی لە شوێنەکەی لەو دەرگایەوە کە یانویست لێوەی بچنە ژوورەوە، چووە ژوورەوە بۆ ئەوەی خۆی و هاوەڵەکانی بکوژن بە عیساوە سیانزە کەس بوون، کاتێ زانی هاتوونەتە ژوورەوە بۆی، یەکێ لە حەواریەکانی هاوەڵی پێی وت: کە دوانزە پیاو بوون. فطرس، یعقوبی کوڕی زەیدی یەحسی برای یەعقوب و ئەندرابیس و فیلەس و ئەبر سەلماوە مەنتا و طوماس و یەعقوبی کوری حەلفیا تەداوسیس قەسانیا و یود زەکەریا یوطا، ئیبنو حەمید وتوویەتی: سەلەمە وتوویەتی: ئیبنو ئیسحاق وتوویەتی: پیاوێکای گاور کە موسڵمان بوو پێی وتم: کاتێ عیسا لە خواوە

هەواڵی پێ گەیشت کە بەرزی دەکاتەوە بۆ لای خۆی وتی: ئەی حەوارییەکان کامتان حەز دەکات کە لە بەهەشتدا بێتە هاوەڵەم هەتا بچێتە سەر شێوەی من لەبەرچاوی جولەکەکان و لە جێگای من بیکوژن؟ سەرجس وتی: من ئەی ڕۆحی خوا، وتی: لە جێگەی من دانیشە، ئەویش تێیدا دانیشت، عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) بەرزکرایەوە، ئەوانیش هاتنە ژوورەوە بردیان و لە داریان دا، هەر ئەو سەرجسە بوو لە داریان داو سەریان لێشێواندرابوو، کاتێ چوونە ژوورەوە لەگەڵ عیسا ژمارەکەیان دیاری بوو، چونکە بینیبوویان و ژمارەیان ئامار کردبوو، کاتێ چوونە ژوورەوە بۆ لایان بۆ ئەوەی بیگرن عیسا و هاوەڵەکانیان بینی سەیریان کرد یەکێ دیار نییە ئەوەش بوو کە جیاوازییان هەبوو لەسەری ئەوان عیسایان نەدەناسی، بۆ ئەوەی سی درەمەکە بدەن بە لیودس بۆ ئەوەی عیسایان نیشان بدات پێی وتن: ئەگەر چوونە ژوورەوە من بەرامبەر دەوەستم، ئێوەش بیگرن، کاتێ چوونە ژوورەوە بەرزکردنەوەی عیسا ڕووی دابوو، سەرجس لە شێوەی عایسادا بینی گومانی نەبوو کە ئەوە عیسایە بەرەو ڕووی چوو، ئەوانیش گرتیان و بردنیان لە داریان دا، پاشان یودس زەکەریا پەشیمان بوو لەو کارەی بە پەتێك خۆی خنکاند، ئێستاش گاورەکان نەفرینی لێ دەکەن، هەندێك لە گاورەکان دەڵێن: ئەوەی کە لێیان تێکچوو گرتیان لە داریان دا هەردەیوت: من ئەو نیم بۆی هاتوون، بەڵکو من ڕێم نیشان دان بۆ دۆزینەوە.

کە دەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ ۖ وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾. ئیبنو جەریر وتوویەتی: ئەهلی تەئویل جیاوازییان هەیە دەربارەی واتای ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ﴾ واتە: پێش مردنی عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) ئەوە دەربارەی هەموویان دەکرێ کە باوەڕی پێ دەهێنن کاتی دێتە خوارەوە بۆ کوشتنی دەجال، بەوشێوەیە هەموو نەتەوەکان دەبنە یەك نەتەوە ئەویش نەتەوەی ئیسلامی دوور لە هاوبەشدانانە کە ئایینی ئیبراهیمە (سلاوی خوای لێ بێت). ئەوەی ئەوەی باسکردووە وتوویەتی: عەبدوڕەحمان لە سوفیانەوە لە ئەبی حوصەینەوە لە سەعیدی کوڕی جوبەیرەوە لە ئیبنو عەباسەوە کە ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾،

وتوویەتی: پێش مردنی عیسای کوڕی مەریەم (سڵاوی خوای لێ بێت).

ئەبومالیك وتوویەتی: ﴿إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ ئەوە کاتی هاتنەخوارەوە عیسا دەبێت و پێش مردنی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) کەس نامێنێ لە ئەهلی کیتاب باوەڕی پێ نەهێنێ.

ززەحاك لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ وتوویەتی: ئەوە بەتایبەتی جولەکە دەگرێتەوە، حەسەنی بەصری وتوویەتی: واتە نەجاشی و هاوەڵەکانی.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: یەعقوب بۆی گێڕامەوە لە ئەبو ڕەجاوە لە حەسەنەوە کە دەربارەی ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ وتوویەتی: پێش مردنی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) کە زیندووە لای خوایە، بەڵام کاتێ هاتە خوارەوە هەموو باوەڕی پێ دەهێنن.

ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: جوەیرییەی کوڕی بەشیر وتوویەتی: گوێم لێبوو پیاوێك بە حەسەنی وت: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ مانای چییە؟ ئەویش وتی: پێش مردنی عیسا، خوای گەورە عیسای بەرز کردووەتەوە بۆ لای خۆی پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت زیندووی دەکاتەوە باش و خراپ باوەڕی پێ دەهێنن.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: کۆمەڵێکی تر وتوویانە: کەس نامێنێ لە ئەهلی کیتاب باوەڕنەهێنێ بە موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) پێش مردنی خاوەنی کتێب.

عەکریمە وتوویەتی: کەس لە گاور و جولەکە نامێنێ باوەڕ بە موحەممەد نەهێنێ پێش ئەوەی بمرێ.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لەو قسانە قسەی یەکەم ڕاستە کە دەڵێن کەس لە ئەهلی کیتاب دوای هاتنەخوارەوەی عیسا باوەڕی پێ نەهێنێ.

گومانی تێدانییە ئەوەی ئیبنو جەریر وتوویەتی ڕاستە، چونکە مەبەست لە سیاقی ئایەتەکە دەربارەی پوچەڵی ئەوەیە کە جولەکە وتوویانە عیسامان کوشتووە و گاورە نەزانەکانیش داویانەتە دەستیان، خوای گەورە ڕایگەیاندووە

که ئەوە والییە، بەڵکو لێیان تێکچووە ئەوەیان کوشتووە کە چووەتەسەر شێوەی عیسا، پاشان خوا عیسای بەرزکردوەوتەوە بۆ لای خۆی، ئەو ئێستا ماوە و زیندووە، پێش هاتنی ڕۆژی قیامەت دێتە خوارەوە وەك چەندەها فەرموودەی موتەواتیر بەڵگەیە لەسەری، ئەوکاتە مەسیحی دەجال دەکوژێ و خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ سەرانە لا دەبات تەنها ئیسلام قبوڵ دەکات یان شمشێر ئەم ئایەتە پیرۆزە رادەگەیەنێ کە هەموو ئەهلی کتێبەکان باوەڕی پێ دەهێنن و کەسێك نامێنێت باوەڕی پێ نەهێنێ، لەبەرئەوە دەفەرموێت: ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَـٰبِ إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾، واتە پێش مردنی عیسا، ئەو عیسایەی جولەکە و ئەوانەی لەگەڵیان ڕێکن لە گاورەکان کە بە درۆ وتوویانە عیسامان کوشتوە و لە دارمان داوە ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ واتە بەو کردەوانەی بینیونی لێیان پێش بەورزکردنەوەی بۆ ئاسمان و دوای ناردنە خوارەوەی بۆ سەر زەوی، بەڵام ئەوانەی وایان لێکداوەتەوە کە کەس لە ئەهلی کتێب نامرێ هەتا باوەڕ بە عیسا یان بە موحەممەد سڵاوی خوایان لەسەر بێت نەهێنێ، ئەوە واقیعەکەیە، چونکە هەموو کەس لە سەرەمەرگدا ئەوەی بۆ دەردەخرێ کە لەوەوپێش نەیدەزانی و باوەڕی پێدەهێنێ، بەڵام ئەو باوەڕهێنانە سوودی نییە بۆی کاتێ فریشتەی گیانکێشانی بینی، وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّى تُبْتُ ٱلْـَٔـٰنَ﴾ [النساء: ١٨] وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿فَلَمَّا رَأَوْا۟ بَأْسَنَا قَالُوٓا۟ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ وَحْدَهُۥ﴾ [غافر: ٨٤].

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر لاوازی ئەوەی ئیبنو جەریر کردوویەتییە بەڵگە بۆ ڕەددانەوەی ئەو قسەیەی کە وتوویەتی: ئەگەر مەبەست لەو ئایەتە ئەوە بوایە ئەوە هەرچی باوەڕی بە موحەممەد بهێنایە یا بە عیسا لەوانەی کە باوەڕیان پێ نەبوو لەسەر ئایینەکەیان دەبن ئەوکاتە خزم و کەس نەدەبوونە میراتگری، چونکە ڕاستگۆ هەواڵی داوە کە پێش مردنی باوەڕی پێ دەهێنن ئەوەش باش نییە بە باوەڕبوونەکەی کەس پابەند ناکرێ بەوە دەبێتە موسڵمان، ئەی نابینی قسەکەی ئیبنو عەباس کە وتوویەتی: ئەگەر لە شوێنێکی بەرز هەڵدرێتە خوارەوە یان بە شمشێر لێی بدرێت یان دڕندە بیخوات ئەو کەسە هەر دەبێ

باوەڕ بە عیسا بهێنێ، باوەڕبوونیش لەو کاتەدا بێ سوودە، خاوەنی لە بێ باوەڕی ڕزگارناکات.

هەرکەس باش سەرنج بدات بۆی دەردەکەوێت ئەوە واقیعییە، بەڵام پابەند ناکرێ بەوەوە کە مەبەست لە ئایەتەکە ئەوەیە، بەڵکو مەبەست لەوەی باسمان کرد دەربارەی بوونی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) بەزیندوویی مانەوەی لە ئاسمان و هاتنەخوارەوەی پێش ڕۆژی قیامەت بۆ ئەوەیە کە ئەو جولەکە و گاورانە بە درۆ بخرێنەوە کە قسەکانیان جیاوازە و بەیەکدا دراوەو پێچەوانەی یەکن و دژی یەکن و دوورن لە ڕاستییەوە، ئەو جولەکانە زیادەڕەوییان کردووە گاورەکانیش کەمتەرخەمی، بەوەی گرتوویانەتە عیسا و دایکی لە تاوانە گەورەکان، گاورەکان تووشی سەرلێشێواوی بوون کاتێ ئەوەیان وتووە دەربارەی کە تێیدا نەبووە بەوەی لە مەقامی پێغەمبەرایەتی لایان داوە و بەرزیان کردووەتەوە بۆ پلەوپایەی پەروەردگاری.

باسی ئەو فەرموودانەی هاتوون دەربارەی هاتنەخوارەوە عیسا لە ئاسمانەوە بۆ سەرزەوی لە کۆتایی زەمانەدا پێش هاتنی ڕۆژی سەلا بەشێوەیەك بانگەواز دەکات بۆ پەرستنی خوای تاك و تەنهاو بێ هاوبەش

بوخاری بەڕەحمەتی خوا بکەوێ وتوویەتی: لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "والذي نفسي بيده لَيُوشكَنّ أن ينزل فيكم ابن مريم حَكَمًا عدلا فيكسر الصليب، ويقتل الخنزير، ويضع الجزية، ويفيض المال حتى لا يقبله أحد، حتى تكون السجدة خيرا من الدنيا وما فيها". واتە: بەوەی گیانی منی بەدەستە خەریکە عیسای کوڕی مەریەم بێتە خوارەوە بۆ نواتان بەشێوەی حاکمێکی دادپەروەر، خاچ بشکێنێ و بەراز بکوژێ و سەرانە لاببات و ماڵ ئەوەندە زۆربێت کەس نەیەوێت، تەنها کڕنوشێك لەو دونیا و چی تێدایە بەخێرتر دەبێت بۆیان.

ڕێگایەکی تر ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "الأنبياء إخوة لِعَلات أمهاتهم شتى ودينهم واحد، وإني أولى الناس بعيسى ابن مريم، لأنه لم يكن بيني

وبينه نبي، وإنه نازل، فإذا رأيتموه فاعرفوه: رجل مربوع إلى الحمرة والبياض، عليه ثوبان مُمَصّرَان، كأن رأسه يقطر وإن لم يصبه بَلَل، فيدق الصليب، ويقتل الخنزير، ويضع الجزية، ويدعو الناس إلى الإسلام، ويهلك الله في زمانه الملل كلها إلا الإسلام، ويهلك الله في زمانه المسيح الدجال، ثم تقع الأمنة على الأرض، حتى ترتع الأسود مع الإبل، والنّمار مع البقر، والذئاب مع الغنم، ويلعب الصبيان بالحيات لا تضرهم، فيمكث أربعين سنة، ثم يُتَوَفى ويصلي عليه المسلمون". واته: پێغەمبەران بەرەی یەك بابن و داکیان جیایە و یەك دینیان هەیە، من لە هەموو کەس لە پێشترم بە عیسای کوڕی مەریەم، چونکە لە نێوانماندا پێغەمبەری تر نییە، ئەو هەر دێتە خوارەوە، کاتێ چاوتان پێی کەوت بیناسنەوە، پیاوێکی چوار شانی سوور و سپییە، دوو کراسی لەبەردایە، سەری بێ ئەوەی تەڕی بەر بکەوێت وەك ئەوە وایە ئاوی لێ بچۆڕێ، خاچ دەشکێنێ و بەراز دەکوژێ و سەرانە لادەبات، خەڵك بانگ دەکات بۆ سەر ئیسلام، خوا لە سەردەمی ئەودا هەموو بۆچوونە هەڵەکان لەناو دەبات جگە لە ئیسلام و لە سەردەمی ئەوادا خوا مەسیحی دەجال لەناو دەبات، پاشان ئاسایش لەسەر زەویدا بڵاودەبێتەوە هەتا شێرەکان لەگەڵ وشترەکاندا دەلەوەڕێن و پڵنگەکان لەگەڵ مانگاکاندا و گورگەکان لەگەڵ مەڕەکاندا و منداڵان یاری بە مارەکان دەکەن بێ ئەوەی زیانیان پێ بگەیەنن، چل ساڵ دەمێنێتەوە، پاشان دەمرێ و موسڵمانەکان نوێژ دەکەن لەسەری.

فەرموویەکی تر: موسلیم لە سازەوارەکەیدا وتوویەتی: لە ئەبی هورەیرەوە هاتووە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا تقوم الساعة حتى ينزل الروم بالأعماق -أو بدابق- فيخرج إليهم جيش من المدينة من خيار أهل الأرض يومئذ، فإذا تصافّوا قال الروم: خلوا بيننا وبين الذين سَبَوا منا نقاتلهم. فيقول المسلمون: لا والله لا نخلي بينكم وبين إخواننا. فيقاتلونهم، فينهزم ثلث لا يتوب الله عليهم أبدًا، ويُقْتَلُ ثلثه أفضل الشهدا و عند الله (عز وجل) ويفتح الثلث لا يفتنون أبدا فيفتتحون قسطنطينية، فبينما هم يقسمون الغنائم قد عَلّقوا سيوفهم بالزيتون، إذْ صاح

فیهم الشیطان: إن المسیح قد خلفکم فی أهلیکم. فیخرجون، وذلك باطل. فإذا جاؤوا الشام خرج، فبینما هم یُعدّون للقتال: یسوون الصفوف، إذ أقیمت الصلاة، فینزل عیسی ابن مریم فأمَّهم فإذا رآه عدوّ الله ذاب کما یذوب الملح فی الماء، فلو ترکه لانذاب حتی یهلك ولکن یقتله الله بیده، فیریهم دمه فی حَرْبته". واتە: ڕۆژی قیامەت نایەت هەتا ڕۆم نەیەنە قوڵایی وڵاتی ئیسلامەوە، یان ئەگاتە دابیق، لە مەدینەوە سوپایەکیان بۆ دێ کە لەو ڕۆژەدا باشترین خەڵکی سەرزەوین کاتێ ڕیز دەبن بەرامبەریان ڕۆمەکان پێیان دەڵێن: با ئەوانە لەناو بەین ژن و منداڵی ئێمەیان بە دیل گرتووە، موسڵمانەکانیش دەڵێن: نا سوێند بە خوا ڕێگاتان پێنادەین براکانمان لەناوبەرن. لەو جەنگەدا سێ یەکیان هەڵدێن، خوا هەرگیز لە تاوانەکەیان نابورێ و سێیەکیان دەکوژرێ ئەوانەش چاکترین شەهیدن لای خوا و سێ یەکیان وڵات ڕزگار دەکەن کە هەرگیز تووشی فیتنە نایەن و قوسەنتینییەش ڕزگار دەکەن، لەو کاتەدا دەستکەوتە جەنگییەکان دابەش دەکەن شمشێرەکانیان هەڵدەواسن بە زەیتوونەوە، شەیتان هاوار دەکات لەناویاندا مەسیح ماوەتەوە لەناو ژن و منداڵەکانتاندا، هەرچەندە ئەو قسە پووچەڵ بوو ئەوان دەچنە دەر، کاتێ دەگەنە شام ئەویش دێتە دەر لەو کاتەدا ئەووان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ جەنگ و ریزەکانیان ڕێك دەخەن، قامکەت دەکرێت بۆ نوێژ عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە ئیمامەتیان بۆ دەکات، کاتێ دوژمنەکەی خودا دەیبینێ ئەتوێتەوە وەك چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، ئەگەر وازی لێ بهێنایە ئەتوایەوە هەتا دەکرد، بەڵام خوا بە دەستی ئەو دەیکوژێ خوێنەکەی بە حەربەکەوە نیشانی خەڵك دەدات.

فەرموویەکی تر: ئەحمەد وتوویەتی: لە ئیبنو مەسعودەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ئەو شەوەی شەوڕەویم پێ کرا گەیشتم بە ئیبراهیم و موسا و عیسا سڵاوی خوایان لێ بێت، باسی ڕۆژی قیامەتیان دەکرد، داوایان لە ئیبراهیم کرد بۆیان باس بکات، ئەوویش وتی: من زانیاریم نییە لەسەری، پاشان داوایان لە موسا کرد ئەویش وتی: زانیاریم دەربارەی نییە، پاشان داوایان لە عیسا کرد،

ئەویش وتی: جگە لە خوا کەس زانیاری دەربارەی نییە، بەڵام بەپێی ئەوەی پەروەردگارم پەیمانی پێداوم کە دەجال دەردەچێت من دوو شیشم بەدەستەوە دەبێ کاتێ چاوی پێم دەکەوێ ئەتوێتەوە وەك چۆن قوڕقوشم دەتوێتەوە، وتوویەتی: خوا دەیکوژێ کاتێ چاوی بەمن دەکەوێت هەتا دارو بەرد دەڵێن: ئەی موسڵمان بێ باوەڕێك لە ژێرمدایە وەرە بیکوژە وتوویەتی: خوا لەناویان دەبا، پاشان خەڵکەکە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتەکانیان ئەو کاتە یەئجوج و مەئجوج دەردەچن لە هەموو شیوو دۆڵێکەوە ئەکشێن وڵاتەکانیان داگیر دەکەن لەسەر هەر شتێکدا بڕۆن لەناوی دەبەن بە لای هەر ئاوێکدا بڕۆن هەموو دەخۆنەوە و وتوویەتی: پاشان خەڵك دێن سکاڵا لە دەستیان دەکەن لەخوا ئەپاڕێمەوە خوایش لەناویان دەبات و دەیانکوژێت هەتا زەوی بەبۆگەنەکەیان پیس دەبێت، بارانێك دەبارێت لاشەکانیان ڕادەماڵێ بۆ ناو دەریا بەو پێیە خوا پەیمانی پێداوم کە ئەگەر ئەوە روویدا بەوشێوەیە دەبێت، ڕۆژی قیامەتیش وەك هەرگری تەواوە کەس نازانێ چ کاتێك لە پڕ لە دایك دەبێ شەوێت یان ڕۆژ'.

فەرموودەیەکی دیکە: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەبی نەچرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: چووین بۆ لای عوسمانی کوڕی ئەبی عاص لە ڕۆژێکی هەینیدا بۆ ئەوەی موصحەفێکمان هەبوو بەراوردی بکەین لەگەڵ موصحەفەکەی ئەودا، کاتێ بانگ درا بۆ نوێژی هەینی فەرمانی پێ کردین خۆمان شۆری، پاشان بۆنی خۆشی هێنا بۆمان، خۆمان پێ بۆنخۆش کرد، پاشان چووین بۆ مزگەوت لای پیاوێکەوە دانیشتین باسی دەجالی بۆ کردین، پاشان عوسمانی کوڕی ئەبی عاص هات لەبەری هەڵساین و دانیشتین لەگەڵیا وتی: گوێبیستی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بوین ئەیفەرموو: 'موسڵمانەکان سێ وڵاتیان دەبێت، وڵاتێك لەو شوێنەدا هەردوو دەریاکە ئەگەن بە یەك، وە وڵاتێکر لە حیرە و وڵاتێك لە شام، خەڵکیش سێ جار تووشی ترس و دڵەڕاوکێ دەبن، دەجالیش لە ناو خەڵکەکەوە دێتە دەر لە لای خۆرهەڵاتەوە تووشی شکان دەبێ، یەکەم وڵاتێك کە دەیگرێتەوە ئەو وڵاتەیە کە لای بەیەکگەیشتنی دوو دەریاکەن، خەڵکەکەی دەبنە سێ بەش:

بەشێکیان دەڵێن: دادەنیشین چاوەڕوانی دەکەین بزانین چییە؟ بەشێکیش ئەچن بۆ لای عەرەبە دەشتەکییەکان و بەشەکەی تریش ئەچن بۆ ئەو وڵاتەی نزیکە لێیانەوە، لەگەڵ دەجالدا حەفتا هەزار کەس دەبێت کڵاویان لەسەردایە بەشی زۆری ئەوانەی لەگەڵیدا دەبن جولەکە و ئافرەتن، مسوڵمانەکان پاڵ دەدەن بە عوقبەی ئوفەیقەوە کۆمەڵێکیان دەنێرن ئەو کۆمەڵە تووش دەبن ئەوەیان زۆر لا گران دەبێت تووشی برسێتییەکەی گەورە دەبن هەتا زەلامی وایان دەبێت وەتەری کەوانەی دەسووتێنێ و دەیخوات ئەوان لەسەر ئەو بارودۆخە دەبن لەبەیانییەکدا بانگەوازکارێك سێ جار هاوار دەکات ئەی خەڵکینە یارمەتیدەرتان بۆ هات، هەندێکیان بە هەندێکیان دەڵێن ئەوە دەنگی پیاوێکی تێرە، عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە لە کاتی نوێژی بەیانییدا ئەمیرەکەیان پێی دەڵێت: ئەی گیانی خوا وەرە پێشەوە نوێژەکە بکە، ئەویش دەڵێت: ئەم ئومەتە هەندێکیان ئەمیری هەندێکیانن با ئەمیرەکەیان پێش بکەوێت نوێژەکەیان بۆ بکات. هەتا کاتێ نوێژەکەی تەواو دەکات عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) حەربەکەی دەگرێت بە دەستییەوە بەرەو دەجال دەڕوات کاتێ دەجال دەبینێ وەك قوڕقوسم دەتوێتەوە، حەربەکەی دەکات بە نێو مەمکیداو دەیکوژێت و هاوەڵەکانیشی ئەشکێنێ، ئەو ڕۆژە هیچ شتێك نابێت کەسێکیان بشارێتەوە هەتا دار و درەخت دەڵێن: ئەی باوەڕدار ئەوە بێ باوەڕێکە وەبەرد دەڵێت: ئەی باوەڕدار ئەوە بێ باوەڕێکە". (تفرد به أحمد من هذا الوجه).

ئەبو عەبدوڵلا موحەممەدی کوڕی یەزیدی کورشی ماجە لە سونەنەکەیدا وتوویەتی: لە ئەبی ئومامەی باهیلییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درووودی خوای لێ بێت) وتاری بۆ ئەداین بەشی زۆری وتارەکەی باسی دەجال بوو، کە ئێمەی لێ ئاگادار دەکردەوە لە قسەکانی ئەوەبوو دەیوت: "لەوکاتەوە خوا نەوەی ئادەمی لە زەویدا جێگیر کردووە فیتنەیەك نەبووە لە فیتنەی دەجال گەورەتر بێت، خوای گەورە پێغەمبەرێکی نەناردووە نەتەوەکەی نەترساندبێ لە دەجال، من کۆتایی پێغەمبەرانم و ئێوە کۆتایی نەتەوەکانن، ئەو دەجالە هەر لەناو ئێوەدا سەرهەڵدەدات، ئەگەر سەری هەڵدا و من لەناوتاندا نەبووم، من

حوجەی هەموو مسوڵمانێك دەبم، بەڵام ئەگەر دوای من سەری هەڵدا هەر کەس خۆی حوجەی خۆیەتی، خوا جێنشینی منە بۆ هەموو مسوڵمانێك، ئەو دەجالە لەنێوان شام و عێراقدا سەرهەڵدەدات، بە لای ڕاست و چەپیدا وێرانکاری بڵاو دەکاتەوە، ئەی بەندەکانی خوا ئاگادار بن، ئەی خەڵکینە چەسپاو بن، من دەجالتان بۆ وەصف دەکەم، بەشێوەیەك هیچ پێغەمبەرێك پێش من بەوشێوەیە وەسفی نەکردووە". پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەستی بە قسەکانی دەکرد و دەیوت: "من پێغەمبەرم، دوای من پێغەمبەری تر نایەت"، پاشان ستایشی خوای کرد و دەیفەرموو: "دەجال دەڵێت من پەروەردگاری ئێوەم، بزانن ئێوە پەروەردگاری خۆتان نابینن هەتا نەمرن، دەجال چاوێکی کوێرە، پەروەردگارتان چاوێکی کوێر نییە، دەجال لە نێو چەوانی نوسراوە ئەمە خوانەناسە، هەموو موسڵمانێکی خوێندەوار و نەخوێندەوار ئەتوانێ بیخوێنێتەوە، لە فیتنەکانی ئەوەیە بەهەشت و جەهەنمی لەگەڵدایە، دۆزەخەکەی بەهەشتەو بەهەشتەکەی دۆزەخە، هەر کەس تووش بوو بە ئاگرەکەی با هاوار بۆ خوا بکات و سەرەتای سورەتی (الکهف) بخوێنێ، ئیتر خوا ئەو ئاگرەی بۆ سارد دەکاتەوە و سەلامەتی دەکات وەك چۆن خوا ئاگرەکەی سارد و سەلامەت کرد لەسەر ئیبراهیم، هەر لە فیتنەکانی ئەوەیە بە عەرەبی دەشتێکی دەڵێت: ئەگەر من و دایکت و باوکت ئێستا زیندوو بکەمەوە شایەتی دەدەیت کە من پەروەردگارتم؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ، ئەویش دوو شەیتان ئەگۆڕێتە سەر شێوەی باوك و دایکی و دەڵێت: کوڕەکەم شوێنی بکەوە ئەوە پەروەردگارتە. هەر لە فیتنەکانی کەسێك دەگرێ و بە مشار دیکات بە دوو بەشەوە، پاشان دەڵێت: سەیری ئەو بەندەیەم بکەن ئێستا زیندوو دەکەمەوە، پاشان دەڵێت: پەروەردگارێکی هەیە جگە لەمن خوای گەورە ئەو بەندەیە زیندوو دەکاتەوە دەجال پێی دەڵێت: کێ پەروەردگاری تۆیە؟ ئەویش دەڵێ: پەروەرینی من خودایە، تۆ دەجالی تۆ و دوژمنی خوایت، سوێند بە خوا من لە خۆت باشتر دەتناسم، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: ئەو پیاوە بەرزترین پلەی دەبێت لە بەهەشتدا لەناو نەتەوەکەمدا".

موحاریبی وتوویەتی: گەڕاینەوە بۆ حەدیسەکەی ئەبو رافیع وتوویەتی: هەر لە فیتنەکانی دەجال ئەوەیە فەرمان دەکات بە ئاسمان باران ببارێنێ باران دەبارێت و فەرمان دەکات بە زەوی کە سەوز بێت خێرا سەوز دەبێت، هەر لە فیتنەکانی ئەوەیە کە بە لای هۆزێکدا بڕوات بە درۆی بخەنەوە هەرچی ئاژەڵیان هەیە دەمرێ، هەر لەو شتانەی سەری خەڵکی پێ دەشێوێنێ ئەوەیە ئەگەر بڕوات بە لای هەر هۆزێکدا باوەڕی پێ بکەن فەرمان دەکات بە ئاسمان بارانیان بەسەردا ببارێنێ بارانیان بەسەردا دەبارێنێ و فەرمان دەکات بە زەوی سەوز بێت هەتا ئاژەڵەکانیان ئەو ڕۆژە دەڕۆن تێر گژو گیا دەخۆن و هەموویان قەڵەو دەبن و گەورە دەبن گوانیان پڕ شیر دەبێت بەشێوەیەك هەرگیز وانەبوون، لەسەر زەوی هیچ نامێنێ بەسەریا نەڕوات و سەرنەکەوێ بەسەریدا، جگە لە مەککەو مەدینە لەهەر دەرگایەکیان بیەوێ بچێتە ناوی فریشتە بە شمشێر بەرەنگاری دەبنەوە هەتا لای (الظریب الاحمر) دادەبەزێ لای دووریانەکە (السنجە) مەدینە سێ جار تووشی بومەلەرزە دەبێت و دەلەرێتەوە بەسەر خەڵکەکەیدا. هیچ موفیقێکی نێرو مێ نامێنێ هەموو دەچن بۆ لای پیسی پێوە ناهێڵێ وەك کورە چۆن چۆن پیسی بە ئاسنەوە ناهێڵێ ئەو ڕۆژە ناو دەنێ ڕۆژی ڕزگاری. ئوم شورەیکی کچی ئەبی عەکر دەڵێت: ئەی نێردراوی خوا ئەو کاتە عەرەب لە کوێ دەبی؟ ئەفەرموێت: ئەوان کەم دەبن و بەشی زۆریشیان لە (بیت المقدس) دەبن و پێشەواکەیان پیاوێکی چاك دەبێ لەکاتێکدا ئیمامەکەیان پێش ئەکەوێت کە نوێژی بەیانییان بۆ بکات لەو کاتەدا عیسای کوڕی مەریەم سڵاوی خوایان لێ بێ دێتە خوارەوە ئەو ئیمامە پاشەو پاش دەگەڕێتەوە دواوە بۆ ئەوەی عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) پێش بکەوێت، عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) دەستی دەخاتە نێو شانی پاشان دەڵێت: پێش بکەوەرەوە و نوێژەکەیان بۆ بکە ئەو نوێژە بۆ تۆ قامەتی بۆ کراوە، ئیتر یمامەکەیان نوێژەکەیان بۆ دەکات کاتێ لە نوێژەکە دەبێتەوە عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: دەرگاکە بکەنەوە کە دەرگاکە دەکرێتەوە دەجال لە پشت دەرگاکەوە دەبێت و حەفتا هەزار جولەکەی لەگەڵدا دەبێ بە شمشێری زەڕکەشەوە و بە دیباجەوە کاتێ دەجال چاوی بە عیسا دەکەوێ دەتوێتەوە وەك

چۆن خوێ لە ئاودا دەتوێتەوە، پاشان هەڵدێ، عیساش پێی دەڵێت: ئێستا لێدانێ لێت دەدەم کەس وا لێی نەدابێ، شوێنی دەکەوێ هەتا لای دەرگای (الله)ی شەرقی پێی دەگات لەوێدا دەیکوژێ. دوای ئەو خوا جولەکەکان دەبەزێنێ بەو شێوەیە شت نامێنێ جولەکەیەم بشارێتەوە خوا هەموویان دێنێتە قسە لە دار و بەرد و دیوار جگە لە داری (الغرقد)، چونکە لە دارەکانی خۆیانە قسە ناکات ئەوانی تر دەڵێن ئەی بەندەی خوای موسڵمان ئەمە جولەکەیەکە وەرە بیکوژە. پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: 'ڕۆژەکانی مانەوەی دەجال چل ساڵ دەبێ ساڵێکی ئەبێتە نیو ساڵ و ساڵێکی تری ئەبێتە مانگێك و مانگێکی دەبێتە هەفتەیەك دواڕۆژەکانیشی وەك (الشررە) وادەبێ کەسێك لە ئێوە ئەگەر بەیانی لای دەرگای مەدینە بێت ناکاتە دەرگاکەی تری خۆر ئاوا دەبێ و ئێوارە دادێ' پێی دەوترێ: 'ئەو ڕۆژە کورتانە چۆن نوێژ بکەین ئەی نێردراوی خوا؟ کاتێ نوێژەکان دادەنێن وەك ئەم ڕۆژگارە درێژانە دای دەنێن پاشان نوێژ دەکەن'، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: عیسای کوڕی مەریەم (سلاوی خوای لێ بێت) ئەبێتە حاکمێکی دادپەروەر بۆ نەتەوەکەم و پێشەوایەکی ڕاستگۆ خاچ ئەشکێنێ و بەراز سەردەبڕێ و سەرانە لادەبا و واز لە سەدەقە دێنێ هەوڵ نادات بۆ مەڕ و وشتر، ڕق و کینە نامێنێ زەهری ئەو شتانەی بە خەڵکەوە دەدەن نامێنێ و هەتا منداڵی بچووك دەست دەخاتە ناو دەمی مار زیانی پێ ناگەیەنێ و بەچکە شێر ڕاوەدنێ بێ ئەوەی زیانی پێ بگەیەنێ گورگ لەناو مەڕ و ماڵاتدا وەك سەگ وائەبێ بۆیان، زەوی پڕ دەبێ لە ئاسایش وەك چۆن قاپ پڕ دەبێ لە ئاو وشەکان دەبن بە یەك وشە و جگە لە خوا ناپەرستریێ، جەنگیش نامێنێ، قورەیش موڵکی خۆی دەستێنێ زەویش ڕۆشناییەکەی وەك ڕۆشنایی زیوی لێ دێت و رووەکانی دەڕێتەوە وەك سەردەمی ئادەم هەتا کۆمەڵێك کۆدەبنەوە لەسەر هێشوویەك لە ترێ هەموویان تێر دەکات و چەند کەس لەسەر هەنارێك کۆدەبنەوە تێریان دەکات. گایەك بە ئەوەندە ئەوەدە ماڵ دەبێت و ئەسپێك بەچەند درەمێکی کەم دەبێت' وتیان: ئەی نێردراوی خوا چی وا ئەسپ هەرزان دەکات؟ فەرمووی: هەرگیز بۆ جەنگ سواری نابن.

وتیان ئەی چی گا گران دەکات؟ فەرمووی: هەموو زەوی پێ دەکێڵرێ، پێش دەجال سێ ساڵ قاتوقڕی دەبێ، خەڵك تووشی برسێتی زۆر دەبن خوای گەورە لە ساڵی یەکەمدا فەرمان بە ئاسمان دەکات کە سێیەکی بارانەکەی بگرێتەوە وە فەرمان بە زەوی دەکات کە سێیەکی بەروبوومەکەی بگرێتەوە، پاشان لە ساڵی دووەمدا خوا فەرمان بە ئاسمان دەکات دوو سێیەکی بارانەکەی بگرێتەوە و فەرمان بە زەوی دەکات دوو سێ یەکی بەروبوومەکەی بگرێتەوە و لە ساڵی سێیەمدا خوای بەرزی شکۆمەند فەرمان دەکات بە ئاسمان هەموو بارانەکەی بگرێتەوە بەشێوەیەك یەك دڵۆپە باران نابارێت و فەرمان دەکات بە زەوی هەموو بەروبوومەکەی بگرێتەوە بێ ئەوەی هیچ شتێك سەوز بێت، خاوەن سم نامێنێ لەسەر زەوی هەموو لەناو دەچن، وتیان: ئەی خەڵك لەو زەمانەدا چۆن دەژین؟ فەرمووی: "بە تەهلیل و تەکبیر و تەسبیح و تەحمید ئەژین کە وەك خواردنیان لێ دێ بۆیان".

ئیبنو ماجە وتوویەتی: گوێبیستی ئەبوحەسەنی تەنافسی بووم دەیوت: گوێم لە عەبدوڕەحمان موحاربی بووە دەیوت: پێویستە ئەم فەرموودە بدرێ بە مامۆستای منداڵەکان هەتا منداڵەکان فێری ببن. (ئەم فەرموودەیە لەو ڕووەوە زۆر غەریبە، بەڵام بۆ هەندێکی شایەت هەیە).

ئیمام موسلیم بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت لە سازەوارەکەیدا دەڵێت: یەعقوبی کوڕی عاصمی کوڕی عەروەی کوڕی مەسعودی سرقەفی وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای عەبدوڵڵای کوڕی عەمر وتی: ئەو حەدیسە چییە باسی دەکەیت و دەڵێیت کۆتایی دنیا ئەو کاتەو ئەو کاتە دەبێت؟ ئەویش وتی: (سبحان الله) ئەمویست هیچ بە کەس نەڵێم، بەڵکو گوتم: پاش کەمێکی تر ڕووداوێکی گەورە دەبینن خانوو دەسووتێ ئەوە و ئەوە ڕوودەدات، پاشان وتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "دەجال لەناو نەتەوەکەمدا سەرهەڵدەدات، چل دەمێنێتەوە، نازانم چل ڕۆژ یا چل مانگ چل ساڵ. خوای گەورە عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێ کە لە عەروەی کوڕی مەسعود دەچێت ئەگەڕی بە شوێن دەجالداو ئەی دۆزێتەوەو و دەیکوژێ خەڵك دوای ئەوە حەوت ساڵ دەمێننەوە لە نێوان دوو کەس دا دوژمنایەتی نابێت، پاشان

خوای گەورە بایەکی سارد هەڵدەکات لە لای شامەوە هەرچی مسقاڵە زەڕەیەك خێر، یان باوەڕ لە دڵیا بێت گیانی دەکێشێ، هەتا ئەگەر کەسێك بچێتە ناوجەرگەی کێوێکەوە بایەکەش ئەچێت بە دوایدا و گیانی دەکێشێ، وتوویەتی: لە پێغەمبەرم (دروودی خوای لێ بێت) بیستووە کە فەرموویەتی: 'خراپترین خەڵك دەمێننەوە هیچ چاکەکارییەك نازانن و ئینکاری لە هیچ خراپەیەك ناکەن شەیتانیش خۆی دەگۆڕێ لێیان و دەڵێت: ئایا بەدەممەوە نایەن؟ ئەوانیش دەڵێن: فەرمانی چیمان پی دەکەیت؟ ئەویش فەرمانیان پێ دەکات کە بت بپەرستن، ئەوانە لەوبارەیەوە خانەی بژێویان دەبن، حاڵیان باش دەکات، پاشان فوو دەکرێ بە صور دا کەسێك نایبیستێ کەسێك نەبێت کە قوڕ ئامادە دەکات و قوڕ بەرز دەکاتەوە، یەکەم کەسێك دەنگەکەی ئەبیستێ پیاوێکە حەوزی وشترەکانی قوڕ دەدات، فەرموویەتی: ئەو کەسە دەمرێ و خەڵکەکەش دەمرن، پاشان خوا بارانێکی خەست دەبارێنێ لاشەی خەڵکەکەی پێدەردەکەوێ، جارێکی دیکە فوو ئەکرێتەوە بە صوردا هەموویان ڕاست ئەبنەوە و چاوەڕوانی دەکەن، پاشان پێیان دەوترێت ئەی خەڵکینە بەرەو پەروەردگارتان بڕۆن ﴿وَقِفُوهُمْ إِنَّهُم مَّسْئُولُونَ﴾ [الصافات: ٢٤] پاشان پێیان دەوترێ، بەشی ئاگر دەربهێنن ئەوترێ چەندە؟ ئەوترێ لە هەزار کەس نۆسەد و نەوەد و نۆ، فەرموویەتی: ئەو ڕۆژەیە کە منداڵەکان سەریان سپی دەبێ و پیر دەبن ئەوە ئەو ڕۆژەیە کە قاچەکان رووت دەکرێ'. (رواه مسلم والنسائي).

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە مەجمەعی کوڕی جاریەوە هاتووە کە وتوویەتی: گوێبیستی پێغەمبەر بووم (دروودی خوای لێ بێت) ئەیفەرموو: 'يقتل ابن مريم المسيح الدجال بباب لُدّ -أو: إلى جانب لُدّ'، واتە: عیسای کوڕی مەریەم دەجال لە دەرگای لود دا دەکوژێ یان لە تەنیشی لود دا دەیکوژێت.

فەرموودەیەکی تر: ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە حوزەیفەی کوڕی ئەسیدی ئەنصارییەوە هاتووە وتوویەتی: لە عەرەفە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) هات بۆ لای ئێمە باسی دنیائاخر بوونمان دەکرد، پێغەمبەر (دروودی خوای

لێ بێت) فەرمووی: "دنیا کۆتایی نایەت هەتا دە نیشانە نەبینن: هەڵاتنی خۆر لە ڕۆژئاواوە، بەرزبوونەوەی دووکەڵێك و دەرکەوتنی ئاژەڵێك و هاتنی یەئجوجو و مەئجوج هاتنە خوارەوەی عیسای کوڕی مەریەم و دەرکەتنی دەجال و سێ ڕۆ چوون ڕۆچوونێك لە خۆرهەڵات و ڕۆچوونێك لە خۆرئاوا و ڕۆچوونێك لە دورگەی عەرەب، وە ئاگرێك لەناوەڕاستی عەدەنەوە دەردەچێ، خەڵك کۆدەکاتەوە لەهەر شوێنێك شەو بمێننەوە ئەویش لەگەڵیانا دەمێنێتەوە، و نیوەڕۆوان لەگەڵیانا دەبێت، لەهەر شوێنێك نیوەرشۆوان بمێننەوە.

وە عیسا (سلاوی خوای لێ بێت) لە شام، بەڵکو لە دیمەشق لای منارەکەی خۆرهەڵات دیتە خوارەوە کاتی قامەت کردنی نوێژی بەیانی لە ساڵی حەوت سەدو چل و یەك منارەیەکی سپی بۆ مزگەوتی ئەمەوی دروسن کرا لەبەردی نەقاری لە جیاتی ئەو منارەیەی کە رووخا بە هۆی ئاگرەوە کە گاورەکان تێیان بەردابوو.

## سیفەتی عیسای کوڕی مەریەم (سلاوی خوای لێ بێت)

لە پێشەوە لە حەدیسەکەی عەبدوڕەحمانی کوڕی ئادەم لە ئەبی هوڕیرەوە باس کرا کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرمووی: "کاتێ چاوتان پێی کەوت بیناسنەوە، پیاوێکی چوارشانەی سوورو سپییە، دوو کراسی لەبەردایە، قژی سەری بریسك دەداتەوە وەك ئاوی لێ بتکێ بێ ئەوەی تەڕکرابێ، وە لە حەدیسەکەی نەواسی کوڕی سەمعاندا هاتووە کە: "دێتە خوارەوە لای منارە سپییەکەی خۆرهەڵاتی دیمەشق لە نێوان دوو جوان و ئەسپدا دەستی لەسەر باڵی دوو فریشتە داناوە کاتێ سەری دانەوێنێ ئاوی لێ دەتکێ کە سەری بەرز بکاتەوە وە پارچە لوئلوئە ئاوی پێدا دێتە خوارەوە، ڕەوانییە بۆ خوانەناس هەست بە بۆنی هەناسەکەی بکات دەمرێ و هەناسەکەی هەتا چاوبڕ بکات دەڕوات.

فەرموودەی خوای بەرز ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا﴾ قەتادە وتوویەتی: شایەتییان لەسەر ئەدات کە نامەیەکی خوای پێ گەیاندوون و دان

دەنێ بەوەدا کە بەندەی خوایە، ئەوەش وەك فەرموودەی خوای بەرزە لە کۆتایی سورەتی مائیدەدا کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَـٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ﴾ تافەرمایشتی: ﴿ٱلْعَزِيزُ ٱلْحَكِيمُ﴾ [المائدة: ١١٦ ـ ١١٨].

﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَـٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾ وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰا۟ وَقَدْ نُهُوا۟ عَنْهُ وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَـٰطِلِ ۚ وَأَعْتَدْنَا لِلْكَـٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾ لَّـٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ وَٱلْمُؤْمِنُونَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ ۚ وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ ۚ وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ أُو۟لَـٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾﴾

واتە: بەو ناهەقییەی کە لە جولەکەکان دەرکەوت و زۆر کەسیان لە ڕێگەی خوا وەرگەڕان، لەو شتانەی بۆیان ڕەوا کرابوو بێبەشمان کردن. هەروەها بە هۆی سوو خواردنیان کە پێیان وترابوو مەیخۆن و بەفیڕۆ دارایی مەردمیان دەخوارد ئێمەش بۆ ئەو پێنەزانان و سپڵانە ئازارێکی گەلێ بە ژانمان سازداوە. بەڵام زۆرزانەکانیان و بڕواداران بەتایبەت ئەو کەسانەی وا نوێژ بە باشی بەجێ دێنن، هەروەها زەکات دەران و ئەوانەی کە بە خوداو ڕۆژی دوایی خاوەن بڕوان و بەوەی بۆ تۆ ناردراوەتە خوارەوەو بەوەش وا پێش تۆ ناردراوە باوەڕیان هەیە، بە ئەوانە بەم زووانە پاداشتێکی گرنگ دەدەین.

خوای بەرز هەواڵ دەدات بەهۆی ئەوە کە جولەکە تاوانی زۆر گەورەیان ئەنجام داوە شتە پاکەکانیان لێ حەرام کراوە کە لەوەو پێش خوا بۆی ڕەوا کردبوون وەك ئیبنو ئەبی حاتیم وتوویەتی: ئیبنو عەباس ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە خوێندووەتەوە ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَـٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾﴾ ئەو حەرام کردنەش ئەبێ قەدەری بوبێت بەو واتایەی کە خوا وای لێ کردوون، چونکە تەئویلیان لە کتێبەکەیاندا کردووە و چەند شتێکیان تێدا گۆڕیوە کە لەوەو پێش حەڵال بووە بۆیان

حەرامیان کردووە لەسەر خۆیان، وە ئەبێ شەرعی بێت بەو واتایەی خوای گەورە لە تەوراتدا شتی لەسەر حەرام کردوون کە لەوەو پێش حەڵاڵ بووە بۆیان وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾ [آل عمران: ٩٣] لە پێشەوە قسەمان کردووە لەسەر ئەم ئایەتە.

بەراستی مەبەست ئەوەیە کە هەموویان لە خواردەمەنی بووە کە لەوەو پیش حەڵاڵ بووە بۆیان پێش ئەوەی تەورات دابەزێ جگە لەوانەی ئیسرائیل لەسەر خۆی حەرام کردبوو لە گۆشتی وشتر و شیرەکەی، پاشان خوای گەورە شتی زۆری لەسەر حەرام کردن لە تەوراتدا وەك لە سورەتی (الأنعام)دا فەرموویەتی: ﴿وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا كُلَّ ذِى ظُفُرٍ ۖ وَمِنَ ٱلْبَقَرِ وَٱلْغَنَمِ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتْ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلْحَوَايَآ أَوْ مَا ٱخْتَلَطَ بِعَظْمٍ ۚ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِبَغْيِهِمْ ۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ﴾ [الأنعام: ١٤٦] واتە: بۆیە ئەوانەمان لەسەر حەرام کردوون، چونکە شایستەی ئەوەن بە هۆی ستەمکاری و زیادڕۆیشتن و پێچەوانەی پێغەمبەرەکەیان جووڵانەوە و جیاوازییان لەگەڵیدا لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾﴾ واتە خەڵکیان گێڕاوەتەوە و خۆیان گێڕاوەتەوە لەوە شوێن هەق و ڕاستی بکەون و عیسا و موحەممەدیان بە درۆ داناوە (سڵاوی خوا لە هەردووکیان بێت).

کە دەفەرموێت: ﴿وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ﴾، واتە خوای گەورە سووی لێ قەدەغە کردبوون ئەمان ئەیانخواردو وەریان دەگرت و فێڵیان دەکرد بە جۆرەها فێڵ و تەڵەکە و ماڵی خەڵکیان بەشتی پوچەڵ دەخوارد، خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾، پاشان فەرموویەتی: ﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ﴾، واتە چەوساوەکان لەسەر ئایین چییەکی چەقیوییان هەیە دەربارەی زانستی یەکەڵك ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ عەتفە بۆ سەر ﴿الراسخون﴾ و خەبەرەکەیەتی ﴿يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ ئیبنو عەباس وتویەتی: ئەم ئایەتە دەربارەی عەبدوڵڵای کوڕی سەلام و سەعلەبەی کوڕی سەعید و ئوسەیدی کوڕی عوبێد کە چوونە ناو ئایینی ئیسلامەوە و باوەڕیان هێنا بەوەی خوا موحەممەدی پێدا ناردووە دابەزیوە.

کە فەرموویەتی: ﴿وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾، لە هەموو موصحەفی پێشەواکاندا بەوشێوەیە هاتووە هەر بەو شێیەیە لە موصحەفەکەی ئوبەیی کوڕی کەعبدا. ئیبنو جەریر باسی ئەوەی ئەوی کردووە ئەو ئایەتە لە موصحەفەکەی ئیبنو مەسعوددا بە (المقیمین الصلاة) هاتووە و وتوویەتی: ئەی ڕاست بێت خوێندنەوەی هەمووانە پاشان ڕەدی ئەوەی داوەتەوە کە دەڵێت ئەوە لە هەڵەی نووسەرەکانەوە بووە، پاشان باسی جیاوازییەکانی خەڵکی کردووە لەسەری کە هەندێکیان وتوویانە (ئەوە مەنصوبە لەسەر مەدح) وەك لەم فەرمایشەدا هاتووە: ﴿وَٱلْمُوفُونَ بِعَهْدِهِمْ إِذَا عَٰهَدُوا۟ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِى ٱلْبَأْسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلْبَأْسِ﴾ [البقرة: ١٧٧] ئەوەش شیاوە لە قسەی عەرەبدا وە کۆمەڵێکی تر وتوویانە (ئەوە خفض کراوە بە عەتفي) لەسەر فەرمایشی: ﴿بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ واتە بە (المقیمین الصلاة) وەك ئەوەی بڵێت بە نوێژکردن واتە دان دەنێن بە پێویست بوونیا و نووسرانی لەسەریان یان مەبەست لە ﴿المقیمین الصلاة﴾ فریشتەکانە، ئەوە هەڵبژاردەی ئیبنو جەریرە واتە باوەڕیان هەیە بەوەی نێردراوەتە خوارەوە بۆ سەر تۆ وە ئەوەی پێش تۆ نێردراوەتە خوارەوە بە فریشتەدا دەربارەی ئەوە چاوپیاخشاندنەوە هەیە، ئیتر خواش دەزانێ.

﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ واتە باوەڕدێنن بەوەی کە شایستەیەکی پەرستن نییە جگە لە خوا، وە باوەڕدێنن بە زیندووبوونەوەی دوای مردن، وە باوەڕیان بە پاداشت هەیە لە سەرکردەوەکان خێر و شەڕ ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ﴾ خەبەری گشتییە لەسەر ئەوانەی پێشوو ﴿سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا﴾ واتە بەهەشت.

﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّۦنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ ۚ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ
إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْمَٰعِيلَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ وَٱلْأَسْبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ
وَهَٰرُونَ وَسُلَيْمَٰنَ ۚ وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا ﴿١٦٣﴾ وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ
مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ ۚ وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكْلِيمًا ﴿١٦٤﴾
رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ ۚ
وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٦٥﴾﴾

واتە: ئێمە فەرمانی خۆمانمان خستە دڵت هەروەك نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەویشمان وا تێگەیاند. خستیشمانە دڵی پاکی ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقوب و نەوەکان و عیسا و ئەیوب و یونس و هارون و سولەیمان و زەبوریشمان دا بە داود. پێغەمبەرانی دیکەشمان بەڕێ کرد ئەوانەی کە لە پێشدا بوون و چوون و سەرگوزەشتەیمان بۆ گووتوی ج ئەوانەی کە دەربارەیان نەماندوادووی خوداش بۆ خۆی ڕاستەوخۆ موسای دواندووە، گشتی لە گشتیان پێغەمبەری مژدەدەرو ترسێنەر بوون هەتا لە پاش پێغەمبەران ئەو خەڵکە هیچ بەڵگەیەکیان لەلا نەبێ بۆ لای خودا، خودا خاوەن دەسەڵاتی لە کارزانە.

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: سەکین و عەدی کوڕی زەید وتیان: ئەی موحەممەد ئێمە نازانین خودا دوای موسا هیچی ناردبێ بۆ کەس، خوا دەربارەی قسەکەیان ئەمەی ناردە خـوارەوە: ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ﴾ تـا کۆتایی ئایەتەکان.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزییەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: خوا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێت: ﴿يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ﴾ هـەتـا ﴿وَقَوۡلِهِمۡ عَلَىٰ مَرۡيَمَ بُهۡتَٰنًا عَظِيمٗا﴾ [النساء: ١٥٣ ـ ١٥٦] وتوویەتی: کاتێ پێغەمبەر بەسەر جولەکەکاندا خوێندییەوە هەواڵی کردەوە خراپەکانیانی پێدان ئەوانیش ئینکاری هەموو ئەوانەیان کرد کە خوا ناردویەتییە خوارەوە وتیان: خوا هیچی نە ناردووەتە خوارەوە بۆ کەس، نە بۆ سەر موسا، نە بۆ سەر عیسا، نە بۆ هیچ پێغەمبەرێك، خوای گەورەش ﴿وَمَا قَدَرُواْ ٱللَّهَ حَقَّ قَدۡرِهِۦٓ إِذۡ قَالُواْ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ بَشَرٖ مِّن شَيۡءٖۗ﴾ [الأنعام: ٩١]. دەربارەی ئەوە موحەممەدی کوڕی کەعبی قورەزی وتوویەتی چاوپیاخشاندنەوەی دەوێ، چونکە ئەو ئایەتەی سورەتی (الأنعام) لە مەککە هاتووەتە خوارەوە و ئەم ئایەتەی سورەتی (النساء) لە مەدینە هاتووەتە خوارەوە و ئەو ئایەتە ڕەدە بۆ سەریان کاتێ دجاوایان لە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کرد کە کتێبێکیان لە ئاسمانەوە بۆ بنێرێتە

خوارەوە، خـوای گـەورە فـەرمـوویـەتـی: ﴿فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ﴾ [النساء: ١٥٣]. پاشان باسی ئابڕووچوونەکانیان و عەیبەکانیانی کردووە و ئەوەی لەسەری بوون و ئەوەی ئێستا وان لەسەری لە درۆو قسەهەڵبەستن، پاشان خوای گەورە باسی ئەوە دەکات دەفەرموویت: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦ﴾ إلى قولە: ﴿وَءَاتَيْنَا دَاوُۥدَ زَبُورًا﴾ زەبور ناوی ئەو کتێبەیە کە خوا بەو ەحی ناردبویەتی بۆ داود (سڵاوی خوای لێ بێت).

کـە دەفـەرمـوویـت: ﴿وَرُسُلًا قَدْ قَصَصْنَٰهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ﴾ واتە پێش ئەم ئایەتە واتە لەو سورەتانەدا کە لە مەککە هاتوونەتە خوارەوە. وە ئەوە ناوی ئەو پێغەمبەرانەیە کە خوا بە دەق لە قورئاندا باسی کردوون ئەوانیش (ئادەم، ئیدریس، نوح، هود، صالح، ئیبراهیم، لوت، ئیسماعیل، ئیسحاق، یەعقوب، یوسف، ئەیوب، شوعەیب، موساو هارون و یونس و داود و سولیەمان ئیلیاس و یەسوع و زەکەریا و یەحیا و عیسا، بەوشێوەیە (ذو الكفيل) لای بەشی زۆری راڤەکارانی قورئان وەگەورەکەیان موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت).

کە دەفەرموویت: ﴿وَرُسُلًا لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ﴾ واتە چەند کەسێکی تر کە خوا لە قورئاندا باسی نەکردوون زانایان جیاوازن دەربارەی پێغەمبەران و نێرراوەکان بەناوبانگ لەوبارەیەوە حەدیسەکەی ئەبی زەڕە لەوەدا کە ئیبنو مەردەویە لە تەفسیرەکەیدا باسی کردووە بەڕەحمەتی خوا بکەوێت کە وتوویەتی: لە بەی زەڕەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: ئەی نێردراوی خوا ژمارەی نێرراوەکانی خوا چەندە؟ فەرمووی: سەدو بیست و چوار هەزار، ئەڵێ: وتم چەندیان بە کتێبەوە نێردراون؟ فەرمووی: سێ سەدو سیانزە کە ژمارەیەکی زۆرن، ئەڵێ: وتم: کامیان یەکەم نێردراو بووە؟ فەرمووی: ئادەم. ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا ئادەم نەبییەکی مورسەل بووە؟ فەرمووی: بەڵێ، خوا بەدەستی خۆی درووستی کردووە، پاشان لە گیانی خۆی کردووە بە بەردا، پاشان کردوویەتی بە مرۆڤێکی تەواو، پاشان فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ چواریان سریانین ئادەم و شیپ و نوح و خەنوخ ئیدریسە کە یەکەم کەس بوو بە پێنووس نوسیوێتی وە چواریان لە عەرەب بوون ئەوانیش هود و سالح و شوعەیب و پێغەمبەرەکەی تۆیە ئەی ئەبو زەڕ.

وە یەکەم پێغەمبەر لەناو بەنوئیسرائیلدا موسا بووە وە دوا پێغەمبەریان عیسا بووە، وە یەکەم پێغەمبەر ئادەم بووەو دواپێغەمبەریش پێغەمبەرەکەی تۆیە.

ئەبو یەعلا وتوویەتی: لە ئەنەسەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "ئەو برا پێغەمبەرانەم کە لە پێش منەوە ڕۆیشتوون هەشت هەزار نەبی بووە، پاشان عیسای کوڕی مەریەم، پاشان من بووم".

حەدیسە دوورودرێژەکەی ئەبی زەڕ کە هاتووە دەربارەی ژمارەی پێغەمبەرەکان کە وتوویەتی: چوومە ناو مزگەوت سەیرم کرد پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) بە تەنها دانیشتووە چووم لای دانیشتم، وتم: ئەی نێردراوی خوا تۆ فەرمانت پێ کردم نوێژ بکەم، فەرمووی: "الصلاه خیر موضوع فاستکپر أو استقل". نوێژ چاکترین دانراوە زۆر بکەیت یان کەم، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا کام خێر چاکترین کردەوەیە؟ فەرمووی: "باوەڕ بە خوا بوون جیهاد کردن لە ڕێگەیدا" وتم: ئەی نێردراوی خوا کام لە باوەڕدارەکان چاکترینن؟ فەرمووی: "ئەوەیان جوانترین ڕەوشتی هەبێت"، وتم: ئەی نێردراوی خوا کام لە موسڵمانەکان سەلامەتن؟ فەرمووی: "ئەو موسڵمانانەی خەڵك لە زمان و دەستی سەلامەت بن" وتم: ئەی نێردراوی خوا کام کۆچ کردن چاکترین کۆچ کردنە؟ فەرمووی: "کەسێك واز لە خراپەکاری بهێنێت"، وتم: ئەی نێردراوی خوا کام ڕۆژوو چاکترین ڕۆژووە؟ فەرمووی: "ڕۆژوو فەرزێکە پاداشتی چەند جارەیە"، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا کام جیهاد چاکترین جیهادە؟ فەرمووی: کەسێك ورگی ئەسپەکەی هەڵبدڕێ و خوێنی بڕژێنرێ". وتم: ئەی نێردراوی خوا ڕزگارکردنی کام بەندە زۆر چاکە؟ فەرمووی: "ئەوەیان کە نرخی زۆر بێت و گران بەها بێت". وتم: ئەی نێردراوی خوا کام خێرو سەدەقە زۆر باشن؟ فەرمووی: خۆم کەم دەست بیت بیدەست بە هەژار"، وتم: ئەی نێردراوی خوا کام گەورەترین ئایەتە کە بۆت ناردراوەتە خوارەوە؟ فەرمووی: "ئایەتەلکورسی"، پاشان فەرمووی: ئەی ئەبو زەڕ حەوت ئاسمانەکە کەلەگە کوری وەك حەلقەیەکن لەزەوی چۆڵدا فەزڵی عەرش بەسەر کورسی وەك فەزڵی زەوی جولەکەیە بەسەر حەلقەکەدا، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا

ژمارەی نێرراوەکانی خوا چەندە؟ فەرمووی: "سەدو بیست و چوار هەزار"، وتم: ئەی نێردراوی خوا چەندیان خاوەنی کتێبن؟ فەرمووی: "سێ سەدو سیانزەیان"، ئەڵێ: وتم: کامیان یەکەم پێغەمبەر بووە؟ فەرمووی: "ئادەم" وتم: ئایا ئادەم نەبی مورسەل بووە؟ فەرمووی: "بەڵێ، خوا بە دەستی خۆی دروستی کردووە و لە گیانی خۆی کردووە بە بەریدا بەرێك و پێکی هەستاوە"، پاشان فەرمووی: ئەی ئەبازەڕ چواریان سریانی بوون: ئادەم و شیث و خنوخ کە ئیدریس بووە کە یەکەس بووە بە پێنووسی بەکارهێناوە بۆ نووسین و نوحیش، وە چواریان عەرەب بوون: هود و شوعەیب و ساڵح و پێغەمبەرەکەی تۆ، ئەی ئەبو زەڕ یەکەم پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل موسا بووەو دواییان عیسا بووە، وە یەکەم نێردراو ئادەم بووەو دوا پێغەمبەریش موحەممەد"، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا، خوا چەند کتێبی ناردووەتە خوارەوە؟ فەرمووی: "سەدو چوار کتێب"، خوا پەنجا صوحوفی ناردووە بۆ شیث وە بۆ سەر خەنوخ سێ صەحیفە، وە بۆ سەر ئیبراهیم دە صەحیفە، وە بۆ سەر موسا لە پێش تەوراتدا دە صەحیفە، وە خوا تەورات و ئینجیل و زەبور و فورقانی ناردوەتە خوارەوە.

ئەڵێ: وتم: صەحیفەکانی ئیبراهیم چی بوون؟ فەرمووی: "هەموویان نوسرابوون ئەی پادشای داگیرکاری مەغرور من تۆم نەناردووە ماڵ کۆبکەیتەوە لەسەر یەك، بەڵام ناردومی مە نزای ستەملێکراوم لێ بگێڕیتەوە، چونکە من نایگێڕمەوە، ئەگەریش لە خوانەناسەوە بێت، وە چەندەها نمونەی تێدا بووە، لەسەر خاوەن ئاوەز پێویستە کە بزانێ چەند ساتێکی بۆ هەیە: ساتێك لەگەڵ پەروەردگاریدا ئەدوێ، وەساتێك خۆی تێدا موحاسەبە بکات، وە ساتێك بیر بکاتەوە لە دەستکردەکانی خوا، وە ساتێك خۆی تێدا تەری بکاتەوە بۆ بەدەستهێنانی پێویستییەکانی ژیانی لە خواردن و خواردنەوە، وە لەسەر خاوەن پێویستە تورە نەبێت بۆ سێ شت نەبێت: بۆ توێشووی ڕۆژی دوایی یان مەرمەیەك بۆ بژێوی یان چەژوەرگرتن لە غەیری مەحرەمدا.

وە لەسەر خاوەن ئاوەز پێویستە کە چاوکراوە بێ بۆ سەردەمەکەی بەرەو کارەکەی بچێت و زمانی بپارێزێ هەر کەس قسەکانی قسەکانی حسێب

بکات لە کردەوەکانی کەم قسە دەبێت لەوانەدا نەبێت کە پەیوەندییان پێوەی هەیە، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا ئەی صەحیفەکانی موسا چەند بوون؟ فەرمووی: "هەموویان عیبرەت بوون، کە نووسرابوو: سەیرم لە کەسێك دێ ئەزانێ ئەمرێ کەچی دڵی خۆشە، وە سەیرم لەکەسێك دێ ئاگاداری قەدەرە کەچی خۆی ماندوو دەکات، وە سەیرم لە کەسێك دێ ئەبینێ دونیا چۆن ئەوان لەسەری ئەم دیو دیو دەکات، کەچی دڵنیا دەبێت پێی. وە سەرسامم بە کەسێك ئەوانێ لێپرسینەوە هەیە سبەینێ، کەچی کردەوەی چاك ناکات"، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا ئایا ئێمە هیچمان بە دەستەوەیە وەك بە دەستی ئیبراهم و موسا وە هەبووە، وە چی ناردووەتە خوارەوە بۆ تۆ؟ فەرمووێ: "بەڵێ، ئەی ئەبو زەڕ، ئەمان بخوێنەرەوە: ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَن تَزَكَّىٰ ﴿١٤﴾ وَذَكَرَ اسْمَ رَبِّهِ فَصَلَّىٰ ﴿١٥﴾ بَلْ تُؤْثِرُونَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا ﴿١٦﴾ وَالْآخِرَةُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰ ﴿١٧﴾ إِنَّ هَٰذَا لَفِي الصُّحُفِ الْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَاهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾﴾ [الأعلى: ١٤ ـ ١٩].

ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: "ئامۆژگاریت دەکەم لە خوا بترسە، چونکە لە خواترسان سەری هەموو کارەکانتە، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا لەوە زیاتر ئامۆژگاریم بکە، فەرمووی: "زۆر قورئان بخوێنە و یادی خوا بکە ئەوە ئەبێتە یادێك بۆ تۆ لە ئاسماناداو ئەبێتە رۆشنایی بۆ تۆ لە سەر زەوی، ئەڵێ: وتم: لەوە زیاتر، فەرمووی: "ئاگات لە خۆت بێ زۆر پێنەکەنی، چونکە زۆر پێکەنین دڵ دەمرێنێ و رۆشنایی روخسار لا ئەبات"، ئەڵێ: وتم: ئەی نێردراوی خوا لەوە زیاتر، فەرمووی: " جیهاد بکە، چونکە جیهاد رەهبەتی نەتەوەکەمە"، ئەڵێ: وتم: زیاتر، فەرمووی: "بێ دەنگ بە لە خێردا نەبێت، چونکە بێدەنگی شەیتان ڕاودەنێت و یارمەتیدەرت دەبێت لەسەر فەرمانی ئایینەکەت"، ئەڵێ: وتم: زیاتر، فەرمووی: "هەژار و کەم دەستەکانت خۆش بوێ و لەگەڵیان دابنیشە، چونکە ئەوە شایستەترین کە نیعمەتەکانی خوات لەسەر هەڵنەگرێ"، ئەڵێ: وتم: زیاتر، فەرمووی: "سیلەی رەحم لەگەڵ خزمەکانتدا مەپچڕێنە، با ئەوانیش بیپچڕێنن"، ئەڵێ: وتم: زیاتر، فەرمووی: "هەق بڵێ هەرچەندە تالیش بێت"، ئەڵێ: وتم: زیاتر،

فەرمووی: "لەبەرخوا لە لۆمەی لۆمەکاران مەترسە"، ئەڵێ: وتم: زیاتر، فەرمووی: "ئەوەی لە خۆتدا دەیزانی با لە خەڵکیت دوور بخاتەوە، ئەوەی بۆ خۆت پێت خۆشە بۆ ئەوانیشت پێ خۆش بێت، ئەوەندەت بەسە عەیبدار بیت کە دەربارەی خەڵك بزانی و بێ ئاگا بیت لە خۆت، یان ئەوەی بۆ خۆتت پێ خۆش بێت بۆ ئەوانت پێ ناخۆش بێت" پاشان دەستی کێشا بە سنگما فەرمووی: "ئاوەزداری نییە وەك بیکردنەوە بێتفن وەرعیش نییە وەك وازهێنان، چاکێتیش نییە وەك رەوشت باشی".

عەبدوڵڵای کوڕی ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە کتێبەکەی باوکمدا بەخەتی خۆی بینیومە نووسرا بوو: موجالید لە ئەبی وەداکەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: ئەبو سەعید وتی: ئایا بە خەواریج دەڵێیت: دەجال؟ ئەڵێ: وتم: نە، وتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من کۆتایی هەزار پێغەمبەرم و زیاتریش، خوا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە ئومەتەکەی نەترساندبێت لە دەجال وە منیش بەشێوەیەك شێوەی دەجالم بۆ روونکراوەتەوە کە بۆ هیچ کەس بەو شێوەیە روون نەکراوەتەوە، دەجال چاوێکی کوێرە، بەڵام پەروەردگاری ئێوە چاوێکی کوێر نییە، وە چاوی راستی کوێرەو ناشارڕێتەوە بەرزە وەك بەڵغەمێك وایە بە دیوارێکی کەچ کراوەوە، وە چاوی چەپی وەك ئەستێرەی درەوشاوە وایە، هەموو زمانێك دەزانێ و وێنەی بەهەشتێکی سەوزی پێیە، ئاو پیایدا دەڕوات، وە وێنەی ئاگرێکی ڕەش کە دوکەڵی لێ بەرز دەبێتەوە".

وە کە دەفەرموێت: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾ ئەوە شەرەفە بۆ موسا (سلاوی خوای لێ بێت) کە بەو شێوەیە وەسف بکرێت لەبەرئەوە پێی دەوترێت (الكليم) قسە لەگەڵ کراو.

فەرموودەڕوان ئەبو بەکری مەردەویە وتوویەتی: عەبدوجەباری کوڕی عەبدوڵڵا وتوویەتی: پیاوێك هات بۆ لای ئەبو بەکری کوڕی عەیاش وتی: گوێم لێ بوو پیاوێك ئەم ئایەتەی بەم شێوەیە دەخوێندەوە ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا﴾ ئەبو بەکر وتی: بێ باوەڕ نەبێت بەو شێوەیە نایخوێنێتەوە ئەو ئایەتەم بۆ ئەعمەش خوێندووەتەوە و ئەعمەش بۆ یەحیای کوڕی وەثابی

خوێندووەتەوە و یەحیای کوڕی وەثابی بۆ عەبدوڕەحمانی سولەمی خوێندووەتەوە و عەبدوڕەحمانی سولەمی بۆ عەلی کوڕی ئەبی تالیبی خوێندووەتەوەو عەلی کوڕی ئەبی تالیب بۆ پێغەمبەری (دروودی خوای لێ بێت) خوێندووەتەوە بەم شێوەیە: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾.

ئەبوبەکری کوڕی عەیاش بۆیە تووڕەبوو لەو کەسەی بەو شێوەیە خوێندوویەتییەوە چونکە زاراوەو واتای قورئانی تێکداوە. ئەوەش لە موعتەزیلەکانەوەیە کە ئینکاری ئەوەن کە خوا قسەی لەگەڵ موسادا کردبێ، یان قسەی لەگەڵ یەکێ لە دروست کراوەکانی کردبێ، وەك بۆیان گێڕاوینەتەوە لە یەکێ لە موعتەزیلەکانەوە کە ئەم ئایەتەی بۆ یەکێ لە مامۆستاکان خوێندووەتەوە بەم شێوەیە: ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهَ مُوسَىٰ تَكۡلِيمًا﴾ ئەویش پێی دەڵێت: ئەی کوڕی لەخنا و ئەی چی دەکەیت بە ئایەتی: ﴿وَلَمَّا جَآءَ مُوسَىٰ لِمِيقَٰتِنَا وَكَلَّمَهُۥ رَبُّهُۥ﴾ [الأعراف: ١٤٣] ؟ واتە: ئەوە تەحریف کردن هەڵناگرێت وە تەئویل کردن.

ئیبنو مەردەویە وتوویەتی: لە ئەبی هورەیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لَما كلم الله موسى كان يُبْصِرُ دبيبَ النمل على الصفا في الليلة الظلماء". (هذا حديث غريب)، واتە: کاتی موسا قسەی لەگەڵ خوادا دەکرد جوڵەی مێرولەی لە سەر بەردی ڕەش لە شەوی تاریکدا دەبینی.

وە حاکم لە کتێبی (المستدرك) دا دەگێڕێتەوە لە ئیبنو مەسعودەوە کە وتوویەتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "كان على موسى يوم كلمه ربُّه جبة صوف، وكسا و صوف، وسراويل صوف، ونعلان من جلد حمار غير ذكي"، واتە: ئەو ڕۆژەی موسا (سڵاوی خوای لێ بێت) پەروەردگاری قسەی لەگەڵ کرد جبەیەکی خوری و کراسێکی خوری و شەرواڵێکی خوری لەبەردابوو وە جووتێ سۆلی لە پێدا بوو لە پێستەی گوێدرێژی سەرنەبڕاو دروست کرابوو.

کە دەفەرمووێت: ﴿رُّسُلٗا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ واتە مژدەبەخشن بەوانەی بەرفەرمانی خوا دەکەن و شوێن ڕازیبوونی دەکەون بە خێر و سەدەقە کردن وە

ئەوانە دەترسێنن کە سەرپێچی لە فەرمانەکانی دەکەن و ئەوانەی نێردراوەکانی بە درۆ دەخەنەوە بە سزاو ئازار دان.

وە کە دەفەرمووێت: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةُۢ بَعۡدَ ٱلرُّسُلِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمٗا﴾ واتە خوای بەرز کتێبەکانی ناردووەتە خوارەوە و نێردراوەکانی ناردووە کە مژدە بدەن بە خەڵك و بیانترسێنن و ئەوەی روون کردووەتەوە کە پێی خۆشە و رازییە پێی و ئەوەی لا ناخۆشە و ئیبای لێ دەکات بۆ ئەوەی کەس بەهانەی نەمێنێ وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٖ مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ﴾ [طه: ١٣٤]، هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَلَوۡلَآ أَن تُصِيبَهُم مُّصِيبَةُۢ بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾ [القصص: ٤٧].

لە هەردوو سازەواردا چەسپیوە لە ئیبنو مەسعودەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا أحَدَ أغْيَرَ من الله، من أجل ذلك حرم الفواحش ما ظَهَر منها وما بطن، ولا أحدَ أحبُّ إليه المدحُ من الله، من أجل ذلك مدح نفسه، ولا أحدَ أحَبَّ إليه العُذر من الله، من أجل ذلك بعث النبيين مبشرين ومنذرين" واتە: کەس لە خوا بەغیرەت تر نییە لەبەرئەوە خراپەکاری ئاشکرا و نهێنی حەرام کردووە و کەس ئەوەندەی خوا مەدحی پێ خۆش نییە، لەبەرئەوە مەدحی خۆی کردووە و کەس ئەوەندەی خوا بەهانە هێنانەوەی لا خۆش نییە، لەبەرئەوە پێغەمبەرانی بە مژدەدەر و ترسێنەر ناردووە" لە زاراوەیەکی دیکەدا هاتووە: "من أجل ذلك أرسل رسله، وأنزل كتبه". لەبەرئەوە نێردراوەکانی ناردووە و کتێبەکانی ناردووەتە خوارەوە.

﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَۖ أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦۖ وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ١٦٦ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١٦٧ إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ١٦٨ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ خَٰلِدِينَ فِيهَآ

أَبَدًاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ﴿١٦٩﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْۚ وَإِن تَكْفُرُوا۟ فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١٧٠﴾

واتە: خودا بۆ خۆی ئاگای لێیە و فریشتەکانیش هەموویان ئاگادارن کە خودا بە زانستی خۆی ئەمەی بۆ تۆ ناردووەتە خوارەوە، ئاگاداربوونی خوا بەسە، ئەوانەی لە دین دەرچوون و ڕێگەی خودانایان دەبڕن ڕێ لێ گومبووی لەڕادەبەدەر ئەوانن. ئەوانەی لە ڕێگەی خودا لایاندا و ناهەقییان کرد خودا نە لێیان خۆش دەبێت نە ڕێگەیەکیشیان نیشان دەدات، مەگەر تەنیا ڕێی جەهەنم کە هەر تێیدا دەمێننەوەو ئەوەش لای خودا ئاسانە. ئەی خەڵکینە ئەم پێغەمبەرە بەرهەقە و لەلایەن پەروەردگارتانەوە هاتووە، دەسا باوەڕی پێ بهێنن قازانجتانە، ئەگەر لە قسەی خوداش دەرچن باش بزانن هەر شتێك لە ئاسمانان و زەمیندایە بۆ خودایە و خودا زانای لەکارزانە.

کاتێ فەرمایشتی: ﴿إِنَّآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ كَمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ نُوحٍ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعْدِهِۦۚ﴾ [النساء: ١٦٣] هەتا کۆتایی سیاقەکە چەسپاندنی پێغەمبەرایەتی موحەممەدە و ڕەدە بۆ سەر ئەوانەی ئینکاری پێغەمبەرایەتی ئەو دەکەنی تێدایە لە هاوپەشدانەرانی ئەهلی کتێب خوای بەرز دەفەرمووێ: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَۖ﴾ واتە با بێ باوەڕی بکەن ئەوانەی بێ باوەڕی پێ دەکەن لەوانەی تۆ بە درۆ دادەنێن و سەرپێچی فەرمانەکانت دەکەن، خودا شایەتی دەدات کە تۆ ئەو نێردراوەی خوا کتێبی ناردووەتە خوارەوە بۆ سەرت کە ئەویش قورئانی گەورەیە، کە ﴿لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ﴾ [فصلت: ٤٢]. لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦۖ﴾ واتە لەو زانستییەدا کە ئەیەوێ بەندەکان ئاگاداری بن لە ڕوونکردنەوەکان و ڕێنمایی کردن و لەجیاکردنەوە و ئەوانەی خوا پێی خۆشە و ڕازییە پێی وە ئەوەی ڕقی لێیەتی و ئیبای لێ دەکات، وە ئەوەی تێیدایە لە عیلمی غەیب دەربارەی ڕابردوو داهاتوو، وە ئەوەی کە تێیدایە دەربارەی باسی سیفەتە بەرزە پیرۆزەکانی کە نە نەبی مورسەل و نە فریشتەی نزیك نایزانن ئەوەی نەبێ کە

خوا پێیان بڵێت. وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِۦٓ إِلَّا بِمَا شَآءَ﴾ [البقرة: ٢٥٥]، وە فەرموویەتی: ﴿وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا﴾ [طه: ١١٠].

موحەممەدی کوڕی ئیسحاق وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: کۆمەڵێك لە جولەکە هاتن بۆ لای پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی وتن: "من ئەوانم ئێوە دەزانن کە من نێردراوی خوام"، ئەوانیش وتیان: "ئێمە ئەوە نازانین، خوای گەورە: ﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشْهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيْكَ أَنزَلَهُۥ بِعِلْمِهِۦ﴾ ناردە خوارەوە.

کە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ قَدْ ضَلُّواْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٦٧﴾﴾، واتە: لە دڵی خۆیاندا بێ باوەڕیان کرد و شوێن هەق نەکەوتن و هەوڵیان دا خەڵك بگێڕنەوە لە شوێنکەوتن و چاولێکردن، بێ سۆ لە هەق دەرچوون و گومڕابوون لێی و زۆرلێی جیابوونەوە، پاشان خوای گەورە هەواڵ دەربارەی حوکمی خۆی دەدات بەرامبەر بە خوانەناسەکان و بێ باوەڕەکان بە ئایەتەکانی و بە کتێبەکەی و نێردراوەکەی، وە ستەمکردن لە خۆیان بەوە و بە بوونە بەربەست لە ڕێگاکەیدا و کردنی تاوانەکان و بەلامباردانی حەرامکراوەکانی بەوەی لێیان نابورێ ﴿وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ طَرِيقًا﴾ واتە ڕێگای خێریان نیشان نادات ﴿إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ﴾ جگە لە ڕێگای جەهەنم ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًا﴾ بۆ هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە، پاشان خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ بِٱلْحَقِّ مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُواْ خَيْرًا لَّكُمْ﴾ واتە بێ سۆ موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) هاتووە بە ڕێنمایی و دینی هەق و ڕوونکردنەوەی تەواو لە خوای بەرز و شکۆمەندەوە، ئێوەش باوەڕبهێنن بەوەی بۆی هێناوە و شوێنی کەون، چونکە ئەو بەباوەڕنەبوونی ئێوە پێی زیانی پێ ناگا وەك خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَقَالَ مُوسَىٰٓ إِن تَكْفُرُوٓاْ أَنتُمْ وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا فَإِنَّ ٱللَّهَ لَغَنِىٌّ حَمِيدٌ﴾ [إبراهيم: ٨] وە ئالێرەدا دەفەرموێت: ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا﴾ واتە زانایە بەوانەی لە ئێوە شایستەی ڕێنماییە ڕێنمایی دەکات و بەوانەی شایستەی سەر لێ تێکدانن سەریان لێ تێك دەدات ﴿حَكِيمًا﴾ واتە لە وتەکانی و کردەوەکانی و شەرعەکەی و قەدەرەکەی.

﴿يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لَا تَغۡلُواْ فِي دِينِكُمۡ وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦۖ وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌۚ ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلٗا ﴿١٧١﴾﴾

واتە: ئەی کەسانی ئەهلی کتێب! هەڵە ڕۆیی لە دینی خۆتاندا مەکەن جگە لە ڕاست دەربارەی خودا مەڵێن، ئاشکرایە کە مەسیحی کوڕی مەریەم پێغەمبەری خودا بووە، خودا بە فەرمانی خۆی و هەر لە نەفەسی پیرۆزی خۆی هاویتیە ناو تۆڵی مەریەم دەسا ئێوە باوەڕتان بە خودا هەبێت و بە پێغەمبەرانی، ئەویش بڕوا بێنن و مەڵێن سێن واز لەم قسانە بهێنن کە بۆ ئێوە وا چاکترە دیارە هەر خوایەکتان هەیەو ئەویش لەو تۆمەتە دوورە کە هیچ فرزەندێکی هەبێ هەرچی لەناو ئاسمانان و زەمیندایە هەر بۆ ئەوە، بۆ پێك هێنانی کاروبار هەر خۆی بەسە.

خوای بەرز لە ئەهلی کیتاب دەکات زیادەڕەوی نەکەن ئەوەش لەناو گاورەکاندا زۆرە، چونکە لە سنور تێپەڕیون دەربارەی عیسا بەشێوەیەك لەو پلەیەیان زیاتر بەرز کردووەتەوە کە خوا پێی داوە و لە حەیزی پێغەمبەرایەتی دەریان پەڕاندووە هەتا کردویانەتە خوا، لەگەڵ خوای گەورەدا دەیپەرستن وەك چۆن خوا دەپەرستن، بەڵکو زیادەڕەویان کردووە دەربارەی شوێنکەوتوویانیان و ئەوانەی وتوویانە هەق بوویێت یان پوچەڵ یان گومڕایی بوبێت یان ڕێنمایی یان ڕاست بوویێت یان درۆ لەبەرئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ [التوبة: ٣١].

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: ئیبنو عەباس لە عومەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "لا تطرُوني كما أطرت النصارى عيسى ابن مريم، فإنما أنا عبد الله ورسوله". واتە: مەمفرێنن بە ئاسماندا وەك گاورەکان عیسای کوڕی مەریەمیان فڕاندووە بە ئاسماندا، بەڵکو بەندەیەکم ئێوەش بڵێن بەندەی خوا و نێردراوەکەیەتی.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕنەوە کە پیاوێك وتی: ئەی موحەممەد ئەی گەورەمان و کوڕی گەورەمان و چاکترینمان و کوڕی چاکترینمان، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرمووێ: "یا أیها الناس، علیکم بقولکم، ولا یَسْتَهْوِیَنَّکُمُ الشیطانُ، أنا محمدُ بنُ عبد الله، عبد الله ورسوله، والله ما أحب أن ترفعونی فوق منزلتي التي أنزلني اللَّهُ عزَّ وجل" (تفرد به من هذا الوجه). واتە: ئەی خەڵکینە ئاگاداری قسەکانتان بن شەیتان سەرتان لێنەشێوێنێ، من موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلام بەندە و نێردراوی خوام، سوێند بە خوا حەزناکەم لە و پلەو پایەی خوا پێی داوم زیاتر بەرزم بکەنەوە.

کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلْحَقَّ﴾ واتە ئیفترای بە دەمەوە مەکەن و هاوەڵ و منداڵی بۆ دابنێن خوا زۆر لەوانە دوورە، پاك و بێگەردە، تەنهایە لە کاروکردەوەکانیدا و لەگەورەییدا هیچ شیاوێکی پەرستن نییە جگە لە ئەو، پەروەردگارێك نییە لە ئەو، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿إِنَّمَا ٱلْمَسِيحُ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلْقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرْيَمَ وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ واتە: ئەو تەنها بەندەیەکە لە بەندەکانی خوا وەك ئەوانەی کە دروستی کردوون وایە کە پێی وتووە ببە بووە و نێردراوێکە لە نێردراوەکان و ئەو وشەیەتی، داوێتی بەسەر مەریەم دا، واتە دروستی کردووە بەو وشەیە کە جوبرائیلی پێدا ناردووە بۆ مەریەم لە گیانی خۆی کرد بە بەریا بە فەرمانی پەروەردگاری بەرزی شکۆمەندیا بوو بە عیسا بە فەرمانی خوای بەرز و شکۆمەند، ئەو فووە کە کردی بە گیرفانی کراسەکەیدا ڕۆشتە خوارەوە هەتا چوو بە فەرجیا وەك تۆوی باوك و دایکی لێ هات و هەموویان هەر دروستکراوی خوای گەورەن، لەبەرئەوە بە عیسا وتراوە کە وشەی خوا و گیانێکە لە خوا، چونکە باوکی نەبوو هەتا لێی ببێ، بەڵکو دروست بووە و وشەو پێی وتووە ببە بووە، وە ئەو گیانەی جوبرائیلی پێدا نێردرا خوای بەرز دەفەرمووێت: ﴿مَّا ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ إِلَّا رَسُولٌ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٌ ۖ كَانَا يَأْكُلَانِ ٱلطَّعَامَ﴾ [المائدة: ٧٥]. وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿إِنَّ مَثَلَ عِيسَىٰ عِندَ ٱللَّهِ كَمَثَلِ ءَادَمَ ۖ خَلَقَهُۥ مِن تُرَابٍ ثُمَّ قَالَ لَهُۥ

كُن فَيَكُونُ﴾ [آل عمران: ٥٩]. وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا فَنَفَخۡنَا فِيهَا مِن رُّوحِنَا وَجَعَلۡنَٰهَا وَٱبۡنَهَآ ءَايَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾ [الأنبياء: ٩١] وە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَرۡيَمَ ٱبۡنَتَ عِمۡرَٰنَ ٱلَّتِيٓ أَحۡصَنَتۡ فَرۡجَهَا﴾ [التحريم: ١٢]...

وە خوای بەرز دەربارەی مەسیح ڕای دەگەیەنێت و فەرموویەتی: ﴿إِنۡ هُوَ إِلَّا عَبۡدٌ أَنۡعَمۡنَا عَلَيۡهِ﴾ [الزخرف: ٥٩]...

عەبدوڕەزاق لە موعەمەرەوە لە قەتادەوە دەگێڕێتەوە کە دەربارەی ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ وَرُوحٞ مِّنۡهُۖ﴾ ئەو قسەیەکی کە فەرموویەتی ببە بووە ﴿كُن﴾، شازانی کوڕی یەحیا دەربارەی ئەو ئایەتە وتوویەتی: لەوشەکە عیسا نەبووە، بەڵکو بە وشەکە عیسا بووە. وە ئەوە چاکترین شتە لەوانەی ئیبن جەریر بانگەوازی بۆ کردووە دەربارەی فەرمایشتی ﴿أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ﴾ واتە بەو وشەیە ئاگاداری کردووەتەوە. وەك وتوویەتی دەربارەی ﴿إِذۡ قَالَتِ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَٰمَرۡيَمُ إِنَّ ٱللَّهَ يُبَشِّرُكِ بِكَلِمَةٖ مِّنۡهُ﴾ [آل عمران: ٤٥]،. واتە بە وشەیەك لە خۆیەوە ئاگادارت دەکاتەوە ئەوەش وەك ئەو فەرمایشەی لێدەکات ﴿وَمَا كُنتَ تَرۡجُوٓاْ أَن يُلۡقَىٰٓ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبُ إِلَّا رَحۡمَةٗ مِّن رَّبِّكَۖ﴾ [القصص: ٨٦] بەڵکو ڕاست ئەوەیە ئەوە ئەو وشەیەیە کە جوبرائیل هێناویتی بۆ لای مەریەم بەفوکردی بە مەریەمدا بە فەرمانی خوا بۆ بە عیسا (سڵاوی خوای لێ بێت).

بوخاری وتوویەتی: لەعوبادەی کوڕی صامیتەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: "من شهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له، وأن محمدًا عبده ورسوله، وأن عيسى عبد الله ورسوله، وكلمته ألقاها إلى مريم وروحٌ منه، والجنةَ حق، والنارَ حق، أدخله الله الجنة على ما كان من العمل". واتە: هەر کەس شایەتی بدات کە شایستەیەکی پەرستن نییە جگە لە خوای تاك و تەنهای بێ هاوبەش و موحەممەد بەندە و نێردراوی ئەو خوایەیە وە عیسا بەندەی خوا و نێردراوی خوایە و ئەو وشەیەتی داویتی بەسەر مەریەمدا و گیانێکە لە خوا و بەهەشت هەقەو دۆزەخ هەقە خوا دەیخاتە ناو بەهەشتەوە لە دونیا لەسەر هەرچی کردەوەیەك بووبێ.

بەو شێوەیە موسلیم لە ڕوویەکی ترەوە لە ئەوزاعییەوە دەگێڕێتەوە کە لە فەرموودەکەو ئایەتەکەدا هاتووە (روح منه) وەك ئایەتی: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ﴾ [الجاثیة: ١٣] واتە لە دروستکردنیەوە لای ئەوەوە لێرەدا وشەی (مِن) بۆ تەبعیچ نییە وەك گاورەکان دەیڵێن موجاهید دەربارەی (وروج منه) وتوویەتی واتە نێرراوە لەوەوە.

کە دەفەرمووێت: ﴿فَـَٔامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ واتە باوەڕیان هێنا کە خوا تاك و تەنهایە نە کوڕی هەیە نە خێزان. بزانن و باش تێ بگەن کە عیسا بەندەی خوا و نێرراوێتی لەبەر ئەوە خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَلَا تَقُولُوا۟ ثَلَٰثَةٌ﴾ واتە عیسا و دایکی مەکەنە هاوبەش بۆ خوا ئەو ئایەتەش وەك ئەو ئایەتەیە کە لە سورەتی مائیدەیە کە دەفەرمووێت: ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ [المائدة: ٧٣] وە وەك لە کۆتایی ئەو سورەتە باسکراوەدا هاتووە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ قَالَ ٱللَّهُ يَٰعِيسَى ٱبْنَ مَرْيَمَ ءَأَنتَ قُلْتَ لِلنَّاسِ ٱتَّخِذُونِى﴾ [المائدة: ١١٦] گاورەکان بەرنەفرینی خوا بکەون لە نەزانییان کە ڕێکخەرێکیان نییەو نە بێ باوەڕییەکەیان سنووری هەیە، بەڵکو قسەکانیان و گومڕاییەکەیان بڵاوە هەیانە وائەزانێ عیسا خوایە و هەیانە وائەزانێ شەریکێتی و هەیانە وا ئەزانێ کوڕی خوایە گاورەکان چەندەها کۆمەڵن ڕای جیاوازیان هەیە لەسەر ئەوە.

یەکێ لە موتەکەلیمەکان چاکی وتووە وتوویەتی: ئەگەر دە گاور کۆببنەوە ئەبن بە یانزە بەشەوە.

یەکێ لە زانا بەناوبانگەکانیان کە سەعیدی کوڕی بەتریق بوو کە ئەسکەندریەی بەجێهێشتووە لە ساڵانی چوارسەدی کۆچییدا وتوویەتی: گاورەکان کۆبوونەوە کە تێیدا پەیمانیان بەست دەربارەی ئەو ئەکانەتە گەورەیەی لە ئەستۆیاندایە، هەرچەندە خیانەتێکی پیس و بچووك بوو ئەویش لەسەردەمی قسگنگین دا دروستکەری شارە بەناوبانگەکە کەلەسەر جیاوازییەکەی زۆریان دروست کرد کە ڕێك ناخرێ و ئامار ناکرێ کە زیاتر بوون لە دوو هەزار قەشە وە چەندەها پارت بوون هەر پەنجایان لەسەر

قسەیەك بوون وە بیستیان لەسەر مەقالەیەك بوون و سەد لەسەر مەقالەیەك بوون و حەفتایان لەسەر مەقالەیەك بوو لەوە زیاتر و لەوە کەمتریش کاتێ بینی کەمەڵێکیان لە سێ سەدو هەژدە نەفەر زیاتر بوون لەسەر مەقالەیەك ڕێکەوتن مەلێك ئەو کۆمەڵەی وەرگرت و یارمەتی داو پشتگیری کردن، وە دوست ئەو سێ سەد و هەژدەیە ڕێکخست و کەنیسەی بۆ دروست کردن و کتێب و یاسای بۆ دانان، وە ئەمانەتی نوێیان داناو کە بە منداڵەکانیان دەوتەوە بۆ ئەوە ببێتە باوەڕیان و پشتی پێ ببەستن ئەوانە مولکایەکانن، پاشان ئەو گاورانە بۆ جاری دووەم کۆبوونەوە یەعقوبییەیان لێ دروست بوو، پاشان بۆ جاری سێیەم کۆبوونەوە نەستوریـیەیان لێ دروست بوو، هەموو ئەو کۆمەڵانە سێ ئیقلیمەکەی دەربارەی مەسیحیان چەسپاند، بەڵام جیاواز بوون دەربارەی چۆنییەتی ئەوە لە کتێبی لاهوت و ناسوتدا لە سەر قسەکانیان کە وتویانە ئایا یەکیان گرتووە عیساو خوا یان یەکیان ئەگرتووە یان تێکەڵ یەك بوون یان تێی دا تواوەتەوە لە سەر سێ قسە وە هەر یەکەیان ئەوەی تریان بە بێ باوەڕ دادەنێت وە ئێمەش هەر سێکیان بە بێ باوەڕ دادەنێین لەبەر ئەوە خوای بەرز دەفەرمووێ "انتهوا خیرا لکم" واتە ئەبێتە خێر بۆتان "انما الله اله واحد سبحانه ان یکون له ولد" واتە خوا پاك و بێ گەردە لەوەو زۆر بەرزە ﴿لَّهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا﴾، واتە هەموو موڵکی ئەو و ئەو دروستی کردوون، هەرچی تێدایە بەندەی ئەون لە ژێر ڕکێفی ئەودان هەر ئەو خوایە وەکیلە بەسەر هەموو شتێکەوە، ئتر چۆن لەوانە ژن و منداڵی دەبێ وەك لە ئایەتێکی تردا فەرموویەتی: ﴿بَدِيعُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَنَّىٰ يَكُونُ لَهُۥ وَلَدٌ﴾ [البقرة: ١١٧]... هەروەها فەرموویەتی: ﴿وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾﴾ إلى قوله: ﴿فَرْدًا﴾ [مریم: ٨٨ - ٩٥].

﴿لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ ۚ وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾ فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ ۖ

وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُواْ وَٱسْتَكْبَرُواْ فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ
لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧٣﴾

واتە: مەسیح هەرگیز لەوە حاشای نەکردووە کە بەندەیەکی خودایە فریشتانی نزیك بە خواش هەروەتر، هەرکەسێکی بە کۆیلایەتی خودا رازی نەبێ و بادی هەوایی بنوێنێ، هەر بینا خوا هەموو لایەك لە لای خۆی کۆ دەکاتەوە ئەوسا ئەوەی خاوەن باوەڕ و کارچاکن سەرباری پاداشتی خۆیان خودا پتر چاکەیان دەرباره دەکات ئەو کەسانەش کە لە خودا لایان داوە و پیشەیان لوت بەرزی بووە خودا تووشی جەزرەبەی بەژانیان دەکاو لە خوا پێوەی هیچ دوست و هاریکارێکیان دەس ناکەوێ.

ئیبنو ئەبی حاتەم وتوویەتی: لە ئیبنو عەباسەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی: ﴿لَّن يَسْتَنكِفَ﴾، وتوویەتی: خۆ بەزل دانانێن ﴿ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ هەندێ لەو کەسانەی بۆ ئەوە چوون کە فریشتەکان فەزڵیان هەیە بەسەر مرۆڤەکاندا ئەم ئایەتەیان کردۆتە بەڵگە کە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ ئەوە نابێتە بەڵگە بۆیان، چونکە تەنها فریشتە عەطف کراوە بۆ سەر مەسیح، چونکە ﴿الاستنكاف﴾ مەنع کردنە فریشتەش بەتواناترە بۆ ئەوە لە مەسیح لە لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ لەبەرئەوە بەتواناترن لەسەر مەنع کردن ئەوە پێویست بکات کە چاکترن، بەڵکو کە باس کراون، چونکە کراون بە خوا لەگەڵ خوادا وەك چۆن مەسیح کراوە، خوای گەورە ڕایدەگەیەنێ کە ئەوانە بەندەیەکن لە بەندەکانی و دراوستکراوێکن لە دروستکراوەکانی وەك خوای بەرز فەرموویەتی: ﴿وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ وَيَسْتَكْبِرْ فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا﴾ واتە ڕۆژی قیامەت کۆیان دەکاتەوە و لەیەکیان جیادەکاتەوە بەجوکم دادپەروەریيانەکەی کە نە ستەمی تێدایە نە لاری لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾، واتە لە پاداشتر ئەوەندەیان پێدەبەخشێ کە بە قەدەر کردەوە چاکەکانیان بێت و بە فەزڵ و چاکە و ڕەحمەتی فراوانی خۆی زیاتریان پێدەبەخشێ.

ئیبنو مەردەویە وتوویەتی: لە عەبدوڵڵاوە بە مەرفوعی هاتووە کە (درودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: ﴿فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ واتە پاداشتەکەیان ئەیانخاتە بەهەشتەوە ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ فەرموویەتی: شەفاعەت بۆ ئەوانەی ئاگریان لەسەر پێویست دەبێت لەوانەوە کە لە دونیادا چاکەیان لەگەڵ کردوون (وهذا اسناد لا ثبت). بەڵام ئەگەر لە ئیبنو مەسعودەوە بێت بە مەوقوفی ئەوە باشە.

﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟﴾ واتە بەرفەرمانی و بەندایەتییان بۆ خوا نەکردو خۆیان بە زل دانا، ﴿فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا﴾ ئەوەش وەك ئایەتی: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسْتَكْبِرُونَ عَنْ عِبَادَتِى سَيَدْخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ﴾ [غافر: ٦٠] واتە: بەسەرشۆڕی و داماوی و حەقیری بەرەو دۆزەخ دەبرێن، چونکە بەرفەرمانی خوایان نەکردووە و خۆیانم بە زل زانیوە.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾
فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ
وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾﴾

واتە: ئەی خەڵکینە لە پەروەرگاری ئێوەوە بەڵگەیەکتان بۆ هاتووە و ڕۆشناییەکی ئاشکرامان بۆ ئێوە ناردووەتە خوارەوە. جا ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێناوە و خۆیان هەر بەو سپاردووە بە زوێکی زۆر دەیخاتە بەربەزەیی خۆی و زیاتریش دەشیانخاتە سەر ڕێگەی ڕاستی بەرەو خۆی.

خوای گەورە قسە لەگەڵ هەموو خەڵکدا دەکات و هەواڵیان پێدەدات کە بەڵگەیەکی گەورەیان لە خواوە بۆ هاتووە ئەوە بەڵگەیەکی بڕاوەیە بەهانەبڕی گومانە، لەبەرئەوە فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا﴾ واتە رووناکی روون لەسەر هەق. ئیبنو جەریر و غەیری ئەویش وتوویانە ئەوە قورئانە: ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ﴾.

واتە پلە و پایەی هەردوو بەندایەتییەکەیان کۆکردووەتەوە و پشتیان بە خوا بەستووە لە هەموو کاروبارێکدا.

ئیبنو جورەیج وتوویەتی: باوەڕیان بە خوا هێناوە و دەستیان گرتووە بە قورئانەوە ﴿فَسَيُدْخِلُهُمْ فِي رَحْمَةٍ مِّنْهُ وَفَضْلٍ﴾ واتە ڕەحمیان پێ دەکات و دەیانخاتە بەهەشتەوە و پاداشتیان بۆ چەند جارە دەکاتەوە و پلەیان زیاد دەکات بە فەزڵ و چاکەی خۆی بۆ ئەوان ﴿وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَاطًا مُّسْتَقِيمًا﴾ واتە ڕێگایەکی ڕووناك ڕاست و ڕێکە بێ ئەوەی لاری تێدا بێت ئەو سیفەتی باوەڕدارانە لە دونیاو ئاخیرەتدا، ئەوان لە دونیادا لە لەسەر بەرنامەی ڕێك و ڕێگای سەلامەتن لە هەموو باوەڕەکان و کردەوەکاندا و لە ڕۆژی دواییدا لەسەر ڕێگای ڕاستی خوان کە دەیانگەیەنێت بە بەهەشتەکانی و لە جەدیسەکەی حارسی ئەعوەردا هاتووە لە عەلی کوڕی ئەبی تالیبەوە لە پێغەمبەرەوە کە فەرموویەتی: "القرآن صراطُ اللهِ المستقيمُ وحبلُ الله المتين". واتە: قورئان شارێی ڕاستی خوایە و گوریسی بتەوی خوایە.

﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ ۚ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ۚ وَهُوَ يَرِثُهَا إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ۚ وَإِن كَانُوا إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ ۗ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا ۗ وَاللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (١٧٦)﴾

واتە: لەمەڕ کەسێ کە باوك و فرزەندی نییە و دەمرێ پرسیارت لێ دەکەن، بڵێ: خودا ئەو جوابەتان دەداتەوە، ئەگەر پیاوێ هیچ ئەولادی نەبێ و بمرێ و هەرتەنیا خوشکێکی هەبێت نیوەی میراتەکەی دەبا خۆ ئەگەر خوشکەکە بمرێ هیچ فرزەندی لە پاش نەبێ براکەی میراتی دەبا ئەگەر مردوو پیاوێك بوو دوو خوشکی جێهێشت دوو بەش لە سێ بەشیان هەیە، ئەگەر چەند خوشك و برا لە پاش مردو بەجێمابوون مرد و فرزەندێکی نەبوو هەر نێرینەی دوو ئەوەندەی مێینەیەك میراتی دەگرێ خوا بۆتان ڕوون دەکاتەوە نەوەکو لێتان تێك بچێ خوا لە هەموو شت زانایە.

بوخاری لە بەرای کوڕی عازیبەوە دەگێڕێتەوە وتوویەتی: دوا سورەت کی هاتۆتە خوارەوە سورەتی (براءە) ەو دوا ئایەتیش (یستفتونك).

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە موحەممەدی کوڕی مونەکەدیرەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: گوێبیستی جابیری کوڕی عەبدوڵلا بووم، پاشان ئاوی دەست نوێژەکە ئەپرژێنێ بەسەرما یان فەرمووبووی: بیکەن بەسەریدا، منیش هۆشم هاتەوە وتم کەلالە نەبێ میراتگرم نییە، ئەو میراتە چۆن دەبێ؟ خوای گەورەش ئایەتی (الفرائج)ی نارده خوارەوە.

لە هەندێ زاراوەدا وتوویەتی: ئایەتی میران هاتە خوارەوە ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلَالَةِ﴾ لەپێشەوە باسی کەلالە و وەرگیراوەکانیمان کرد کە ئەو وشەیە لە ئیکلیلەوە وەرگیراوە کە چواردەوری یەردەدات لەبەرئەوە بەشی زۆری زانایان بەوە راڤەیان کردووە کە کەسێکە نە کوڕی هەبێت نە باو، وە لەناو خەڵك هەیە دەڵێت: (کەلالە کەسێکە کوڕی نەبێت وەك ئایەتەکە بەڵگەیە لەسەری) ﴿إِنِ امْرُؤٌا هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ﴾ حوکمی کەلالە لە سەر عومەری کوڕی خەتتاب تێکچوو وەك لە هەردوو سازەواردا چەسپاوە کە وتوویەتی: سێ شت هەیە حەزم دەکرد لە پێغەمبەر بۆی روون بکردینایەتەوە بە تەواوەتی: باپیرە و کەلالە و دەرێك لە دەرەکانی ڕیبا.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: لە میعدانی کوڕی ئەبی تەڵحەوە هاتووە وتوویەتی: عومەری کوڕی خەتتاب (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی: ئەوەندەی دەربارەی کەلالە لە پێغەمبەرم پرسی بۆ هیچی تر ئەوەندەم لێنەپرسیوە هەتا پەنجەی ژەن لە سنگم و فەرمووی: ئایەتەکەی هاوین کە لە کۆتایی سورەتی (النساء)دایە بەستە، مەبەستی لە ئایتەکەی هاوین ئەوەبووە کە لە هاویندا هاتووەتە خوارەوە.

قەتادە وتوویەتی: بۆیان باس کردووین کە ئەبو بەکری صدیق لە وتارێکیدا وتوویەتی: ئەو ئایەتەی لە سەرەتای سورەتی (النساء)ەوەیە دەربارەی بەشە دانراوەکان خوا دەربارەی کوڕ و باوك ناردوویەتیە خوارەوە، وە ئایەتی دووەم خوا ناردویەتییە خوارەوە دەربارەی ژن و مێرد و برای

دایکییە، وە ئەو ئایەتەی سورەتی (النساء) بێ کۆتایی هاتووە خوا ناردوویەتییە خوارەوە دەربارەی برا و خوشکی دایك و باوکی وە ئەو ئایەتەی سورەتی (الأنفال)ی بێ کۆتایی هاتووە دەربارەی ئولی ئەرحام ناردوویەتییە خوارەوە.

## باسی ئەو قسانەی لەسەر واتاکەی هاتووە

کە دەفەرموویت: ﴿إِنِ ٱمْرُؤٌا هَلَكَ﴾ واتە مرد خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿كُلُّ شَىْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُۥ﴾ [القصص: ٨٨] هەموو شتێك لەناو دەچێت خوای بەرز و شکۆمەند خۆی نەبێ هیچ نامێنێ وەك فەرموویەتی: ﴿كُلُّ مَنْ عَلَيْهَا فَانٍ ﴿٢٦﴾ وَيَبْقَىٰ وَجْهُ رَبِّكَ ذُو ٱلْجَلَٰلِ وَٱلْإِكْرَامِ ﴿٢٧﴾﴾ [الرحمن: ٢٦ - ٢٧].

کە دەفەرموویت: ﴿لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾، ئەوەی بۆ ئەوە چووە کە مەرج نییە کەلالە کوڕ نەبێت دەستی پێوەگرتووە، بەڵکو بەسە بۆ بوونی کەلالە نەبوونی منداڵ ئەوەش ریوایەتێکە لە عومەری کوڕی خەتابەوە، بەڵام ئەوەی قسەی جەماوەر و حوکمی ئەبو بەکری لەسەرە ئەوەیە کەسێکە کە کوڕی نەبێت و باوکی نەبێت بەڵگەش لەسەر ئەوە ﴿وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾ ئەگەر لەگەڵ خوشکەکەدا باوك بوایە خوشکەکەیا باوك هەبوایە خوشکەکە هیچی بەرنەدەکەوت، چونکە باوك بەری دەگرێ بە کی زانایان. بەڵگە لەسەر ئەوەی کەسێکە نە کوڕی هەبێت نە باوك بە دەقی قورئان، چونکە خوشك نیوەی میراتی پێ نادرێ لەگەڵ باوکدا، بەڵکو هەر میراتی بەر ناکەوێ بە تەواوەتی.

ئیمام ئەحمەد وتوویەتی: پرسیار لە زەیدی کوڕی سابیت کرا دەربارەی دەربارەی ژن و مێرد و خوشکی برا و دایکی، ئەویش نیوەی داناوە بۆ میرد و نیوەی بۆ خوشك، لەو بارەیەوە قسەی دەربارە کرا وتی: "لای پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) دانیشتبووم بەو شێوەیە حوکمی دا.

ئیبنو جەریر لە ئیبنو عەباس و ئیبنو زوبێرەوە دەگێڕنەوە کە دەربارەی مردوویەك کیج و خوشکی بەجێهێشتبێ وتوویانە: خوشك هیچی بەرناکەوێت بەپێی ﴿إِنِ ٱمْرُؤٌا هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ﴾، وتوویەتی: ئەگەر کچێکی بەجێهێشت بێ سۆ کوڕێکی بەجێهێشتووە هیچ بەر خوشکەکە

ناکەوێت، بەڵام جەماوەر پێچەوانەی ئەوانن و لەو کێشەیەدا وتوویانە بۆ کچەکە نیوەی میراتە بە دانان وە بۆ خوشکەکە نیوەکەی تر بەپشت، بەڵگەی غەیری ئەو ئایەتەیە.

ئەم ئایەتە دان دەنێت بەوەدا کە بەشی بۆ دابنرێ لەو وێنانەدا، بەڵام میراتگرتنی بە پشت بەپێی ئەوەیە بوخاری لە ڕێگای ئیبراهیمەوە لە ئەسوەدەوە کە وتوویەتی: موعازی کوڕی جەبەل لە سەردەمی پێغەمبەردا حوکمی دا کە نیو بۆ کچ و نیو بۆ خوشك، پاشان سلیمان وتوویەتی: حوکمی دا لەناو ماڵاندا، بەڵام نەیوتووە لە سەردەمی پێغەمبەردا. وە لە سازەواری بوخاریدا هاتووە لە هوزەیلی کوڕی شەرحەبیلەوە کە وتوویەتی: لە ئەبی موسای ئەشعەرییان پرسی دەربارەی کچ و کچی کوڕ، وە خوشك ئەویش وتی: بۆ کچەکە نیو وە بۆ خوشکەکە نیو، پاشان لە ئیبنو مەسعودیان پرسی دەربارەی قسەکەی ئەبو موسا، وتی: کەواتە من گومڕابووم و لە ڕێنیشاندراوەکان نیم، دەربارەی حوکم دەدەم بەوەی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) حوکمی پێ دابوو، نیوە بۆ کچ، بۆ کچی کوڕ شەش یەك بۆ تەواو کردنی دوو سێ یەك، ئەوەش مایەوە بۆ خوشکە، ئەڵێ هاتینەوە بۆ لای ئەبی موساو پێمان ڕاگەیاند کە ئیبنو مەسعود چی وتووە، وتی: ئیتر پرسیار لە من مەکەن هەتا ئەو زانایە لەناوتاندا بێت.

کە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ﴾ واتە برا هەموو ماڵەکە دەبات کاتی کەلالەکە مرد کە نەکوڕی هەبێت نە باوك، چونکە ئەگەر باوکی هەبوایە براکە هیچی بەرنەدەکەوت، ئەگەر وادابنێین کەسێکی لەگەڵدا بێت بەشی هەبێ ئەیدرێتێ وەك مێرد و یان برای دایکی وە ئەوەی دەمێنێتەوە دەدرێ بە برا وەك چەسپاوە لە هەردوو سازەواردا لە ئیبنو عەباسەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: (أَلْحِقُوا الفرائض بأهلها فما أبقت الفرائض فلأولى رجل ذكر). واتە: بەشە دانراوەکان بگەیەنن بە خاوەنەکانیان ئەوەشی مایەوە بیدەن بە لە پێشترین پیاو.

کە دەفەرموویت: ﴿فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ﴾ واتە ئەو کەسەی کە بە کەلالەیی دوو خوشکی هەبێ دوو سێ یەکیان بەردەکەوێ بەوشێوەیە ئەوەی بمێنێتەوە لە دوو خوشکی بە حوکمەکەیان، ئالێرەدا کۆمەڵێك حوکمی دوو کچیان بەکارهێناوە بۆ حوکمی خوشکەکان لە کچەوە لە ئایەتی: ﴿فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ﴾ [النساء: ١١].

کە دەفەرموویت: ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ﴾ ئەو حوکمی پشتەکانە لە کوڕکان، کوڕی کوڕەکان و براکان کاتی نێر و مێیان کۆبینەوە هەر نێرێکیان دوو بەشی مێیەکی دەدرێتێ.

کە دەفەرمووێت: ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ﴾ واتە بۆتان پێویست دەکات بەشە دانراوەکانی و سنوورەکەیان دیاری دەکات و شەریعەتەکانی روون دەکاتەوە بۆیان.

کە دەفەرمووێت: ﴿أَن تَضِلُّواْۗ﴾ بۆ ئەوەی ڕێگاتی هەقتان لێ ون نەبێ دوای ڕوونکردنەوەی.

﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾ واتە خوا زانایە بە عاقیبەتی هەموو کارەکان بەرژەوەندییەکان و ئەو خێر و چاکەی کە تیایاندایە بۆ بەندەکانی، هەر کەس شایستەی چەندە لە خزمەکان بەپێی نزیکییان لە مردووەکەوە.

فەرمووده‌ڕەوان ئەبو بەکری کوڕی مەردەویە وتوویەتی: لە ئەبی عوبێدەی کوڕی حوزەیفەوە هاتووە لە باوکییەوە کە وتوویەتی: ئایەتی کەلالە نێردرا بۆ سەر پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) کە لەسەر ڕێگدا بوو، پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) ڕاوەستا سەیری کرد سەی وشترەکەی حوزەیفە لای سەری وشترەکەی پێغەمبەرەوە بوو، بۆ ئەوی خوێندەوە، حوزەیفە سەیری کرد چاوت کەوت بە عومەر ئەویش بۆ عومەری خوێندەوە، کاتێ بوو بە جێنشینی عومەر حوزەیفەی بانگ کرد دەربارەی ئەو ئایەتە پرسیاری لێ کرد، حوزەیفە وتی: پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) گەیاندی بە من و منیش چۆن پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) پێی گەیاندم بەو شێوەیە منیش گەیاندم بە تۆ، سوێند بە

خوا من ڕاستگۆم، هیچی لێ زیاد ناکەم، وە عومەر دەیوت: خوایە ئەگەر بۆ ئەوت ڕوونکردبێتەوە بۆ من ڕوون نییە. عوسمانی کوڕی ئەبی شەیبە وتوویەتی: سەعیدی کوڕی موسەیب وتوویەتی: عومەری (ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەری پرسی میراتی کەلالە چۆن دەبێت؟ دەڵێ: خوا ﴿يَسْتَفْتُونَكَ﴾ەی ناردە خوارەوە، ئەڵێ: عومەر تێنەگەیی، لبە حەفصەی وت: ئەگەر پێغەمبەرت بینی دڵخۆش بوو پرسیاری لێ بکە، کاتێ بینی دڵخۆش بوو دەربارەی پرسیاری لێ کرد، فەرمووی: "باوکت ئەوەی بۆ باس کردووی، ڕام وایە باوکت فێر نابێت، ئەی ئایەتەکەی هاوین بەس نییە کە دەفەرمووێت: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ﴾ [النساء: ١٢] کاتێ پرسیاریان کرد لە پێغەمبەر هاتە خوارەوە کە کۆتایی سورەتایی (النساء)ە.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە تاریقی کوڕی شیهابەوە دەگێڕنەوە وتوویەتی: عومەری کوڕی خەتاب ئیسکی شانێك کە ئەو ئایەتەی لەسەر نووسرابوو هێنای و هاوەڵەکانی پێغەمبەری کۆکردەوە، پاشان وتی: دەربارەی کەلالە حوکمێك دەدەین حوکمێك ژنان لە ماڵەکانیاندا باسی بکەن. لەو کاتە مارێك لە ماڵەکە هاتە دەرەوە هەموو بڵاوەیان لێ کرد، ئەویش وتی: ئەگەر خوا بیویستایە ئەم فەرمانە تەواو بێت ئەوە تەواوی دەکرد (ئەوە ئیسنادێکی ڕاستە).

حاکم ئەبو عەبدوڵڵای نەیسابوری بۆمان دەگێڕێتەوە وتوویەتی: گوێم لێبوو موحەممەدی کوڕی تەڵحەی کوڕی ڕەکانە دەیگێڕایەوە کە عومەری کوڕی خەتاب وتوویەتی: ئەگەر دەربارەی سێ شت پرسیارم لە پێغەمبەر بکردایە لەگەڵەوشترەکەم خۆشەویست تر بوو کە کێ ببێتە خەلیفە دوای ئەو؟ وە دەربارەی قەومێك بڵێن ئێمە دان دەنێین بە زەکاتدا لەسەر ماڵەکانمان، بەڵام نایدەین بە تۆ ئایا جەنگ کردن دژیان ڕەوایە؟ وە دەربارەی کەلالە؟

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە سەعیدی کوڕی موسەیبەوە دەگێڕنەوە کە عومەر نوسراوێکی نووسی دەربارەی باپیرەو کەلالە ماوەیەکی زۆر داوای خێری دەکرد لە خوا و دەیوت: خوایە ئەگەر دەزانی خێری تێدایە بەردەوامی کە هەتا ئەو ڕۆژەی خەنجەرەکەیان لێ دا داوای نووسراوەکەی کرد و

کوژاندیـەوە بێ ئەوەی کـەس بـزانـێ چـی تـێدا نـووسیـبوو، وتـی: مـن نووسراوێکم نووسی دەربارەی باپیرە و کەلالە من زۆر ئیستیخارەم کرد ئیتر ڕام بوو تێوە لەسەر چی بوون لەسەر ئەوە بەجێتان بهێڵم.

ئیبنو جەریر وتوویەتی: لە عومەرەوە دەگێڕنەوە کە وتوویەتی: من شەرم ئەمگرێ پێچەوانەی ئەبو بەکر بجولێمەوە، ئەبو بەکر دەیوت: کەلالە کەسێکە کوڕ و باوکی نەبێت. ئا ئەوەی صدیق (ڕەزای خوای لێ بێت) وتوویەتی جەماوەری سەحابە و تابیعین و پێشەواکانی لەسەرە لەسەردەمی کۆن و نوێدا هەر ئەوە مەزهەبی چوار پێشەواکە و حەوت فەقیهەکانەو قسەی زانایانی وڵاتانە، هەر ئەوەش قورئان بەڵگەیە لەسەری وەك خوای روونی کردووەتەوە لە فەرمایشی ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ﴾، ئیتر خوا دەزانێ.

# پێرست